کورد

# دوژمنی خۆت بناسه



## بیرەوەری لێزانێکی موخابەرات

رەفیق پشدەری

بەرگی یەکەم



# کورد، دوژمنی خۆت بناسە

ڕەفیق پشدەری

چاپی یەکەم

١٩٩٩

# بسم الله الرحمن الرحيم

ئەم کتێبەم پێشکەش دەکەم بەگیانی پاکی ئەو شەهیدانەی کەگیانی خۆیان لەپێناوی کوردو کوردستان دا بەخت کرد.

هەروەها بە ئەو برا عەرەبانە، کە گیانی فیداکارییان تێدایە بەرامبەر گەل ونیشتمانەکەیان و باوەڕیان هەیە کەئەبێت کێشەی کورد جێبەجێ بکرێت.

هەروەها پێشکەش بەو سیاسەتمەدارانەو ڕۆشنبیرانەی کورد کەبەرگریان کردووە لەمافە ڕەواکانی کورد.

کتێبەکەم بەناونیشانی کورد دوژمنی خۆت بناسە.

هیچ گروپێکی سیاسی و مرۆڤێك هانی نەداووم کەئەم کتێبە دەرکەم ڕای شخصی خۆم و کوڕەکانم بازیان و ڕەوەز ڕووباری کچم هانیان دەرکردنیان دام کەدەست کەم بەنووسینی، بەڵام براکان و خزمەکانم بەپێچەوانەوە حەزیان نەدەکرد، لەبەر باری ئەمنی خۆی بۆیەش بەکوردیم نووسی تاکو یەکەم جار بکەوێتە بەرچاوی کورد هەرچەندە کوردییەکەم دووکەڵ دەکات کاتێك لەناو زەنگ بووم برای دڵسۆزو کورد پەروەر دکتۆر خدر معصوم نامەیەکی بۆناردبووم، دلوای شەش ( کڕی) کردبوو، ڕەنگاوڕەنگ، من ناردم لەقەڵادزێ وە شەش کەری بۆ هات، ئێمە، یان ئەڵێن (ڕانکو چۆغە) یان ئەڵێن (بوزوو)، ئەمە بوو بەنوکتە، لەخۆشناوەتی پێی ئەڵێن (کڕ).

من خۆم نووسەر نیم لەگەڵ ئەوەشدا خۆم کتێبەکەم داڕشت، بۆ ئەوەی کەس تاوانبارم نەکات کەهانیان داوم و تیشك بخاتە سەرم، ڕای چەند برایەکی دڵسۆزو نیشتمان پەروەرم وەرگرت پێم ڕا گەیاندن لەبەر بارودۆخی ئیمڕۆی کوردستانی باشوور کتێبێکم بەدەستەوەیە لە ١٧ ی تموزی ١٩٦٨ دەست پێ‌دەکەم، چونکە (صدام تکريتي) لەڕووخانە، هەتاوەکو زیندووە، لەژیاندا ماوە پێش سەرەمەرگی (انشاء الله) بڵاوی ئەکەمەوە بەکوردی و عەرەبی و ئنگلیزی.

هەموویان پەسەندیان کرد و بۆچوونی خۆیان ڕوون کردەوە کە سوودبەخش دەبێت بۆ گەلی عێراق و بەتایبەتی بۆ گەلی کورد، بەڵام چوار برای دڵسۆز وتیان یاری بەئاگر دەکەی ئەمە خەتەر ناکە بۆ خۆت و کوڕەکانت، وتم من لەئێران و تورکیاو سوریا گیراوم، ئایا ئێستا لەپەنای ئەو

دوو زل هێزە لەچی بترسم؟ تەنها مەترسی منالەکانمە، ئەگینا خەمی خۆم نییە.

خوشك وبرایانی خۆشەویست:

پێشەکی کتێبەکە ئەبوو وا دەست پێ بکەم بەنووسینی لەیەکەم خاڵەوە، بەلام وا تەنها سەری خاڵەکان بەکورتی و بەزمانی عەرەبی لەیەکەم خاڵەوە تاکو بیستوویەك (١-٢١) (انشاء الله) لەرۆژگارێکی تر دەکەوێتە بەرچاوتان، کاتێك هەردوو زل هێزە گەورەکە یەکیان گرت، ئینجا کتێبەکەی یەکەم بلاودەکەمەوە، چونکە لەبارودۆخی ئێستاکە سوود بەخش نابێت، ناکۆکیەکە فراوانتر ئەکات، دوژمن سوودی لێ وەردەگرێت.

هەلوێستی منیش لەسەرەتای ١٩٦٢وە تاکو ئەم ئەمرۆ ئاشکراو ڕوونە بەتایبەتی لای هەر دوو ئەم سەرکردە مەزنە کەتیکۆشان و هەولدانم ئەوە بێت لەپێناوی یەك بوونیان.

تێبینی:

بەداخەوە هیچ بەلگەنامەیەکم (مستمسکات) نەماوە، تەنها خۆم ماوم بۆیە ئەلێم چیم دیت و چیم بەسەرهات:

١- ئەو وێنەو نامە گرنگانەی هەم بوو لەساڵی ١٩٥٨ کاتێك گرتیانم و لەساڵی ١٩٦٢یش کە مالیان پشکنیم هیچی نەماوە.

٢- کاتێك کەکودەتاکەی (ناظم کزار) کەشف بوو ڕام کرد بۆ دەرەوەی ولات و ئاگاداری دایکمم کردەوە هەرچی بەلگەنامەیەك و وێنەیەك و کاسێتێکم هەبوو لەگەڵ نامەی تایبەتی و شتی زۆر گرنگ، کە بۆ ئەمرۆ زۆرگرنگ و بەکەلك بوو بەداخەوە هەمووی لەتوونی حەمام سووتاند بوو.

٣- لە١٩٧٦/٩/١٤ گیرام هەموو ئەو شتە گرنگانەی کەهەم بوو لەگەڵ دەمانچەیەکی (کاتم الصوت) لەناویان برد بوو، پێش ئەوەی مالم بپشکنن.

٤- لەماوەی ٤٥ ڕۆژ ئەم کتێبەم نووسی بەڕاستی کاك (شوان نوری سعید) لەگەلم دا بوو ئەوپەڕی یارمەتی دام و هاوسەرەکەی شەوو ڕۆژ خزمەتی دەکردم تاکو کۆتاییم پێ هێنا.

**خزمەتکاری گەلی کورد**

**ڕەفیق پشدەری**

# ماجرى لى وماشاهدت - چيم دييت و چيم بەسەر هات

١- اسرتي وعشيرتي ونشأة حتى بداية حياتي [illegible]
تجربتي في بغداد
ومنذ سنة ١٩٥٦ تعرفت على معظم الشخصيات الكردية الوطنية وبعض الشخصيات العربية وعائلة مشيخة البارزانيين.

٢- ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ وتاثيره على الشعب الكردى حينئذ وبعض الاجتماعات لقادة البارتيين في مسكني.

٣- عودة البارزاني الى ارض الوطن وعملي تحت امرته منذ لحظة وصوله الى بغداد.

٤- في البداية حصل على علاقة وصداقة وثقة متينة بين البارزاني وقاسم.

٥- توتر العلاقة بين البارزاني وقاسم ومن ثم استعمل قاسم لغة الحديد والنار لقمع الحركة الكردية.

٦- من سجنى وما لقيت من ضرب واهانة ثم اخلاء سبيلي بعفو عام اصدره قاسم عن الموقوفين والمحتجزين الاكراد، عندما كان في زيارة الى مشروع دربنديخان.

٧- التحاقي بصفوف البيشمركه ولايزال الى اليوم اهل المنطقة يذكروني باسم دكتور رفيق.

٨- وقوعي في كمين متنقلا بين السجون وتقديمي الى المحكمة الفورية في موصل، عندما حصل المفاوضات بين عبدالسلام عارف والبارزاني وبواسطته اطلق سراحي.

٩- نشوب القتال بين البارتي والمكتب السياسى وسيطرت البارزاني على امبراطورية ماوت.

١٠- استجد القتال بين البارزاني وحكومة عبدالسلام عارف.

١١- عودتى للأنضمام الى صفوف البيشمركه كامر البتاليون التاسع ل(هيز قرداغ) وما انجزت من بطولات في المنطقة يذكرها الاعداء والاصدقاء.

١٢- تركي لصفوف البارزاني ولجوئي الى جانب الحكومة والاسباب التي دعتني لذلك هو شخص عبدالوهاب اتروشي.

١٣- برزت الانشقاق في صفوف البارتي واصبح الثورة كتلتين الاول باسم البارزاني والثانية باسم جناح المكتب السياسي (جماعة جةلال طالباني ).

١٤- عن الاتفاق الذى ابرم بين الطالباني وحكومة عبدالرحمن عارف.

١٥- مكثت في سجن ابا غريب مع المناضلين الشجعان من العصبة واليزيديين والبارتيين وغيرهم، كنت القدوة في وقفتي امام السلطة.

١٦- يوم تتويج صدام كرئيس للدولة بهذه المناسبة صدر عفو عام ولكن لم يشملني القرار بسبب تهمة امن الخارجي جاسوس لايران واسرائيل و من ثم ابنتي اتصل بشخص صدام واستفسر عني وامر باطلاق سراحي مع شقيقي، واثناء مكالمته لخفر السجن سيد رفيق لن يشتغل في خط الجاسوسية.

١٧- تعريف الاجهزة الامنية بشكل مفصل (الامن – الاستخبارات – المخابرات).

١٨- نبذة عن الاكراد المتواجدين في بغداد وعن بعض الشخصيات المرموقة وموقفهم من القضية الكردية واسماء عدد منهم ؟

١٩- المساعي التي بذلتها في سبيل عدم حصول الانشقاق في صفوف الثورة الكردية في سنة ١٩٦٢، اجتمعت مع شيخ احمد البارزاني بحضور شيخ محمد خالد في فندق سميراميس ومن ثم للمرة الثانية قبل هجوم بارزاني على امبراطورية ماوت لهذا الغرض سافرت الى البارزان لجتمعت مع شيخ احمد البارزاني في سنة ١٩٦٤ ولولا السيد (عيسى )لكان الان نحن على ابواب تشكيل حكومة كردية واخيرا في السنة ١٩٨٤ بين الاتحاد والبارتي المساعي بذلتها للأنهاء الخلاف، وبشهادة كل من السادة دكتور فؤاد معصوم وعلي عبدالله وانا من انهى الخلاف الا انني لم اكون املك القوة مثل السيد علي الخامئني.

٢٠- حصل الخلاف بيني وبين الاتحاد ادت باعتقالي وقتل مرافقي ومن ثم عودتي الى صفوف الاتحاد الوطني الكردستاني وعملت بكل جد واخلاص.

٢١- سفري الى لندن في السنة ١٩٨١ مقابلتي مع اذاعة بي بي سي قسم بانوراما وحقوق الانسان واجتمعت مع مسؤولين ولخيرا ماذا قالوا عن صدام حسين وعن شعب الكردي، ورای المؤرخ الكبير العلامة توفيق وهبي بيك عن الاحداث، وعن حاتم طي الكردي (علي كمال)، ومعلوماتي وملاحظاتي اذكرها

ان شاء الله في كتاب الثاني وعن متورطين سرا مع اجهزة الامن العراقية، ان شاء الله.

# چیم دیت چیم بەسەرهات

بەرواری ١٧ی تەمموزی ١٩٦٨ کاتژمێر ٤ ی بەیانی تەقەیەکی زۆر دەستی پێکرد لەناو بەغدا، لەئەنجام دا خەبەرمان بۆوە. دروانسێکەم وتی: ئەمە چیە؟ لەوەڵامدا وتم: ئەمە تەقەیە، هی خۆشی کودەتا[انقلاب] ە.

١٧ی تەمموز، ئەو کودەتا سەربازییە بوو کەبەعسی یەکان کردیان لەشاری بەغدا. منیش ئەو کاتە هەموو شوێن و دەزگا گرنگەکانی ناو بەغدام پشکنی، دوای کاتژمێر (١)ی پاش نیوەڕۆ پەیوەندییەکی تەلەفۆنیم کرد لەگەڵ مامۆستا ابراهیم احمد بەمەبەستی ئاگادار کردنەوە لەو گۆڕانکارییانە ئاگادارم کردەوە کەدەزگاکانی حکومەت هەمووی وەکو خۆیەتی، تەنها دوو کەس دوورخراونەتەوە ئەوانیش (عبدالرحمن عارف) و (عبدالجلیل احمد)ە کەبەڕێوەبەری ئاسایشی گشتیبووە، هەروەها بەشداربوانیش لەم کودەتایە ژمارەیان ٤٠٠ کەس بوون، شان بەشانی ئەو کودەتایە وەستاون نیوەیان چەکدارن سەر بەحزبی بەعسن، ئەمەش هەموو هێزو توانای سیاسیان بوو.

سەردانی چەندماڵێکی ناسراوم کرد لەبرا عەرەبەکان. لەوانە (عبدالستار علی حسین) کە سیاسەتمەدارێکی گەورەی عەرەب و وەزیری نەوت بوو، بەهۆی ئەوەوە بوو کە نەوتی عەرەب ڕاوەستاو نەدەنێردرا بۆ ئەوروپا، لەکاتێکدا کەعبدالسلام عارف لە ١٤ی تەمموز دادگایی کرا (عبدالستار علی حسین) پارێزەری بوو. لەگەڵ (ام علی) گفتوگۆم کرد کەئامادەم هەر کارێك بەمن بکرێت بۆتان بکەم. (زیرەك –ئازا– پاك –بیرو باوەڕی نەتەوایەتی بوو، کاتی خۆی لەپارتی استقلال کاری کردبووە. ئەنجا سەردانی ماڵی (رجب عبدالمجید)م کرد، کە سیاسەتمەدارێکی عەرەبی ناسراو و ئەفسەری پلەی عقیدو ئەندازیار بوو،پلەی سکرتێری ئەفسەرە سەربەستەکان (ضباط الاحرار) بوو لەشۆڕشی ١٤ی تەمموز دا بەشدار بوو، کۆمەڵێك کاری گەورەی پێ سپێرابوو لەدەرەوەو لەناوەوەی وڵات، وەکو وەزیری ناوخۆ، یان جێگیری سەرۆکی (زیرەك و ئازا و ڕاستگۆو نیشتمان پەروەر و بێلایەنیش) بوو.

ماوەی یەك کاتژمێر لەگەڵیان دا دانیشتم زۆر بێتاقەت و مات ویێ زەوق بوون، پێم گوت (ابو محمد) شتێك هەیە لەمنی ئەشاریتەوە، ئێستا گوشار ناخەمە سەرت پێم بڵێیت.

بەرواری ١٨ی تەمموز ڕۆیشتمە کۆشکی کۆماری (قصـر الجمـهوری)بـۆ ئەوەی چاوم بەسەرۆکی کۆماری تازە بکەوێت، کەئەویش (احمد حسن البکر) بوو، وەڵامیان دامەوە کەگوایە کاتی نییە کەس ببینـێ. پێم وت نوسراوێکم پێیە هاتووم ئاراستەی بکەم، وتی کوانێ نامەکە هەتا بۆی بەرم، وتم ـ ـەکەی من گفتوگۆی سەرزارە، واتە (رسالە شفهیە). ئینجا پێێشم گوت ئێوە هاتوون (تستعملون لغە الحدیـد والنـار) لو( تستعملون العقل والحكمـة والادراك لحل قضية الكردية ).

واتـە ئێـوە هـاتوون (ووتـەی ئاسـن وئاگرمـان لەگـەڵدا بـەکاربێنن) یـاخود {مێشك وژیری و دڵنایی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد }. ئەویش لەوەڵامدا وتی: تۆ کێیت؟ منیـش وتم (ڕەفیـق پشـدەری)م، ئـەویش خـۆی پـێناسـاندم وتـی: منیش (طـه یاسـین رمضـان) م کەبـەرگێکی سـەربازی لەبەردا بـوو، بەپلەی نقیب، بەتەلەفۆن ئاگاداری کردن کـەفلان کـەس هـاتووە بتـان بینـێ نامەیەکی سەر زوبانی پێیە. ڕێگایان دام بچمە ژوورەوە کە چوومـە ژووری، کۆمەڵێك خەڵکم دی، لەوانەی بەئیشەکە هەڵستابوون، واتە کودەتاکە دیقـەتم دان زۆر مـاندوو بـوون، ڕەنگـی بـێ خـەوی و هیلاکـیـان پێـوە دیـار بـوو، کراسیان چڵکن و قۆندەرەکانیان پیس بوون.

لەوانەی کە ناسیمن (مرتضـی الحدیثی و عبدالکریم الندی و محمـود الندی)،ئنجا بەتەنها چاوم بە شفیق الدراجی کەوت.

(طه یاسین رمضان ): کوردە، شەشی تەواو کردووە، نائب ضابط بـوو، پیاوێکی شەڕانی خوێن مژ، بیروباوەڕی وەکو عەرەبێکی نەتـەوەیی شـۆفێنی و، دوژمنی گەورەی کوردە.

(مرتضـی الحدیثی): ڕەگـەزی کـوردە، مامۆسـتا بـوو، زیـرەك، پـاك، نیشتمان پەروەر، خوێندەوار، سیاسـەتمەدارێکی ناسـراو، زۆر پلـەی گرنگـی وەرگرت، صەدام تکریتی ئـازارو ئەشکەنجەیەکی زۆری دابـوو، ئـەیان هێنـاو لـەناو خـەڵق دا وەکـو کـەر بزەڕێـت، لـەدوایی دا کوشـتی، چونکـە لـەناو بەعسیەکان دا ڕێزیان لێ دەگرت، جار جار بەرهەڵستی (صەدام) ی ئەکرد.

(عبدالکریم الندی): خزمێکی نزیکی (احمد حسن البکر) بوو، ئەی وت ئێمە ڕەگەزێکمان کوردە، زۆر نزیك بوو لەبکر، (صدام) کومەڵێك کاسبی پێکرد، تاکو لەبەرچاوی (بکر)ی بخات.

(محمود الندى): خزمێكی نزیكی (احمد حسن البكر) بوو، نزیكترین كەس بوو لێی، كاسب بوو، صدام ئیشوكاری تایبەتی پێ ئەسپارد، ناردی بۆ لای عبدالرزاق نایف دڵنیای بكات لەهەمان كات دا پیاو كوژەكانی نارد لەلەندەن تیرۆریان كرد، بۆوچوونی باش بوو بەرامبەر كورد.

(شفیق الدراجی): رەگەزی كوردە، ئەفسەر بوو، ئازا، زیرەك، خوێندەوار، بیروباوەری لەسەرەتاوە بەعسی بوو،عەرەبێكی شۆڤێنی نەبوو، زۆر جێی باوەڕ بوو لەلای (بكر)، (صدام) حسابی بۆ ئەكرد،پاك بوو، حەزی بەخراپە نەدەكرد،كەیفی بەمرۆڤی كورد ئەهات، مدیری (استخبارات العسكریه)بوو لەحكومەتی (عبدالسلام) و(عبدالرحمن عارف) دا،(سكرتێری مجلس ی قیادة ثورة) بوو لەهەمان كات سكرتێری (بكر)یش بوو.

ئنجا بەتەنها چاوم بەشەفیق الدراجی كەوت، وتم ئەگەر چاوم بە(بكر) كەوتبایە سكالام لێ ئەكرد كەئاگایان لەتۆ، بێت ئێستاكە بەرێزتان هاتوویت گفتوگۆم لەگەڵ دەكەیت بەناوی حكومەتی (بكر)ەوە.

بەدوورو درێژی باسی وتەكانی منی كرد كە بەگشتی خۆش حاڵ بوون بەو قسانە، ئێستاكە ئێمەی (مجلس قیادەی ثورە) كۆبوونەوەمان هەیە دەربارەی هەموو ئالۆزیو كێشەكانی عێراق، بەتایبەتی چۆنیەتی جێبەجێكردنی كێشەی كورد،لەهەڵسانم دا وتم سڵاوم بگەیەنە، ووتی بەشی زۆریان بەشخصی ئەتناسن، سڵاومان بگەیەنە بەمامۆستا ابراهیم احمد و مام جەلال و گشت برادەران.

سەردانی بەشی زۆری كاربەدەستانی (میری) م كرد، و لەگەڵ كەریم قەرەنی لەبەرواری ٢٥یتەمموزی ساڵی ١٩٦٨ دا سەردانی (ابراهیم داود)م كرد كەوەزیری بەرگری بوو، وتم خەڵك بەگشتی دەیزانی كە كودەتا (انقلاب) دەبێ. سەرسوڕمان لەوەدایە لێپرسراوی پاراستنی كۆماری (امر لواء حرس الجمهوری) لەگەڵ جێگیری بەڕێوەبەری دەزگای هەواڵگری (معاون مدیر استخبارت) بەم كارە هەڵستان كەریم قەرەنی، ئەفسەر بوو، لەناوچەی سلێمانی ناسراو بوو، ئازا و زیرەك و نیشتمان پەروەر بوو،حەزی ئەكرد بەپێی توانا خزمەتی كورد بكات، بەلام كەخەتەری بۆ ئەهات خۆی دوور ئەخستەوە، حەزی بەبرادەری عەرەب زۆر زۆر ئەكرد.

(ابراهیم داود):

ئەفسەری پلەی لێپرسراوی پاراستنی کۆماری وجێ باوەڕی (عبدالرحمن عارف) بوو، ئازا، زیرەك، نیشتمان پەروەر بوو،بیروباوەڕی عەرەبێکی نەتەوەیی بوو، [illegible] نەبوو، لە ١٧ی تەمموزی ٦٨ [illegible] بووبەم جارە [illegible] (عبدالرزاق نایف) هاتە سەر حوکم کۆبینەوە، سێ تۆڵی دلنیشتین ناوی ئەو کەسە نابەم لەبەر ئەوەی لەژیاندا ماوە لەبەغدا ئەژی.

وتم: جاران وەزعەت زۆر بەهێزتر بوو لەئێستا، هەر چەندە بەناو زۆر گەورەی، بەلام خەتەرناکێکی گەورەت لەدەوری خۆت کۆکردۆتەوە، ووشەکانی ئێوە زۆر جیاوازە لەگەڵ کادرەکانی بەعسی، ووردە ووردە جێی خۆیان خۆشتر ئەکەن.

لە٢٨ی تەمموزی ١٩٦٨دا سەردانی (رجب عبدالمجید) م کرد، بەدوورو درێژی چیم بە (عبدالرزاق نایف) و (ابراهیم داود) وتبوو هەمووم بۆی باس کرد.

ئینجا (ابو محمدیش) هەموو نهێنیەکانی بۆ گێڕامەوە.

وتی: ئێمە دەمێکە خەریکی ئەم کودەتایەین وا ڕێك کەوتووین کەمن بکرێم بەسەرۆکی کۆمار و (احمد حسن البکر) بکرێتە سەرۆکی وەزیران ئەفسەرەکان هاتنە لام، (عبدالرزق نایف ) لەوانە بوو کەوتی (احمد حسن بکر) بەتەمەنە با ئەو ببێتە سەرۆکی کۆمار و تۆش ببە بە سەرۆکی وەزیران من ڕازی بووم بەوە، لەسەردانەکەی (عبدالرحمن عارف) بۆ فەرەنسا وا بڕیارمان لەسالی ١٩٦٨ بوو پرسیان پێکردم کەکودەتاکە (انقلاب) ە کە بکەین.

وتم: نەخێر لەبەرئەوەی بۆ سەرشانی گەلی عەرەب جوان نییە و خراپە کاتێك (عبدالرحمن عارف) لەگەڵ سەرۆکی کۆماری فەرەنسادا کۆبیبێتەوە، ئێمەش لێرە کودەتا (انقلاب)بکەین.

ابو درید (عبدالرزق نایف) بەم نزیکانە سەردانی کردم وتی: هەموو دەسەلات وهێزێك بە دەست ئێمەیە بۆ کودەتاکە بەجووتە نەکەین؟ تۆ، واتە ابو محمد (رجب عبدالمجید) ببێتە سەرۆکی کۆمار و منیش ببمە سەرۆکی وەزیران، وتم: بەسە باهیچی تر عەسکەر نەیەتە سەر حوکم، ئیتر ئەم کودەتایەی ١٧ی تەمموز بەم شێوەیە ئێستاکە کرا، بەڕاستی ابو بازیان باشت بە(عبدالرزاق نایف) ووتووە.

لەدوای بەرواری ٢٨ی تەمموزەوە مامۆستا ابراهیم احمد و مام جەلال و حمە امین فرج و عمر دەبابە ئەچنە سەردانی (حماد شهاب) کەئەفسەرێکی ناسراو بوو، یەکێکە لەچوار لێپرسراوەکانی بەعسی،بۆ پیرۆز بایی کردنی بەبۆنەی ١٧ی تەمموزەوە، لەمیوانداری یەکەدا یەکێك قاوە دەگێڕێ، حماد شهاب ڕوو دەکاتە ابراهیم احمد دەڵێت ئێوە لاوێکی شۆڕگێڕتان هەیە بەناوی (جەلال تاڵەبانی) و، ئێمەش لاوێکی شۆڕشگێڕمان هەیە کە پێی دەڵێن (صدام التکریتی) کەقاوەی دەگێڕا بۆ ئێوە.

ڕۆژی ٣٠ی تەممورزی ١٩٦٨ ئێوارەکەی چوومە ماڵی (رجب عبدالمجید) لەسەر داواکردنی خۆی، کەنزیك بوومەوە لەماڵیان، تەماشام کرد بەردەرگای ماڵیان ئەشۆرد وخاوێنیان ئەکردەوە پێم وت لەوە دەچێ چاوەڕوانی میوان بکەی؟ وەلامی دامەوە وتی: ئێمڕۆ سەرلەبەیانی ابو درید (عبدالرزاق نایف ) تەلەفۆنی لەگەڵ کردم، داوای لێبووردنی لێکردم، چاوەڕوانم کەئێستا بگاتە لامان، حەزم کرد لێرە بیت.

منیش بەپێکەنینەوە پێم گوت (عبدالرزاق نایف) گیراوە، لەصالحیە ژمارەی ٢٠٠ کەس ڕاوەستاوون بەرامبەر ئیستگە چاوەڕوانن کەبەم بۆنەیەوە بەناوی (مجلس القیادة الثورة) ڕوون کردنەوەیەك بلاویکەنەوە. پێم گوت: ئەمڕۆ بەناوی (احمد حسن بکر) تەلەفۆنیان لەگەڵ (عبدالرزاق نایف) کردووەو کەبۆ نان خواردنی نیوەڕۆ بێتە کۆشکی کۆماری بەیەکەوە کەباب بخۆین کەئەگاتە شوێنی دیاریکراو دەیبەنە ژوورێك لەپڕدا (صدام تکریتی) و (عبدالکریم شیخلی) و چەند کەسانێکی دیکە خۆیان دەکەنە ژوورەوەو میلی کلانشکۆفی لێ ڕادەکێشن عبدالرزاق نایف دەترسێ ودەپاڕێتەوە و هاوار دەکات مەمکوژن، ئنجا (احمد حسن بکر) فریای دەکەوێت و ناهێڵێت بیکوژن کەقسەکانم بۆ (رجب عبدالمجید) تەواو کرد دیقەتیم دا سوور هەڵگەڕا وە تاساو گرژ بوو چاوەڕوانی ئەم دەنگ و باسە ناخۆشەو دڵ تەزێنەی نەدەکرد.

دوای گرتن و دوورخستنەوەی (عبدالرزاق نایف) بەعسی‌یەکان دەستیان کرد بەپروپاگەندەی جۆراوجۆر گوایە نیازی کودەتای هەبوەو دەیویست بەتەنها حوکم بکات، وەکو عبدالکریم قاسم عێراق بگەڕێنێتەوە زەمانی پاشایەتی کۆن، نەوتی عێراقیان بداتێ، بۆچوونێکی سیخوڕی هەبوو بەو نیازەی عەسکەر حوکم بکات.

ئەمە هەنگاوی یەکەمیان بوو کە بەعسی بەتەنها فەرمان ڕەوایی بگرنە دەست.

(عبدالرزاق نایف) ئەفسەری پلەی عقید بوو، زیرەك و زۆردار و پیاوکوژ و خوێنخەوار و سیخوڕێکی پیلان گێڕی زانا و داوێن پیس، زۆر بەرتیل خۆرێکی بێ وێنە بوو، عەرەبێکی شۆفێنی و دژی کورد بوو.

## تێبینی:

دوورخرابۆوە دەرەوەی وولات بۆ لندن، (محمود الندی) بۆی گێڕامەوە وتی: لەسەر داواکردنی (صدام تکریتی) چوومە لای (عبدالرزاق) کەگفتوگۆی لەگەڵ دا بکەم، کەچی لەپەنای من کوشتیان، کە گەڕامەوە یەکسەر صدامم دیت گازندەم لێکرد کەبۆچی یەکێکی دیکەت نەنارد بەم ئیشە هەستێت ئەمە بۆ من زۆر ناشیرینە. (صدام) وتی (ابو شکر) تەنها تۆ ئەتوانیت وا بکەیت (عبدالرزاق نایف) جێگای خۆی ئاشکرا بکات و بەپێیتەوە بێت و میوانداریت قەبووڵ کات؛ ئێمەش فرسەت لەوە وەرئەگرین و کوشتمان، ئەمە پیاوێکی خەتەرناکەو دوا ڕۆژ دەبووە سەرۆکی کۆمار.

(محمود الندی) وتی: (رەفیق ئایا ئەزانیت جەلال طالبانی زۆر برادەرمە؟ ئەترسم پێم بۆ لەندەن لەگەڵی دانیشم، ئەترسێم وەکو ڕووداوەکەی (عبدالرزاق) بکەن!، ئێمە زۆر نزیکین لەکورد خزمایەتیمان هەیە ئەمە زۆر ئەکەوێت لەسەر بنەماڵەی ئێمە.

باسی چەند کەسانێك دەکرا کەئەمانە ئیشوکاری وولات ئەبەن بەڕێوە لەوانە:

١-(احمد حسن بکر) ٢-صالح مهدی عماش ٣-حردان التکریتی
٤-حماد شهاب

(احمد حسن بکر): پلەی ئەفسەر بوو، لەڕووی سەربازییەوە مام ناوەندی بوو، هەروەها لەڕووی سیاسییەوە زۆر لاوازو بێتوانا بوو، زۆردار بوو، پیاوکوژ بوو، بێگفت، دەستێکی بالای هەبوو لەسیخوڕیو پیلان دانان، عەرەبێکی شۆفێنی بوو، هەرچەندە ڕەگەزێکی کورد بوو. بەتاوانباری یەکەم دادەنرا دژی گەلی عێراق، بەتایبەتی کوردو شیعە، هەروەها پەیکەرێك بوو بۆ پاڵ پشتی (صدام حسین)، ئەو کابرایە زۆر حەزی لە لێدانی رەبابە ئەکرد.

کاتی زۆری تەرخان کردبوو بۆ ژەنینی ڕەبابەکەی، لەئیستگەش هەموو ڕۆژێك بەشێك تەرخان کرابوو بۆ ژەنینی ڕەبابە.

(صالح مهدي عماش ):پلەی ئەفسەر بوو، لەڕووی سەربازی‌یەوە ناسرابوو، خوێندەوار، زیرەك، عاقل، شاعر، یاریزانی تۆپی پێ بوو - بیروباوەڕی بەعسی بوو، سیاسەتمەدارێکی عەرەب، پاك بوو، دوژمنی هەموو نەتەوەیی‌یەکان بوو بەتایبەتی کوردو شیعە، لەداڕشتنی سیخوڕی دەستێکی بالای هەبوو.

(حردان التکریتی): پلەی ئەفسەر بوو، فڕۆکەوانێکی شارەزاو ناسراو بوو، خوێندەوار، زیرەك، لەنەخشەدانان دژی جەماوەر دەستێکی بالای هەبوو، باوەڕی بەدیموکراتیەت نەبوو. بەکارێکی تایبەتی ئەچێتە ئیتالیا لەگەڵ سفیری عێراقی بەرەو کۆشکی کۆماری دەڕوات، وەلامیان ئەدەنێ بەهۆی تەلەفۆنی ناو سەیارەکە، وە هەواڵیان پێ دەگات کە(حردان تکریتی) جێگیری سەرۆکی وەزیران، هەموو پلەو پایەیان لێسەندوەوە (صدام تکریتی) بەئاشکرا لەکویت کوشتی، (عبدالکریم شیخلی) ئەو کاتە وەزیری دەرەوە بوو لەگەڵ ژمارەیەکی چەکدار لەفڕۆکەخانەی کویت هاتنە خوارێ، وەزیری دەرەوەی کوێت سەری سوڕما کەچاوی بەو وێنەیە کەوت، ناچار بوو ئەوانەی کە بەتاوانی کوشتنی (حردان تکریتی) گیرابوون، تەسلیمیان بکاتەوەو بەهەمان فڕۆکەش گەڕانەوە بەغدا.

(حماد شهاب): پلەی ئەفسەر بوو، لەڕووی سەربازی‌یەوە بەشارەزا باس ئەکرا، بیروباوەڕی بەعسی بوو، ئازا، پاك، مرۆڤێکی سەنگین. لەکودەتاکەی (ناظم کزار) کوژرا.

صدام گرژی پێ‌نیشان دا کەئەبێت چەند کەسانێکی مەدەنی ببنە ئەندام لە (مجلس القیادة الثورة ) دوای لابردنی عارف عبدالرزاق. (میشیل عفلق) بەم ئیشە هەستاو بەناوی ئەوەی کەنابێت دوو بەرەکی لەناو قیادەی بەعس ڕوویدات و، بەتەنها عەسکەریەکان فەرمان بگرنە دەست، بۆئەوەی کەموکوڕیی نەبێت لەچەسپاندنی یاساو دیموکراتیەت بەرقەرار بێت بەرژەوەندی وولات وا پێویستە کەئەمانەش ببنە ئەندام لە(مجلس قیادة ثورة)، ئەوە بوو پیلانەکەی (میشیل عفلق) سەری گرتوو صدام هاتە پێشەوەو بوو بەئەندامێك، وورده وورده لەپشت پەردەوە دەستی خستە ناو

کاروباری وولات بەپشتیوانی (احمد حسن بکر) و مامۆستاکەی (میشیل عفلق) ئەوان ڕێگایان پێنیشان ئەدا بەناوی دەست کەوتەکانی شۆڕشەوە (بەعس) بەمێژێکی چەکداری پیاوکوژو خوێن مژ و زۆردار ویکوژەو ببڕە ١٠٠ کەس لەژێر فەرمانی تایبەتی صدام دا بوون بۆ چەسپاندنی حوکمی خۆیان کەپەنا نەبەن بۆ پۆلیس و ئاسایش و ئیستخبارات و دادگا ج لەناو خۆیان (بعث) ج لەناو عێراق، چیان بوێ بۆی جێبەجێ بکەن کەئەمە گەورەترین هەڵەی کاربەدەستانی (بعث) بوو کە(صدام تکریتی) لەو خاڵەوە خۆی جێگیر کرد، لەڕێگای توندوتیژی بەتەواوەتی زاڵ بوو.

(میشیل عفلق): هەموو ژیانی خۆی تەرخان کردبوو لەپەنای (صدام)ەوە ئەوپەڕی دژایەتی هەموو گەلی عەرەب بکات، سیاسەتمەدارێکی ناسراو، نووسەرێکی بەتوانا، زیرەك، لەیەکەم ڕۆژەوە تاکو مرد پاڵ پشتی صەدام بوو، چوار جار بەدووړو درێژی لەگەڵیا دانیشتووم لەسەر مەسەلەی کورد وام ئەزانی رای باشە، بەڵام دوای هەرەسەکە بۆم باس کرد کەبەج جۆرێکی نارێك وپێك لەگەڵ ئەو کوردانەی دەگەڕێنەوە بەخراپی دەجووڵێنەوە. ئەوە بوو لەگۆڤاری (أفاق) شتێکی بڵاوکردەوە دائیرەی ئاسایشی گشتی هەمووی کۆکردەوە سوتاندی بەڵام ژمارەی (١٠٠)ی کەوتە دەست خەڵك، من وای بۆ چووم کەکوردی خۆش دەوێت کەچی وتبووی مەلا مصطفی بارزانی چی داوا ئەکرد بۆ کورد بڕۆن بەزووترین کات جێبەجێی بکەن. سوپاس بۆ یەزدانی مەزن کە(صەدام) لەم بارەیەوە بەقسەی (میشیل عفلق) ی نەکرد، لەڕێگای پیلانی خۆی جووڵایەوە کەنەیتوانی زاڵ بێت بەسەر کوردو کوردستان لەسەرەتاوە تاکو ئێستا (صدام) بەهەڵە دەڕوات، ئاسایشی گشتی منیشیان ئاگادار کردەوە کەهاتووچۆی نەکەم.

## پیلان دارشتنی بەعسیەکان:

بۆ دەست بەسەرلگرتنی وولات و بەڕێوەبردنی کەوتنە نەخشە کێشان و پاکسازی لەدەزگاکانی سوپاو ئاسایشی گشتی و ئیستخباراتی عەسکەری و وەزارەتی ناوخۆ.

١- لەمەکتەبی تایبەتی (احمد حسن بکر)ەوە فەرمان دەرچوو بۆ وەزارەتی ناوخۆ کەئەو قوتابیانە وەرگیرێن بەپلەی (مفوض) لەوەزارەتی ناوخۆ، کە(٣) ی ناوەندییان تەواو کردووە، یان لەخوێندن دابڕابوون،

ماوەیەکی کورتیش (دەورەیان دی) لەدوایی‌دا بەشێکیان پلەی گەورەیان وەرگرت.

(کمال پشدەری) برام هەشتەم ناو بوو کەقیوولّ کرا، ئەویش بەهۆی منەوەبوو

٢-ژمارەیەك قوتابی لەوانەی کە (٦)ی ئامادەیی‌یان تەواو کردبوو، یان دابڕابوون لە خوێندن، فەرمان لەمەکتەبی (احمد حسن بكر) ەوە دەرچوو بۆ وەزارەتی بەرگری و کران بە (نائب ضابط) ماوەیەکی کورتیش دەورەیان دی، دوایی کران بە ئەفسەرو پلەی گەورەیان وەرگرت لەسوپادا.

٣-هەموو ئەو بەعسی‌یانەی کە دوور خرابوونەوە لەسەردەمی حوکمەتەکان (عبدالكريم قاسم و عبدالسلام عارف و عبدالرحمن عارف) یەکسەر لەدەزگاکانی حوکمەت چ عەسکەری بوبێت یان مەدەنی وەرگێرانەوە.

٤-دەستیان خستە ناو ئابووری وولآت، ئەوانەی کەسەریەخۆیان بوون بەرژەوەندی گەورەیان دانە دەست وە دەوڵەمەندیان کردن.

٥-ئەو خەڵکانەی کە دژی بەعسیەکان بوون بەنهێنی و بە ئاشکرا لەناویان بردن.

بۆ نموونە:

أ- کاتی خۆی کە(احمد حسن بكر) یان ڕاپێچ کرد بوو بۆ دادگایەکی عەسکەری، تەنها دادوەرەکە بە (احمد حسن بكر)ی نەوتبوو دانیشە، ئاشکراو ڕوونیشە کە تاوانبار بۆی نییە لەژووری دادگا دانیشێ بەلآم کەهاتنە سەر حوکم، ناوبراوی لەدادگا دەرکردو گرتی.

(فؤاد الركابي)تاوانێکیان بۆ دروست کرد و حوکم دراو خرایە بەندیخانەی بعقوبە.

ڕۆژێك لەگەڵ (جەلال تاڵەبانی) چووین بۆ سەردانی (فؤاد الركابي) بەمەبەستی بینینی لەژووری بەڕێوەبەری بەندیخانەی بعقوبە چاومان پی‌کەوت.

(فؤاد) بە(مام جەلال) ی وت عەریفێکی عەسکەری کوردیان هێنایە (انضباط) خانە بەپێی یاساش ئەبێ پلەکانی سەرشانی لێ وەرگرنەوە،

عەریفەکەش وتی من سێ خەتم هەیە، یەکێکیان هی بەعسە، دوانەکەی تر هی خۆمە (بۆ نوکتە) و گاڵتەو گەپ (مام جەلال)یش وەلامی دایەوە و پێی وت: ئیمڕۆ لەعێراقدا بەعس فەرمان ڕەوایی ئەکات کەچی دامەزرێنەری بەعسی عەرەبی ئیشتراکی کە سکرتێری بەعس بووە، ئێستا لەبەندیخانەیە. لەدوایدا (صەدام) بەوەش وازی نەهێناو هەر لەو بەندیخانەیەدا کوشتی.

٦–وەکو نەدیوتکە کادرەکانی ناو بەعس دەستیان کرد بەکۆشک دروست کردن و کڕینی ناوماڵ و ئوتومبێل و هێنانی ژنی تر، بێجگە لەخێزانەکانی خۆیان بەکورتی خۆیان پۆشتە کردەوە لەبەرچاوی جەماوەر.

بەزەقی دوای ئەم کردەوانە ناویان هاتە ناو ناوانەوەو لەسەرەتادا تاکو ماوەیەکی دوور یەکێکیان هەر بەفەقیری خۆی نیشان ئەدا لەبەرچاوی جەماوەر کە گوایا هاتووە تەنها بۆ خزمەت کردنی وڵاتەکەی. هەروەها بەرژەوەندی جەماوەری پێ هەموو شتێکە، ئەو کەسیەش (صدام تکریتی) بوو. بۆ نموونە خاڵەکەی لەیەکەم ڕۆژی هاتنی بەعس فەرشێکی لەخانەقین کڕی بوو بەنرخی ١٢٠ دینار بەمانگانە واتە بە(قسط) پارەکەی ئەدا،من خۆم فەرشەکەم بۆ هێنایەوە بۆ بەغداد زۆری پێ نەچوو خاڵەکەی (حاجی خیرالله طلفاح) بوو بەدەوڵەمەندترین کەس لەسەرانسەری عێراق دا.

٧–بۆچوونیان بەرامبەر بەکورد:

پێش هاتنیان بۆ سەر حوکم پێوەندیان بەهەردووك باڵە سەرەکییەکەی کورد کردبوو کەپارتی دیموکراتی کوردستان و مەکتەبی سیاسی(جماعەتی (مام جەلال)) بوون لەهەموو دانیشتن و کۆبوونەوەکانیان دا دانیان بەلاپەڕە ڕەشەکانی خۆیان دا دەنا کەبەتەنها حوکم ناگرینە دەست ئەبێت حکومەتێك پێك بێت هەموو گروپە سیاسییەکان تێیدا بەشدار بن، ئەمە پروپاگەندەیان بوو بۆخۆشیان بەردەوام ئەم قسەیەیان ئەکرد وە ڕوویەڕووی کورد بەگشتی ئەیان وت ئەگەر ئەم جارە ئێمە بێینەوە سەر حوکم یەکەم شت مەسەلەی کورد بەئاشتی جێبەجێ دەکەین، حکومەتەکانی پێشوو هیچمان نەمان توانی چارەسەری بکەین. هەروەها دەیان وت شەڕ ماڵ وێرانی هەموو لایەکە، وە حکومەتی عبدالرحمن لاوازە ناتوانێت بەرامبەر عەسکەرییەکان دان بەمافە ڕەواکانی کورد بنێت.

کەکاتێك (عبدالرزاق نایف) یان دوور خستەوە و فەرمان ڕەوایی یان گرتە دەست بە قسە وایان پێ نیشان ئەدا کەدوورکەوتوونەتەوە لەباڵی پ.د.ك (بارزانی) بەو بیانووەی کەپاڵیان بەنیزامی شای ئێران داوە ئەم هەلەیان قۆستەوەو خۆیان نزیك کردەوە لەباڵی مەکتەبی سیاسی جماعەتی (مام جەلال) بەئاشکرا زۆر یارمەتی‌یان ئەدان، بەلام بەنهێنی کنەیان ئەکرد کەخەڵکیان لێ بکڕن و دووبەرەکی‌یان بخەنە ناوەوە.

بۆ ئەم مەبەستە (طارق احمد) یان هان دا کەخۆی جیا بکاتەوە، لەگەڵ چەکدارەکانی یەکسەر پاڵ بداتە حکومەت لەکاتێکدا ئەوپەڕی دۆستایەتی‌و یەکێتی هەبوو لەنێوان م.س (جماعەتی (مام جەلال))و بەعسی‌یەکان.

(مام جەلال) لەڕێگەی منەوە وتی ئاگاداری حکومەت بکەوە کەپێوەندیمان ئەپسێنین ئەگەر بێتو (طارق احمد)و چەکدارەکانی نەگەڕێنەوە ناو هێزی عەسکەری م.س.ج.(مام جەلال) لەمەوە بەئاشکرا گومان کەوتە نێوان م.س.جماعەتی (مام جەلال) و حکومەتی بەعسەوە.

حکومەتی بەعس ویستی هێزی سێهەم دروست بکات. ئاشکراو ڕوون بوو کەدوو باڵی سەرەکی هەیە کەئەوانیش (پ.د.ك )بەسەرۆکی‌ایەتی بارزانی و م.س.جماعەتی (مام جەلال).

هەرچەندە لەکاتێکدا هێزی فرسان هەبوو کەناویان نابوو (جاش)، ویستیان هێزی سێیەم دروست بکەن لەسەرۆکی هۆزەکانی کورد کەنیشتمان پەروەر بوون بۆ ئەم مەبەستە لەڕێگای منەوە پەیوەندیم بەچەند سەرۆکی‌ێك کرد، هیچ کامێکیان نەهاتنە ژێر ئەو پیلانەی بەعس، وەلامیان دامەوە کەمەسەلەی کورد تەنها لەڕێگەی ئەم دوو گروپە سیاسیانەوە ئەتوانن گفتوگۆ یان لەگەڵ بکەن بۆ جێبەجێ کردنی.

لەهەمان کاتدا چوومە بارزان لەگەڵ شێخ (عثمان بارزانی) بەیاوەری شێخ بابۆوە کەبرای مەلا مصطفی بارزانی بوو لەگەڵ کوڕەکەی کە تەمەنی (٨) سالان بوو هاتینە بەغداد لەڕۆژی هەینی بەهاری ساڵی ١٩٦٩ چووینە لای (احمد حسن بکر) لەهەمان کات (عمر هزاع) و (شفیق الدراجی) ئامادەبوون، کاتێك کەچووینە ژوورەوە (احمد حسن بکر) بەتووڕە بوونێك و گرژی‌یەکی زۆر ناشیرین ڕووی کردە شێخ (عثمان بارزانی) بەدەنگێکی بەرز وتی ئایا من (عبدالسلام عارف م ) یان (عبدالرحمن عارف) م؟ من (احمد حسن بکر)م

ئەگەر بێتوو ئەمە بەسەرما تێ پەڕێت لەکاتێکدا مـلا (مصطفى) قیادەی شۆڕش دەکات و شێخ (احمد بارزانی) پارە بکێشێتەوَە لە ئێمە. منیش چوومـە ناوەڕاسـت و وتم: (سـلام علیکـم جنـابی) سـەرۆکی سـەعاتێکە دانیشتووین و میوانداریەکتان نەکردووین، تۆش ئەگەر ئەمە بەم جۆرە گرنگ بێت، دیارە دەعارێکی کوردت تێدایە! وتی: رەفیق تۆ ئەمە چۆن ئەزانیت؟! وەلامم دایەوە وت:م ئێمە ماوەیەك دراوسێی ماڵی (عبدالكريم الندى) بووین هاتووچۆی یەکتریمان کردووە بەڕێزتان بەهاوسەرەکەم ودایکمت ووتبوو من ڕەگەزم کوردە (احمد حسن بكر) وتی: تۆ ابو کێت پێ دەڵێن؟ منیش وەلامم دایـەوە وتم: کچەکـەم نـاوی ڕوویـارە، ئـەوان بـە ڕوویـا بانگیـان کـردووە، خۆشحاڵی خۆی دەربڕو ئەحواڵی ماڵەوەو دایکمی پرسی ووتی (عمر اغـا) کـە حاکم بوو لەتکریت خـاڵم بـوو کـوردە، ئینجا بـەخێرهاتنێکی گـەرمی کردین سەرو دەمانچەی پێشکەش کردین، دوایی دانـی پیاهێنـا کەڕەگـەزی کـوردە، کەچی زیاتر دەستی بە لەناوبردنی کورد کرد.

(عمر مزاع ): ئەفسـەر بـوو گەیشـتە پلـەی (قـائد فرقـه)، بیروبـاوەڕی بەعسی بوو، ئازا،حەزی بەدۆستایەتی کورد دەکرد، خزمێکی نزیکی (احمد حسن بكر) بوو. بەفرمانی تایبەتی صدام تکریتی بەزیندویەتی زمانیان بڕی و دوای ئەوەش کوشتیان.

(شێخ عثمان بارزانی ): کوڕی شێخ احمد بارزانی، ئازا، زیرەك، خوێندەوار،کوڕی گەورەی شێخ ئەدهەم.بەفرمانی (صدام تکریتی) لەگەڵ ٣٤ کەس لەبنەماڵەی شێخەکانی بارزان کوشتیانن.

صدام و بیرکردنـەوەکانی: وەك ڕوون وئاشـکرایە بـۆ ئـەوەی دەسـەلاتی خۆی بەسەر عـێراقدا بچەسـپێنێت بـەهۆی کـاری تونـدو تیژیـەوە ئێسـتاکە قائدێکی وولاتەو ئیتر پێویست بەوە ناکـات وەکـو پێشـتر هـێزێکی چەکداری خوێن مژ لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە چونکە ئەمە بۆ سەر شانی جـوان نیـیە، پێویسـتی بـەوە بـوو کەکەسـێك بدۆزێتـەوە وەکـو خـۆی درنـدەو پیـاوکوژ و هـەروەها ناسـراو بێـت لـەناو هـەموو گـەلانی عـێراق دلو بەتایبـەتی لـەناو حزبەکەی خۆی واتە (بەعس)،بەناو بۆ چەسـپاندنی فـەرمان ڕەوایـی بـەعس، بەلام لەڕاستیدا بۆ مەبەستی بەدەست هێنانی ئارەزووەکانی خۆی بوو لەژێر پەردەی ئەو فەرمان ڕەوایی‌یەدا بـۆ ئـەم مەبەسـتەی صـدام کـەباسمان کـرد

لەکەسایەتی (ناظم کزار) دا بەدی کرد واتە کەسایەتی ناظم کزاری هەڵبژارد بۆ ئەم مەبەستە.

ئەمە یەکەم بڕیاری (مجلس قیادة الثورة) بوو کەمرۆڤێکی مەدەنی بەپلەی (لواء) دامەزرێنێت وە لەدوایی دا کرا بەبەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی (مدیر الامن العامة) هەروەها بەجێگیری بەڕێوەبەری پۆلیسی گشتی (مدیر الشرطة العامة )لەساڵی ١٩٦٩.

ناظم کزار ١٠٠٪ هەموو فەرمان و ئارەزووەکانی (صدام)ی جێبەجێ کرد هەروەها ووتەو فەرمانەکانی (نازم گزار) ڕەتکردنەوەی نەبوو.

بەیانی‌یەکەی دەرنەچوو بووم لەماڵەوە (جمیل صبری عبدالله) مفوض بوو لەئاسایشی گشتی پەنای بۆ هێنام کەنیازی چوونە دەرەوەی هەبوو بۆ دەرەوەی ووڵات بەمەبەستی تەداوی(چارەسەرکردن) کەتووشی نەخۆشی پێست بوو بوو کاروباری سەفەرەکەی لای (حامد العانی) بوو ئێستاکە ناظم کزار بۆتە بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بەهیچ جۆرێك ڕێگام نادات پێی وتم: ئەبێت لەگەڵم بێیت بۆ ئەوەی بڕیار بدات سەفەر بکەم ئەوەندە پاڕایەوە ناچاری کردم، لەکاتێکدا پێم ووت من لەگەڵت دێم، بەڵام من یەك جار (ناظم کزار)م دیوە کەبەڕێوەبەری پەیوەندی‌یەکانی (مجلس قیادەی ثورة) بوو زۆر زەحمەتە بتوانم بگەمە لای چونکە دەورو تەسلیمی لەگەڵ دەکەن، پێشی کەوتم بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی واتە (دائرة الامن العامة) لای (عقید حاجی عبدالواحد نوری) کەیاریدەدەری بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی بوو دانیشتم کەئاگاداری بکەن بەمەبەستی ئەوەی کەکەی کاتی بێت بتوانم چاوم پێی بکەوێت کەچوومە ژوورێ بەگەرمی‌یەوە بەخێرهاتنیان کردم بەتایبەتی (ناظم کزار) منیش پیرۆزبایم لێکرد بەمەبەستی دامەزراندنی لەبەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی، سێ قۆڵی سەریان پێکەوەنابوو کارە نهێنی‌یەکانیان ئەنجام ئەدا ئەم سێ کەسەش بریتی بوون لەمانە:(ناظم کزار) بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی، (حامد العانی) جێگری وەزیری ناوخۆ پێش ئەوە بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بوو. (عبدالخالق عبدالعزیز) بەڕێوەبەری کاروباری سیاسی لەدەزگای ئاسایشی گشتی وتم (ابو حرب) (ناظم کزار)،نامەوێت کاتت لێ بگرم ئێوە ئیشوکاری گرنگتان لەبەردەستایە وا ماوەی دوو کات ژمێرە پەیوەندیت کردووە بەبەڕێوەبەرایەتی‌یەکەتەوە

منیش هاتووم برادەرێکی دڵسۆزو خۆشەویستم هەیە تووشی نەخۆشی یـەکی کوشندە بووە و ئەیـەوێت بڕواتــە ئـەلمانیا بەمەبەسـتی چارەسـەرکردنی نەخۆشییەکەی ئنجا تکام وایە (معاملـە)کەی لەبەردەستایە بڕیاری خۆتـی لەسەر بدەیت و بۆی تەواو بکەیت وتی: ئەمە ئاسانە دەست بەجێ بڕیاری بۆی ئەنجام بدرێت.

ڕەفیق پشدەری ڕۆژانە سەر دەکات بەم وەزارەت و ئـەو بەڕێوەبەرایەتیـەدا، بەلام زەحمەتە بتوانین دەست نیشانت بکەین کەبەڕاستی لەچ شوێنێکیت، یا سەرت کردووە بەچ وەزارەتێك، وەرە بارێك بکەوین و ئیش بکەین بەیەکەوە، هەروەها بەیەکەوە لەسەر ئەم مێزە کاروباری وولات بەرین بەڕێگاوە، نـاهێڵم هیچ گـیروگرفتێك بێتـە ڕێگـات، چیـت دەوێ هـەتاکو بۆتـی بکـەم دەربـارەی پارمەتی دانی خەڵك بەشێوەیەکی گونجاو بۆت جێبەجێ بکەم بەپێی توانا و یاسا.

وتم: ((ابو حرب)) زۆر زەحمەتە بتوانین بەیەکەوە کار بکەین لەبەرئـەوەی بۆ چوونمان جیاوازەو زەحمەتە یەك بگرین هـەروەها دۆستایەتیەکەمان لـە دوورەوە بێت باشترە و، زەحمەتە تۆش بتوانیت من قبـووڵ بکـەیت بـۆ ئـەو کارە، ئایا تۆ ئەتەوێت دەنـگ وباسـت پـێ ڕابگەیـەنم کەئەمـە بەعسیە، یـان ئەمە شیوعیە، ئەم کارە کاری من نییە، بەلام ئەگەر هـاتوو ڕاستیەکانم ووت بەتۆ لەدوایدا پێستم ناچێتە دەباخانە؟ ئێستاکە بەگشتی دانیشـتوانی بـەغدا باسی دامەزراندنی تۆ دەکەن و ئەڵێن (ناظم گزار) ناظم قصاب لـەم شـوێنە گرنگە دامەزراوە واتە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی دەبێتــە هـۆی ئـەوەی کەخوێن بەجۆرێك بڕژێت تـاکو خوێـن ئەگاتـە ئـەژنۆ، هـەروەها دەڵێـن (١٢) بەڕێوەبەری هەیە، هەریەکـە لـەجێگای خـۆی دانیشـتووە لەپشـت مێزەکـەی جووڵـەی تێـدا نییـە، نـازانیت چـۆن چۆنـی لەگــەڵ بــەڕێزتان بجووڵێنــەوەو ڕاپۆرتی ڕۆژانەی خۆی پێشکەش بە بەڕێزتان بکات.

(ابو حرب) ووتی: من لەمرۆڤی وا دەگەڕێم، ئەویش تۆی ڕازیـم و دەرگـای ژوورم کراوەتەوە لەئاستی تـۆدا و دەبێـت هـەموو ڕۆژێك کەدانیشـتم لەسـەر کورسـی‌یەکەم یەکـەم کـەس تـۆ بیـت بێێتـە ژوورەوە گفتوگـۆ بکـەین،بـۆ جێبەجێ کردنی هەموو گیروگرفتێك لەپێناوی خزمەت کردنی وولات.

(ناظم كزار) (ابو حرب): خەڵكی عمارەیە، ئاینی صبی بوو، دەرچووی پەیمانگای پیشەسازی بوو، كادرێكی كۆنی بەعسی ناسراو بوو، زیرەك، ئازا، خوێندەوار، پاك لەهەموو ڕوویەكەوە،دەست بڵاوو (سەخی)، كەم دەدوا، كەدەستی ئەكرد بەقسەكردن سێ سەعات لە سەریەك قسەی دەكرد، پەیوەندی خزمایەتی خێزانی نەدەزانی، دژی نەتەوەی كورد نەبوو، تێكەڵاوی لەگەڵ كورد هەبوو، (زاوایەكی كورد بوو) خێزانی نەبوو، دژی سەروەت و سامان بوو هیچی نەبوو.

## صدام وكێشەكانی:

١-گەیشتە ئەو باوەڕەی كەلەدەرەوەی وولات جموجۆڵێكی ئاشكرا لەئارادایە بۆ گۆڕینی سیستەمی عێراق(بەعس).
٢-جەنەراڵە عەسكەرییەكان خاوەن پلەو دەسەڵاتدارن حسابی دوارۆژیان بۆ دەكرێت، ئنجا هەموو قائد فرقەكان سەر بە(بكر)ن بەشەخصی.
٣-كێشەی ناوخۆی گروپە سیاسییەكانی ئەوانەی كەلەعێراقدا بەشێوەیەكی نهێنی كاردەكەن لەدژی حكومەتی بەعس لەوانەش بەعسی سەر بەسوریا.
٤-كێشەی كورد:

* هەرچەندە باڵی م.س جماعتی (جەلال تاڵەبانی)، عەسكەری وسیاسی شان بەشانی بەعس ڕاوەستاون وە ڕۆژنامەی (النور) ڕۆژانە دەردەچێت خوێندەوارێكی زۆری هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەمەش دا بەتەواوەتی دەست بەسەر كوردستان بگرن، هەروەها باڵێكیش هەبوو كەبریتی بوو لەچەند كەسانێك لەناو بەعس دا دژایەتی م.س.جماعەتی (جەلال تاڵەبانی) یان ئەكرد.

گفتوگۆ دەستی پێ كرد لەنێوان پ.د.ك و بەعسی و پروپاگەندەی بۆ دەكرا.

لە ٥ی مانگی ئازاری ١٩٧٠ لەماڵی ئێمە لەبەغدا -حی العرب كۆبوونەوەیەك كرا لەسەر داواكردنی بەعس بۆئەوەی بەباڵی م.س جماعەتی (مام جەلال) بڵێن كەوا گفتوگۆ هەیە لەگەڵ باڵی پ.د.ك - بارزانی نەگەیشتوونەتە ئامانج وە كەڕێكیش كەوتن ئەوان باڵێكن لە كێشەی كورد.

(صدام تكريتي):دوای ئەوەی گەیشتە ئەو باوەڕەی کەلە دەرەوەی وڵات جموجۆڵێکی ئاشکرا بەردەوامە بۆ گۆڕانی سیستەمی عێراق و، ڕووسەکان لەڕێگای حزبی شیوعی ئاگاداریان کردن و، بزیماکۆف بەم کارە هەڵسا.

بۆ ئەم مەبەستە و دەوری سەرەکی بۆ ئەم مەرجە گۆڕان لەعێراق دا بەکارهێنانی دۆسیەی کورد ئەویش بارزانی یە کە (صدام) بەم هەموو خەتەر ناکەی زانی ڕووی کردە گەلاڵە ئەو کاتە ئامادەبوو کەکاغەزی سپی بۆ مەلا مصطفی بارزانی ئیمزا بکات. نەك هەر کەرکوك، بەڵکو هەتاکو سنووری ڕاستەقینەی کوردستانی باشوور کەدەگاتە(جبل حمرین) ڕازی بێت، بارزانی توند بوو لەسەر کەرکوك و (مجلس قیادەی ثورة)، بەڵام بەداخەوە چەند کەسانێك لەدەوروپشتی بارزانی لەسەر ڕێکەوتن نامەکە هەوڵێکی زۆریان دا کەڕازی بکەن، هەروەها لەم دۆسیەی ئیمزا کردنەی بارزانی و بەعسدا بریماکۆف دەوری هەبوو بۆ ڕێکەوتنەکەیان.

## * بەیانی ١١ی ئازاری ١٩٧٠:

گەورەترین ڕووداوە لەمێژووی کورد دا لەدوای تێکچوونی کۆماری (مهاباد) کە چەند لەسەری بنووسی کەمە. جووڵانەوەیان بەرامبەر م.س.جماعەتی (جەلال تاڵەبانی)، ڕۆژنامەی (النور) لەژێر چاپ دا بوو، نیوەی چاپ کرابوو بەفەرمانی صدام لەڕێگای (احمد حسن بکر) بەتەلەفۆن ئاگاداری وەزارەتی ڕۆشنبیری کرد کەنابێت ڕۆژنامەکە دەرچێت وە بەهیچ جۆرێك بڵاوبکرێتەوە.
لەهەمان کات جەلال طالباني پیرۆزبایی لەو ڕێکەوتنامەیە کرد، هەروەها مامۆستا ابراهیم احمد ئەو کاتە لەدەرەوەی وڵات لە(لندن) بوو، چوو بۆ باڵیۆزخانەی عێراق بۆ پیرۆزبایی کردن لەبەیاننامەی ١١ی ئازار..
خۆپیشاندانێك ڕووی دا لەبەغدا کەئەمە یەکەم جارە بەم شێوەیە خەڵك بێتە سەر شەقام کەس باوەڕی نەدەکرد کەهێندە کورد هەیە لەبەغدا لەبارەگای باڵی (م.س.جماعەتی جەلال تاڵەبانی) دانیشتبووین، من وتم: ئەچمە لای برادەرەکەم (ناظم کزار) سەرێکی ئەدەم بزانم چ حاڵە کەچوومە ژوورەوە بۆلای تەماشای تەلەفزیۆنی ئەکرد قاقا پێئەکەنی بەم ڕووداوە ووتی ئیتر ئێمە بەتەواوەتی دەستمان گرت بەسەر عێراق دا، دوای چەند ڕۆژێك داوای لێ

کردم بەناوی پشوودان بچم بۆ (قاهرە)، وتی: مەگەڕێوە هەتاکو وەڵامت بۆ نەنێرم، نزیکەی مانگێك لەئوتێل هێڵتۆن بووم، ڕۆژێك (انور پامر) بالوێزی عێراق هاتە لام پێی ڕاگەیاندم کەداوات ئەکەن لەعێراق بگەڕێیتەوە.

- فاخر بارزانی بەناوی (مەلا مصطفی بارزانی) هاتبوو بۆ بەغدا لەگەڵ (جەلال تاڵەبانی) کەوتبووە گفتوگۆ کردن، هەروەها تۆفیق وەهبی بەگ لە(لندن) دادەنیشت نووسراوێکی ئاراستەی بارزانی کردبوو کەپێویستە لەم کاتە دژوارەدا کورد یەك بگرێت و، ئاشت بوونەوەیەکی گشتی لەنێوان هەردوو باڵە سەرەکییەکەی کوردا ڕوویدات و بکرێت.
- چاووم بەسەرکردەکانی بەعس کەوت بۆ ئەوەی ئەم ڕووداوانەی خەریکە ڕوو بدات ئاگاداریان بکەمەوە بەڕای خۆم تیشکی بخەمە سەر، گومانم نییە لە من باشتر ماهیەتی باڵی مەکتەبی سیاسی جەماعەتی (جەلال تاڵەبانی) لەهەموو ڕوویەکەوە باش دەزانن، شێوازی سیاسیو عەسکەری ئێستاکەی بارزانی وا خەریکە لەچەند ڕێگایەکەوە هەوڵ دەدەن کەلەگەڵیان ڕێك بکەوێت وە بۆ ئەم مەبەستەش بەزەقی فاخر بارزانی بەم ئیشە گرنگە هەڵدەسێت. کێ دەڵێت دوای چوار ساڵی دیکە ئەم ڕێکەوتنە هەڵناوەشێتەوە کەی ئەمە بەرژەوەندی ئێوەی بەعسیە، گروپێکی سیاسی عەسکەری هەموو شتێکتان تێدا مەوجود بێت، ئێوە خۆتان مات کردووەو بێ دەنگ ڕاوەستاوون.

## وەڵامی هەموویان (بەعس) بەئاشکرا بەم جۆرە بوو:

[کذب اذا احنا نگول عدنا صدیق بین الاکراد] [احنا نگول عدنا صدیق واحد بین الاکراد هو البارزانی] [روحوا کلکم التحقوا بالبارزانی قوە البارزانیین قوە البعث] مفهوم یا رفیق پشدەری؟

واتە درۆیە ئێمە بڵێین برادەرێکمان هەیە لەناو کوردا ئێمە تەنها یەك برادەرمان هەیە ئەویش بارزانییە بڕۆن گشتتان بچنە پاڵ بارزانی هێزی بارزانی هێزێکە بۆ بەعس. ڕەفیق تێگەیشتی؟

*** تێبینی:**

لەبڕیاری ١١ی ئازاری ١٩٧٠ دا دوو ئەندامی (مجلس قیادة ثورة) ئیعتزلیان نەکردبوو (ڕازی نەبوو بوون).

ئەوانیش هەردووکیان ناسراوبوون کەڕەگەزیان کوردە، هەولی زۆرو دا کەبزانە هۆی چییە ئیعتزلیان نەکردووە؟! ئەو دوو کەسەش (طه یاسین رمضان) و (عبدالکریم شیخلی) بوون، دەیانگوت:

أ- ئێمە هەموو بیرکردنەوەیەك و بۆچوونێکمان عەرەبی یە، وەکو عەرەبێکی نەتەوایەتی بیر دەکەینەوە.

ب- ئەم هەڵوێستە لەدوارۆژدا عێراق لێك جیادەکاتەوە و پارچە پارچەی دەکات.

باڵی م.س جماعەتی مام (جەلال تاڵەبانی) بوون بەسێ بەشەوە:

١-بەشی هەرە زۆریان چوونە پاڵ پ.د.ك (بارزانی).

٢-چەند کەسانێك ڕۆیشتنە دەرەوەی وڵات لەوانە حلمی علی شریف بوو.

٣-بەشێك پاڵیان دا بەحکومەتی بەعس من یەکێك بووم لەوانە، مامۆستا (ابراهیم احمد) و (جەلال تاڵەبانی) ئاگاداریان کردمەوە کەقسەیان لەگەڵ بارزانی کردووە دەربارەی من (رفیق پشدەری) کەدەستێکی باڵای هەیە لەناو حکومەت سوود بەخش دەبێت کەلەجێ خۆی بمێنێتەوە.

پێوەندیم بەردەوام بوو لەگەڵ شۆڕش لەڕێگای برادەران جماعەتی (مام جەلال).

- (ناظم گزار) و من (ڕەفیق پشدەری) ڕۆژگارمان بردە سەرو برایەتی و دۆستایەتی و باوەڕمان بەجۆرێك پتەو بوو، کەجێی سەرسوورمان بوولای کەسوکاری وەکاریەدەستانی بەعس، بۆ نموونە (صدام حسین) تاکو ڕۆژی کودەتاکە لێك جیابووینەوە.

دەرگای ماڵم کرابۆوە بەپێی توانا هەرچی ڕووی تێدەکردم خزمەتکاریم ئەکرد یارمەتیم ئەدا چ کورد، یان عەرەب. بۆ نموونە بەشێکی زۆر کەم لەم شێوانەی خوارەوە بەکورتی باسی دەکەم.

- ڕۆژێك مجید خانی حەمە ڕەشید خانی بانە بەتەلەفۆن قسەی لەگەڵ کردم ووتی لەئوتێل (میامی) دابەزیوم بەختیاری کوڕم لەبازگەی (سیطرة)ی بەغدا گیراوە بەدەمانچەوە نزیکەی ٦ ڕۆژە تکام وایە کەبەیانی یەکەی بێیتە لام جل وبەرگ و پێویستیەکانی بۆ بەرین وە چاوم پێ بکەوێت.

وتم: – ئەگەر هیچ تاوانێکی نەکردبێت بەیانیەکەی سەعات ٩ بەیەکەوە نانی بەیانی ئەخۆین.

بەخۆی و دەمانچەکەی سەعات ٥٠ر٨ گەیشتینە لای مجید خان.

● ڕۆژێك باوکی هاتە لام ئاگاداری کردمەوە ئەمە چەند جارێکە دەمەوێت چاوم بە(ناظم) بکەوێت، بەڵام ناگەمە لای.

وتم (ابو حرب) هۆی چیە باوکت نابینی وەڵامی دامەوەو (واسطة)ی باوکم کۆتایی نایەت، وتم لەهی منیش زۆر ترە، لەگەڵ باوکی بەیەکەوە چووینە ژووری لای (ابو حرب).

● شەوێك درەنگ گەڕامەوە ماڵەوە هاوین بوو، لەسەربان ئەخەوتین، دیم ئافرەتێك لەگەڵ منداڵەکەی خەوتوون دەرکەوت خێزانی قادر تەگەرانییە لەگەڵ کوڕەکەی تەمەنی ٩–١٠ ساڵان ئەبوو لەسوراغیّ ئەگەڕا کەچی بەسەرهات ماوە یان نا چی لیّ ئەزانی؟

وتم: یەکەم جار هاتە لام کەبەحکومەتی بناسێنم ڕێگام لیّ گرت، لەدوایی دا لەڕێگای ئامۆزایەکی و (یاسین رمضان) پێوەندی بە(ناظم کزار)ەوە کرد بوو، جاری دووەم هاتە لام سەیارەکەیان لیّ ساندبۆوە، زۆرم وت گوێی لێنەگرتم بەپێی خۆی لەگەڵم هات بردمە لای ناظم کزار،جاری سیّهەم لەگەڵ برایەکی دڵسۆزم (أبراهیم حمە) خورشە هاتنە لام کە(ناظم کزار) چەکی کردووە لەهەموو شتێك ئەم جارە زۆرم وت کەبۆ خۆتوو خێزانت ئەمە باشترە کەلەگەڵیان نەبێت، ئەوەندە پاڕایەوە ناچاری کردم هەرچەندە أبراهیم حمە خورشەش زۆری لەگەڵ وت، ئەم جارەش دەستم گرت چووینە لای (ناظم کزار) ئیتر ماوەیەکە بەهیچ جۆرێك ئاگادار نیم ونەهاتوەتە لام، دەنگ ویاسی لای خەڵکە نازانم چی بەسەر هات،کوڕەکەیم لەگەڵ خۆم بردمە دەریّ لەدەرگای ئاسایشی گشتی ڕاوەستام وتم تۆ لەناو سەیارەکەت نەیەیتە دەریّ، بەدووررو درێژی بۆ ((ابو حرب)) م گێڕایەوە تکام لیّ کرد وەڵامێکم بدەرەوە، تەنها ووتی کوانیّ کوڕەکەی وەڵامم دایەوە، ڕۆیشتنەوە بۆ سلێمانی.

**تێبینی:**

رکردم پرسی تەنها ئەمەم زانی هــەموو ئـەو خەڵکانـەی کـە بـەفرمانی قـادر تەگەرانی کۆکرابوونەوە شەو سـواری سـەیارەی لـۆری عەسـکەری کرابـوون، کەسێکم نەدییت بەچاوپێکەوتن شـتێك ئاگـادار بێـت، تەنـها صـدام و (نـاظم کزار و (احمد حسن بکر)) ئەیان زانی.

لای بەعس بەتاوانباری شـی لێران دایان نابوو (کەپیاوی شایە).

- رۆژێك خێزانی حسین شـیروانی و لەگـەڵ براکـەی هاتنـە لام ووتیـان هەندێ شتمان هەیـە وەکـو دەرمـان و سـەعات و بـەرماڵ نـاتوانین وا بکـەین بگاتە دەستی ئێستاکە لەبەندیخانەی (ناظم کزار) ە لـە(قصـر النهایـە) وتم: هەمووی بخەنە ناو جانتایەك بی نووسن بیکەنە لیستە بۆم بێنن ئێوارەکەشی وەرن وەصلەتەکەتان (پسووڵەکەتان) بدەمەوە،تەسلیم بەنوێنــەری تایبـەتی (ابوحرب )م کرد کەهاتووچۆدەکات بۆ (قصر النهایـە) بـەناوبراوم وت لەسـەر فرمانی (ابو حرب) ئەم جانتایە بەرە ئەویش لیستەکەیە پێی ئیمزا بکەو بۆم بێنەوە، (ابوحرب) لەرووی نەدام کەئەم کارەم بەبێ ئەو کردووە.
- (محمود خفاف) ئەفسەرێکی کـورد بـوو لەبەشـی بازرگـانی (شـعبە الاقتصاد) ی ئاسایشــی گشـتی کـەداوایان لێکردبوو بـۆ لێکۆڵینـەوە لـەکاتی خۆی شتوومەکی عەسـکەری کڕیـوە کومسیونی وەرگرتـووە جێگـە نـەمابوو بچێتە ناوی ڕاستەیەکەشی داوێکی گەورەیان بۆ ڕێك خستبوو.

لەگـەڵ خـۆم بردمـە لای (ابـو حـرب) ئـەم هێشـت یـەك چرکـە بگـیرێت و لێکۆڵینەوەی لەگەڵ دا بکرێت.

- (رشـید عـارف) سیاسـەتمەدارێکی کــوردو دەوڵەمــەندە ناســراوە، بەتاوانی گەورە گیرابوو یەکێکیان چوەتـە اسـرائیل. لەچاوپێکـەوتنی لەگـەڵ بارزانی دلگوتبووی ئەگەر (رەفیق پشدەری) نەبوایە ٢٠ ساڵ حوکم دەدرام، خانووێکی لەوزیریە دامێ ئەو کاتە نرخی ١٣ هەزار دینار بوو، وەڵامم دایـەوە ئەمە ئیش وکاری من نییە من بەپارە ئیش ناکەم.
- (حامد العانی ) وەکیلـی وەزیـری نـاوخۆ برادەرێکـی دڵسـۆزم بـوو، ووتی:بە گوێرەی یاسا ئاسایشی گشتی بەستراوە بەوەزارەتی ناوخۆ وە ئێمە ئەزانین کە (ابو حرب) پەیوەندی یەکانی یـەك سـەر بـە(سـید نـائب) (صـدام تکریتی) یەوەیە، (ابو حرب) نەچاك نەخراپ بەهیچ جۆرێـك هـاتووچۆ لەگـەڵ

(سعدون غیدان) ناکات، حەز دەکەم بچینە ناو ئەو بابەتەوە و (ابو حرب) لەقسەی تۆ دەرناچێت.

(حامد العانی) دوای دوو ڕۆژ ئاگاداری کردمەوە ووشەی سوپاسی ئاراستە کردم. (ابو حرب) خۆی هاتە لای.

- سەر لەبەیانیەك سەیارەیەکی ڕەشی مۆدێل کۆنی اولدزمۆبیل لەبەر ماڵمان ڕاوەستا دایکم ڕۆیشت بەپیریەوە ووتی هاتووم ڕووم لەماڵی ئێوە کردووە یارمەتیم بدەن من فلانم.

لەگەڵ خۆم بردمە ئاسایشی گشتی چوومە لای (ابو حرب) بەپێوە پێم ووت ئاخر زەمانە کچی (صالح جبر) ڕوو بکاتە ماڵی رفیق پشدەری بۆ یارمەتی دانی من بڕوا ناکەم ئەم حکومەتە دەوام بکات یەك سەر کارەکەی ئەنجام دا (ابو حرب) توانجێکی لێ دا وتی: وەزارەتی (صالح جبر) بڕیاری خنکاندنی چوار ئەفسەرە کوردەکەی دا، وەڵامم دایەوە ڕاستە، بەڵام (وەصی عبدالله) پێی داگرت ئەبێت ئەم کارە ئەنجام بدرێت (صالح جبر) چونکی کاتی خۆی ئەفسەرە عەرەبەکانیش بڕیاری خنکاندنیان درا.

- جارێك (ابو حرب) ٢٠٠٠ هەزاری دیناری دامێ ووتی برۆ لەکوێت تازەترین مۆدێلی ئوتومبێلی پێ بکڕە وە بیهێننەوە بۆ بغداد، ئاخر مۆدێلی سەیارەی شوفرلێتم هێنا، دوای ماوەیەك دەوریەی گومرگ گرتیانم کەئەم ئوتومبێلە گومرگ نەکراوەو قاچاغە، کەفیلم دا معاملەکەم لەماوەی یەك مانگ دا جێبەجێ بکەم، لەدوای ١٢ ڕۆژ ئاگاداری ((ابو حرب))م کرد داوای لێ کردم عەریزەیەك بنووسە بۆ من ئەویش لەڕێگای خۆیەوە ڕەوانەی (مجلسی قیادەی ثورة)ی کرد لەدوای ٤٨ سەعات (شفیق الدراجی) بەتەلەفۆن ئاگاداری کردمەوە (علیها صینیه بقلاوه) واتە شیرینی بڕیارەکە سینێك پاقلاوەمان بۆ بنێرە.

ئەوەی باسم کرد، ڕەنگە یەك لەهەزار بێت کەبەپێی توانا خزمەتم کردبێت.

- ئێوارەکەی بیستم کە ویستوویانە بارزانی بکوژن سوپاس بۆ یەزدانی مەزن ڕزگاری بووە، بەم کارە زۆر دڵ تەنگ بووم لەناوەڕۆکدا دنیام لێهاتەوە یەك. ئێوارەکەی (مام جەلال)م دی بۆم باس کرد، لەگەڵ ئەو مەلایانە چەند جار بەرەنگاری یەك بووین لەو کاتانەی کەمن ئەچووم بۆ لای

(ابو حرب)، یـان ئـەوان دەهاتنـە دەرێ وتم بـەهیچ جۆرێك ئەمـەم نـەزانیوە ئەگینا خۆمم دەگەیاندە لای بارزانی.

- ڕۆژگار هاتوو ڕۆیشت ڕۆژانە لەیەکتر نزیك دەبووینـەوە لەگـەڵ (ابـو حرب) لەکاروباری نـهێنی وە چۆنیـەتی بەشـێك لەکاربەدەستان کەوتبوونەتـە بەرە کێکردنەوە لەوانە وەکو فلان و ... کەبێت ئەوەی کە ناوی بەناو باسی ئەم دوو بنەماڵەیەش بکەین و (حاجی خیرالله) بەتاییەتی.
- (ابو حرب) باسی بابا علی شێخ محمودی لەگـەڵ کردم بـەبۆچوونی ئـەوان کەیەکێکـە لـەکوردە ناسـراوەکان بـەبۆچوونی بەعسیەکان دۆسـتێکی دێرینی ئەمریکایە بوونی ئەمە لەدەرەوەی وڵات لەدوا بۆ دواڕۆژ خەتـەرێکی گەورەیە، ئەچیتە (بەیروت) بەناوی (احمد حسن بکر)ەوە گفتوگـۆی لەگەڵدا ئەکەیت و ڕێگای بۆ خۆش بکە متمانەت پێ بکات بۆ گەڕانەوە.

وتم: باشە بەڵام من لەئاستی ئەو پیاوە مەزنە نیم، ئـەوە کـوڕی مـەلیکی کوردستانە. ڕاستە یەکتر ئەناسین ڕێگـام پـێ بـدە برادەرێکی خۆشەویسـتی هەر دوولامان ناوی (شوکت بەگ جاف)ە ئـەو دۆسـتایەتی زۆر زۆر بـەهێزە و کۆنە، ئەمە ئەبەم لەگەڵ خۆم، لەگـەڵ شوکت بـەگ جـاف (ابـو حـرب) مـان دیت ئنجا چووینە بەیروت سـەردانی (بابـا علـی) مـان کـرد مـاوەی سـێ ڕۆژ لەسەریەك بەشی زۆری کاتمان لەخزمەتی‌دا ئەبردە سـەر، سـێ قۆڵـی هـەموو ئەو باسانەمان کـرد کـەبۆی هـاتووین، (بابـا علـی) ڕازی وخۆشـحاڵ بـوو کـە بەزووترین کات بگەڕێتەوە لەگەڵ ئێمە.

ئینجا هەستم بەخەتەری ئەنجامەکەی کرد کەدوا ڕۆژی ئەم پیاوە مەزنە چ ڕوو دەدات، تۆباڵی گرتنی یان کوشتنی دێتە مـل مـن، لەفرسـەتێکدا دڵـم بـۆ کردەوەو ئەوەی ئەم زانی ڕاستیەکەم پـێ ڕاگـەیاند، وتم دەگەڕێیتـەوە ئەمـە پەیوەندی بەخۆتەوەیە ڕەنگە دیاری‌یـەکی باشـیش وەرگـرم بـەڕێزتان چـۆن بەباشی ئەزانن من ئامادەم بۆت جێبەجێبکەم.

باڵوێزخانەی عێراقیم لەبەیروت ئاگادار کردەوە بەبروسکە ئاگاداری (نـاظم کزار) بکەن ڕەفیق سەرکەوتووە بەیانی‌یەکەی دەگەڕێتەوە.

لەگەڵ (بابا علی) ڕێك کەوتین دوای چەند ڕۆژێك بـەیروت بـەجێ بهێڵێت و چوو لە لەندەن جێنشین بوو.

لەهەمان کاتدا ئێستگەی ئەهواز بەشی عەرەبییەکەی باسی رەفیق پشدەری کردبوو کەچووەتە بەیروت بۆ کوشتنی بابا علی، بەهەرحاڵ خەبەرەکەی بەشێکی ڕاست بوو بۆمن سوودی هەبوو ئەم خەبەرە بڵاو نەکرابایەوە گومان ئەخرایە سەر من، بەڵام من نەبامایە ئەکوژرا، (بابا علی) ئەمەی لەبەرچاو بوو جار جار دیاریی ڕێك وپێکی بۆ ئەناردم.

● جارێکیان شێخ (عوسمان بارزانی) هاتبووە بەغداد دیاری هێنابوو بۆ شەخصی (احمد حسن بکر) ویستم بۆی بەرم ئاگاداری (ابو حرب) م کرد وتی چاك بوو بۆت نەبردووە تەسلیم بەمخزنی ئێرەی بکە با ئەو هەنگوین و پلنگەی لێرە بژێیت (پلنگی تحنیت) ژەهری بۆ ئەنێرم خودا لەناویان بەرێت، ئەمە یەکەم جار بوو بەو لەهجەیە ڕوو بەڕووم گوێم لێ بێت هێرش بکاتە سەریان لەئەنجامدا دوو بەدوو ناو بەناو دەکەوتینە سەروگوێلاکی (احمد حسن بکر) و (صدام تکریتی).

وتم (ابو حرب): وەکو ئێستاکە ئاوا بەم شێوەیە لەگەڵ تۆ بکرامایەوە دەستم دەگرتی ئەم دەهێشت بەو ئیشە هەڵستیت پیلان دابنێن بۆ کوشتنی بارزانی، گەڕامەوە بۆ بەیانی ١٢ی ئازاری ١٩٧٠ بڕیاری خۆتان بەزەقی و ئاشکرا کردن کە ڕۆژگار چۆن چۆنی ئەبێت لەگەڵ پ.د.ك. بەسەرۆکی‌ایەتی بارزانی ببەنە سەر بەبیرم هێنایەوە کەکاریەدەستەکان [ كذب اذا احنانگول عدنا صديق بين الاكراد -احنا عدنا صديق واحد هو البارزاني - روحو كلكم التحقوا بالبارزاني، بارزاني قوه يتقوى-احنا اقوياء وەڵامی دامەوە ئەمە لەکانگای دڵمانەوە بوو.

ئەو گۆڕانکارییەتان هۆی چی بوو ئەو مامۆستایانەتان بەکوشت دا،شکتان خستە ناو جەرگەی دڵی کورد بەگشتی و پ.د.ك. بەسەرۆکی‌ایەتی بارزانی بەتایبەتی (ابو حرب) ووتی: من خۆم ١٠٠٪ بەیانەکەی ئازارم بە گەورەترین دەستکەوت بۆ گشت دانیشتوانی عێراق بەتایبەتی بۆ بەعس و پارتی زانی دوای ئەوە لەبەرژەوەندی پارتی نەبوو و دۆستایەتی لەگەڵ حکومەتی ئێران بەهێزتر بکات وە پەیوەندییە نهێنییەکانی لەگەڵ دەرەوە پێ زیاد کات، لەکاتێکدا بەیانی ١١ی ئازار مەترسییەکی گەورەی بەرپا کرد بۆ حکومەتی ئێران و تورکیا، وە صدام بەتەواوەتی گەیشتە ئەوەی پاش گەزی بکات لەبەیانی ١١ی ئازار ئێمەش بەگشتی لەم خاڵە حەقمان دایە

کەچۆن بارزانی ئەم دەستکەوتەی بۆ خاتری چەند کەسانێکی دەورو پشتی و حکومەتی ئێران و تورکیا وە ... پوچەڵ دەکاتەوە.

وتم: شتێکی باشتان نەکرد کەبەکردەوە کردتان بۆ کوشتنی بارزانی.

ووتی: بەهەر حاڵ کردمان.

وتم: ئەی قادر ئەگەرانییو جەماعەتەکەی چی بەسەر هات.

ووتی: ئەویش وەکو کارەکانی ترمانە ئێستا شەخصی (صدام) و (بکر) هەموو دەزگاکانی حکومەت کەلەژێر فەرمانی ئەوانن بۆ بەرژەوەندی ئەم دوو مرۆڤەو کەسووکاریان کار دەکەین هەموو سامانی عێراق دەخرێتە گیرفانیان پریش نابێت ئەی تێر نابن، ئەوەی کردوومە لەسەر فرمانی (صدام) و (بکر) کردوومە چ بەئاشکرا چ بەنهێنی وە ئێستاکە بیر لەوە ئەکەمەوە چۆن (بکر)و (صدام) دوورخەینەوە رزگارمان بێت لەدەستیان عێراقێکی سەربەخۆو دیموکراتی و مەسەلەی کورد جێبەجێ بکەین بەتەواوەتی بە ئاژاوەنانەوەو شەڕ بەهیچ جۆرێك ناگەینە ئامانج هەتاکو بەم شێوەیەی ئێستا بێن دەوڵەتەکانی دەوروپشتمان لەرێگای ئەمەریکاو غەربەوە رۆژ بەرۆژ لەهەموو رووبەکەوە زیاتر دەست ئەخەنە ناومان سەرکەوتنی ئێمە بەنەمانی (صدام) و(بکر) دەبێت.

ئەم ووشە ترسناکە مەترسی خستە دڵمەوە کەوا منیش یاری بەئاگرەکە ئەکەم، بەلام لەهەمان کات خۆشحاڵ بووم بەوەی کەئەمانە گەیشتوونەتە ئەم باوەرە کەلەپێناوی عێراقێکی سەربەخۆو دیموکراتی و مەسەلەی کورد جێبەجێ بکرێت و واللە من چیم پێ بکرێت ویەمن بسپێرن (انشاء الله) کەمتەرخەمی ناکەم، ئەم کودەتایە سەریگرێت خەونی راپەڕینی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ دێتەوە کایەوە بەکورتی و بەووردی باسی بەشێك لەکودەتاکەی (ناظم کزار) ئەزانم و ئەکەم وەکوو سەرە قەڵەم لەخوارەوە نووسراوە:

١-(ناظم کزار) و (محمد فاضل) و ئەندامەدەری کودەتاکە بوون و پیلانیان بۆ دانابوو.

٢-هیچ کەس لەخۆیان گەورەتر نەبوو کە چاوەدێریان بکات، و جێی شك نیین.

٣–هەتاكو سەعاتی كودەتاكەی تەمموزی ١٩٧٣ هەموو ئیش وكارێكیان بەڕێوە بردووە بەبێ ئەوەی یەك شك پەیدا بكەن، ئیش وكاری دائیرەی بەڕێوەبردووە ئەوەندە ئەعصابی لەسەرخۆ بووە.

٤–چەند كەسانێك كەبە پەنجەی دەست دەژمێردرێن ڕاستەوخۆ لەكودەتاكە بەمەبەستی ئەنجام دانی بەشداریان كردووە ١٠٠٪، وەكو (داود الدره).

خەڵكی دیكەش كەش بەم كودەتایەی زانیوە، یان ئاگاداریان كردووە، بەڵام كەس نازانێت ئەمانە كێن. بەندەش یەكێكم لەوانە.

٥–بەو نیازەی كەپێشەنگایەكی تازەی جهازی ئەلەكترۆنی كارەبایی تەلەفزیۆن بۆ چاودێری پایتەختی بەغدا خەڵكێكی زۆریان لەكاربەدەستانی حكومەت بانگهێشت كرد بۆ دیداری ئەو شتوومەكە كارەباییانە، لەوانە (سعدون غیدان)، و (حماد شهاب)، بێنە سەر تەلەفزیۆن دان بەتاوانەكانی خۆیان دا بنێن دوای نەمانی (بكر)و (صدام).

٦–(احمد حسن بكر) لەكاتی ڕووداودا لەبلغاریا بوو ئاگاداری هیچ شتێك نەبوو گەڕایەوە بۆ بەغدا گەیشتەوە ماڵەوە لەكاتی پشوودان ئەبێت (محمود الندی) بەتەلەفۆن ئاگاداری ئەكەن ئەو كاتە لەماڵی بكر ئەبێت ئەو تەلەفۆنەكە هەڵدەگرێت لەڕێگای جهازی ئوتومبێلی نجده (سیارات النجدة) لە(ناظم كزار)ەوە بانگەوازێك ئاراستەی (احمد حسن بكر) كراوە،ئەنجا دەركەوت كە(ناظم كزار) نیازی ئەوەی بووە كودەتا بكات چەند داواكارییەكی هەیە ئەبێت بۆی جێبەجێ بكەن.

ئەودوو زل هێزە گەورەی كەلەدنیادا دەسەڵاتیان بەسەر هەموو جیهان دا گرتبوو(شرق وغرب) یەكێك لەوانە سەفەرەكەی (احمد حسن بكر)ی دواخست بەهۆی ئەوەی كەفڕۆكەكەی دەست كاری دەوێت و تێك چووە.

(ناظم كزار) گەیشتە ئەو باوەڕە كەیەكێك لەو دەوڵەتە زل هێزە بەم كودەتایەی زانیوە گەڕانەوەی (احمد حسن بكر)ی دوا خست، خۆی و هەموو ئەو خەڵكانەی كەبەپێویستی زانی لەگەڵ خۆی بردیی و لەبەغدا چووە دەرەوە بەرەو سنووری ئێران، لەوانەی لەگەڵی بوون (حماد شهابی) كوشت.

ڕاستی هەموو حساباتیکیان بەپیلانێکی کورت و بەووردی ڕێك وپێك دا ڕشت بوو بۆ سەرکەوتنی ١٠٠٪، (ناظم کـزار) و (محمد فـاضل) دوو بـەدوو ١٥ شەو بەیەکەوە لەخانوویەك بوون بۆ ئەوەی بەهیچ جۆرێك ئاشکرا نـەبێت بەڵام ئایا غەرب (ڕۆژئاوا) چۆن ئەمێڵێت عـێراقێکی بـەم سـنووره سـتراتیژیە خاوەن بەشێکی نەوتی (احتیاط) بەم شێوەیە بەبێت بەبەکەتـە مرۆڤێکی نیشتمان پەروەر باوەڕی بەدیموکراسی و کێشەی کورد بەیەکجاری جێبەجێ بکەن و ببیەن بەڕێگاوە بەسەرپەرشتی (عبدالخالق السامرائی).

لەڕاستیەکەی دا ئەمە خەتـەر ناکـە بـۆ (غـەرب- ڕۆژئـاوا) بەتاییـەتی ئەمریکا. هەروەکو شۆڕشی ١٤ی تەمموز بەپیلانی ئەمریکاو انکلیز و اسرائیل و تورکیـا و ئـێران ودەوڵـەتانی خلیج بـوون بـەهۆی گۆڕانـی چۆنیـەتی ئـــەم شۆڕشـە مەزنـە، وە کوردیشیان تێوە گلانـد وە (عبدالکریـــم قـــاس)م یـــش بەدیکتاتۆریەتیەکەی خۆی و سیاسەتە چەوتەکەی بەشی خۆی بەشدار بـوو، بەتاییەتی دژی کورد.

*دە ڕۆژ پێش کودەتاکە هەموو ئیش وکـارێکی سـەفەرم ئـەنجام دا بـوو، هەروەها ٧ ڕۆژ پێش ڕووداوەکە مام بەتەلەفۆن و بروسکە ئاگاداری کردبووم کەبەپەلـە بگەمـە قـاهرە بـۆ ئیش وکـارێکی زۆر پێویست ڕۆژی ڕوودداوەکـە سەعات ١٠ی سەر لەبەیانی چوومـە باڵوێزخانـەی مصری لەبـەغدا خـۆم پـێ ناساندن، ئەنجا من کەوا میوانداری کراوم لەلایەن (جەلال تاڵەبانی) یەوە وە ڕێزیان لێ گرتم یەك سەر ئیش وکارەکەیان بۆ ئەنجام دام، لەگەڵ (ابو حـرب) ڕێـك کـەوتبووین دوای تـەواوکردنی ئیـش وکارەکـانم سـەعات ١٢ لای بم بەداخەوە بەئیشێکی تاییەتی لەگەڵ ماڵـەوە منداڵێکمـان بـردە لای پزیشـك و گەڕامەوە ماڵەوەو پشوویەکم دا ڕووم کـردە بەڕێوەبـەری گشـتی لـەدوورەوە یەکێکم دیـت پـێی ڕا گـەیاندم کـە (ابـو حـرب) بـەخۆی و ژمارەیـەکی زۆری ئوتومبێـل چووەتـە دەرێ، لەهـەمان کـات بیسـتم (احمـد حسـن بکـــر) گەڕاوەتەوە(دنیام لێ هاتەوەیەك) جـارێ بەتـەواوەتی نـازانم چـی ڕووی داوە هاتمەوە ماڵێ لەبەر خۆمەوە قسەم دەکـرد، ڕوو بکەمـە چ لایـەك (هـەر بیرم دەکردەوە).

سەعات ٩ی شەو( کمال)ی برام تەلەفۆنی لەگەڵ کردم، باسی (ابـو حـرب) و ڕووداوەکەی بۆ کردم کە بەخۆیو بەشێك لەکاریەدەستانی بەڕێوەبەرایـەتی

گشتی کەجیّی متمانەن لەبەغدا چوونەتە دەرێ بەرەو سنوور ڕای کردووە، دنیا خامۆشە، بەڵام هەموو حکومەت لەئامادەباشی دایە پرسیاری کرد ئەی تۆ چی ئەکەیت هەر لەماڵەوە ئەبیت، وتم: دەرچوونم نییە تەندروستیم باش نی‌یە.

لەگەڵ دایکم کەجیّی باوەڕم بوو و لەشتی گرنگ و خەتەرناک پرسم پێ دەکرد دوو بەدوو باسمان لەو کێشانە دەکرد کەخۆم بەشدارم تێیدا (وەکو کودەتاکەی ابو حرب). بڕیارم دا ڕاکەم بەرەو سوریا بڕۆم بەخۆم و ماڵەوە ئەگەر هەتاکو سبەی ئێوارە منداڵەکانم کە کچێک و دوو کوڕن، گەورەکەیان ڕووبار بوو لەدایک بووی ١٩٥٨ نەهاتنەوە ئەوا من گەیشتوومەتە جیّی دیاری کراو چونکی من لێرە بم صەبدا صەد من لەسێدارە دەدرێم کەس ئاگادار مەکە پرسیاریان کرد، بڵێ. -نازانم.

خۆمان پێچایەوە قاسەکەم کردەوە هەموو ئەو شتە نهێنییانەی هەمبوو دایکم لێ ئاگادارکردەوە بەیانییەکەی زوو لەتونی حەمام بیان سووتێنێ (نیو دینارو روبعی کاغەز لەگەڵ ١٠٠ فلسی) مقداری ٤٧٠ دینار دەبوو وتم ئەمە بخەرە گیرفانت وە مقداری ٧٠٠٠ هەزار دینارم پێبوو لەگەڵ نزیکەی ٥٠٠٠ هەزار دۆلار وە ١٠٠٠ پاوەنێك.

سەعات ١٢ی شەو لەبەغداوە دەرچووین بەرەو سنوور لە١٣ بازگە پرسیاریان لێکردین لەکوێوە هاتوون بۆ کوێ دەچن، ئایا دەزانن چی ڕووی داوە ئێوە کێن، هاتووچۆکردن بەئوتومبێل لەناو شاری بەغدا قەدەغەیە، وەڵامم ئێمە کوردین لەسلێمانی یەوە هاتووین کاسبی ماڵی خۆمانین بۆ گەشت وگوزار ئەڕۆینە دەرەوەی وڵات هیچمان نەبیستووە ئیمڕۆ لەسلێمانی یەوە هاتووین، بریتی بووین لەپیاوێك و ژنێك و سێ منداڵ بەجۆرێك بەعەرەبی قسە دەکەم کەبەهیچ جۆرێك وام لەخۆ نەکردبوو کەبزانن من دانیشتووی بەغدادم تەنها پاسپۆرتەکەم پیشان دەدان، پێناسەی خۆم پێ نیشان نەدەدان، تاوەکو گەیشتینە (رتبە) سنوور داخرابوو مقداری ٢٢٠ ئوتومبێلی لێ بوو لەزیادی دا بوو یەك کوردم ناسی نزیك یەك کەوتینەوە لەخۆمەوە چوومە بارەگای بەعس لەگەڵ منداڵەکانم خۆمم پێ ناساندن بەکاربەدەستەکەی ناوی ابراهیم بوو وتم من بەئیشی تایبەتی ئەچمە دەرەوەی وڵات شتێکی وا بکە کە دوو ئوتومبێلی دیکەش لەگەڵمدا بەرەو سوریا بڕۆین

بۆ ئەوەی (مخابراتی سوری) شك نەخەنە سەر من دەست بەجێ کت وپڕ لەئەنجامدا ئاگاداریشم کرد کە(ناظم کزار) لەکودەتاکە سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە، دنیا خامۆشە، هەموو عێراق ئاسایشە، بەتایبەتی بەغداد یارمەتی ـەم بۆ ئەم کارەو کەوتمە ڕێ، دوای دەرچوونم هێشتا لەخاکی عێراق ـەرنەچوو بووین فڕۆکەیەکی هیلۆکۆپتەری سەربازی بەسەرماندا تێپەڕی، مەترسییەکی گەورەم لێ نیشت لەدوایی دا لەنزیك دوو ئوتومبێلی سەربازی هیلۆکۆپتەرەکە نیشتەوە لەتەنیشت ئەوان، منیش بەردەوامم لە ڕۆیشتنداو مەترسیم نەما.

بەسەلامەتی گەیشتمە یەکەم بازگەی حکومەتی سوریا چووینە چایخانەیەك خۆم ودایکی بازیان شایەتمانێکی بەڕەحمەتمان هێنا کەشکور توانیمان ڕزگارمان بێت بەسەلامەتی.

لەشام چووینە ئوتێلێك(          ) سەعات ٥ی ئێوارە تەلەفۆنم لەگەڵ (مام جەلال) کرد بڕوای نەکرد کەمنم ووتی تۆ ڕەفیق نیت، وەڵامم دایەوە خۆم ودایکی بازیان و ڕوویار و بازیان و ڕەوەزم لەگەڵە بەڕاستی زۆر لەمەراقدا بوو وای زانیبوو کەمن نەماوم چونکی دەیزانی لەگەڵ (ناظم کزار) تێکەڵاوییەکی تایبەتیم هەیە لەگەڵی، لەمەندێ شت ئاگادار بوو. خۆشحاڵی خۆی دەربڕی و کەلەگەڵ هێرۆ خانی هاوسەری زۆر ناڕەحەت بوون دەربارەی چارەنووسی من هەروەها پرسیاری کرد ئەی دەربارەی علماو (زەبیحی) چی دەزانیت وتم من شەو ڕام کرد کەس نازانێ لەکوێم و بۆ کوێ چووم تەنها دایکم نەبێت ئەویش لەگەڵ ژنی براکەم (شفیق) دوو بەدوو لەماڵەوەن لەبەغداد ئێستاکە ئەوانیش کەوتوونەتە پشوودان بۆیان ڕوون بۆتەوە کەمن بەسەلامەتی ڕزگارم بووە، ئەو ئەمانەتەی هەتبوو لای من لەگەڵ خۆم هێناومە.

پرسیاری کرد پرۆگرامت چییە، لەوەڵامدا وتم: پێویستمان بەپشوودانێکە مێشکم زۆر ماندووە دوو بەیانی سەعات ١١ دەگەینە قاهیرە لەڕێگەی فڕۆکەیەکی سورییەو تکامان وایە دوو ژوورمان بۆ بگری لەئوتێلێکی نزیك ماڵی خۆتان.

لەکاتی دیاری کراو گەیشتینە فڕۆکەخانەی قاهیرە لەدوورەوە (مام جەلالمان) بەدی کرد، دوای تەواو کردنی ئیش وکارەکانمان هاتینە دەرێ بەیەك گەیشتین.

ووتی من و هێرۆ لەشوقەیەکین جێگام بۆ نەگرتووی ئەچینە مالّیْ ئێمە ماوەی نزیکەی ١٥ ڕۆژ لەماڵی (مام جەلال) بووین ئەوپەڕی خزمەت و هەڵسوکەوتی باش و میوانداریەکی چاکیان کردین. بەبێ ئەوەی دەست بەگیرفانمدا بکەم، بەبێ ئەوەی گرژ بێت، چونکە بازیان و ڕوویارم زۆر ناڕەحەت بوون ڕۆژگارمان بەئاسانی بەسەر دەبرد، چونکە ئەوەندە لە خۆشی دا بووین.

چاوم بەچەند عەرەبێکی عێراقی کەوت کەپەناهەندە بوون لە میسر لەوانە عارف عبدالرزاق وە عقید رشید محسن کەجووتیاری دەکرد،بۆئەوەی منداڵەکانی بەخێو بکات بۆ ئەوەی پارەی پەناهەندەیی وەرنەگرێت لەمیسرییەکان. هەرچەند لەگەڵم کرد کەدیارییەك لەمن وەربگرێت قبووڵی نەکرد تەنها جگەرە نەبێت.

دوای ١٣ ڕۆژ کەلەماڵی (مام جەلال) بووین ئاگاداری کردم کەئیمڕۆ میوانێکی عەرەبی میسریم دێت ناویراو (میوانەکەی) هاتە خزمەتی دوای ماوەی کاتژمێرێك بانگی منی کرد چونکی ئەوان بەتەنها دانیشتبوون پێی ڕاگەیاندم کەحەز دەکەم ئەم زاتە بناسیت ناویراوی (میوانەکەی) بەمنی ناساند کەئەوە عمید فلانە سەرۆکی یاوەری ئەنوەر ساداتە بەوویشی ووت ئەمە کوردێکی عێراقییە میوانمە لەگەڵ خێزانەکەی ماوەی ١٣ ڕۆژە پێکەوەین ناوی (ڕەفیق پشدەری)یە یاوەرەکەی انور سادات لەجێگەی خۆی تەکانێکی دا بەسەر سوورمانەوە سێ جار ووتی لەسەر یەکتری (دە رفیق پشدەری، واتە ئەمەیە رفیق پشدەری) مام ووتی ئەمە (انور سادات) ناردوویەتی کەرفیق پشدەری هاتووە بۆ کوشتنی تۆ.

مام لەگەڵ میسرییەکاندا لەڕۆژی هاتنی (جمال عبدالناصر ) ەوە دۆستایەتییەکی دێرینی پەیدا کردووە لەنێوان کوردو (جمهوریە عرب المتحدە).

جارێك (صالح مهدی عماش) بۆی گێڕامەوە لەچلەی (جمال عبدالناصر) کەنێردراوی سەرۆکی عێراق (رئیس وفد العراقی) بوو لەبەردەمی ئوتێل

هێلتۆنی قاهیرە ڕاوەستابووم کەئۆتومبێلێکم بۆ بێت بۆ شوێنێکی تایبەتی بەو بۆنەیەوە لەوێ کۆدەبینەوە، کەسەرنجم دا (جەلال تاڵەبانی) لەتەنیشتم ڕاوەستاوە دوای سڵاو پێم وت: وەرە لەگەڵ من سواربە. بەڕاستی ئەگەر بەچاوی خۆم ئەم دیاریە بەڕابێرت ئەوەیان بۆ ئۆتومبیلەکەیەوە بێپام ئەمەکرد کۆدیشە بەڕابێرت وەکو بۆ تێی دەگێڕمەوە پێش کەش بەسەرۆکی کۆمار (احمد حسن بکر) م کرد.

ئەویش (جەلال تاڵەبانی) ڕێزی سەرۆکی وەفدیان لێ نابوو لەئوتێل هیلتۆن، ئەویش (جەلال تاڵەبانی) لەژوورێك دابوو لەنێوان ژووری قەزافی و مەلیکی مەغریب هەروەکو من چۆن سەیارەیەکی تایبەتیم بۆ دانرابوو لەئوتێلەکەدا، بەژمارە کەمن دەمگوت (صالح عماشم) هاواری ژمارەکەیان دەکرد، (جەلال تاڵەبانی)یش بەهەمان شێوە، گوایە لەدەفتەری ڕۆژانەی (عبدالناصر) ناوی ٢٠ مرۆڤی نووسیوە کەئەمانە نزیك ترین کەسن (جەلال تاڵەبانی) یەکێکە لەوانە.

گەڕامەوە شام لەگەڵ ماڵەوە چووینە بەیروت و تورکیا و بلغاریا و یوگوسلافیا، ئنجا هاتمەوە بۆ بەیروت کات گەیشتە ئەوەی کەمندڵەکان دەبێت بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی بەردەوام بن لەخوێندن ئەوان گەڕانەوە. منیش لەسەر هەڵوێستی (مام جەلال) ئەو بڕیارەم پەسەند کرد کەئۆتومبیلەکەم بفرۆشم لەگەڵ هەموو پارەکەی کەپێم دەبێت مقداری١٢٠٠٠ هەزار دینار بچمە نەمسا، لەوێ کاسبی بکەم بەم پارە زۆرە جگەرە بفرۆشم.

لەڕۆژی هاتنە دەرەوەم لەعێراق هەتاکو ئەم مێژووە هیچ پەیوەندییەکم نەمابوو بەحکومەتی عێراقەوە لەو خەڵکانەی کەزەقن لەناو پارتی یان لەناو سیاسەتمەدارانی عەرەبی عێراق دوور دەکەوتمەوە لێیان، ئەو نهێنییەی کەهەم بوو لەنێوان خۆم و (ناظم کزار) بەردێکم لەسەر دانا و بەهیچ جۆرێك باسم نەکردووەو کەسیش نازانێت تەنها (ناظم کزار) و خۆم و دایکم.

هەرچەندە لە(مام جەلال)م پرسیار کرد هۆی چی بوو کەبەتەلەفۆن و برووسکە ئاگادارت کردبووم کەبەزووترین کات بگەیتە قاهرە ؟.

وەڵامی دامەوە کەلەڕێگەی (أیاد سعید ثابت) ەوە ئەم زانی کەکودەتا دەبێت وویستم ڕزگارت کەم لەکوشتن (الحمد الله) خۆت خۆتت ڕزگار کرد،من ئاگادارم نەکردووە بەهیچ جۆرێك تاکو ئەم کاتە کەبەشدارم لەگەڵ (ناظم

کزاز) دا لەم کودەتایە لەسەرەوە باسم کردووە کە(مام جەلال) هەتا چ رادەیەك ئاگادارە لەنێوانی دۆستایەتی من (ناظم کزاز) هەروەها کەس نەی دەزانی کەمن رام کردووە کەخەڵك ئەمەیان لێ دەپرسیم من لەوەلامی پرسیارەکان لام دەداو خۆم دوور دەخستەوە.

*رۆژێك (مام جەلال) ووتی با سەرێکی (فواد عارف) بدەین تەلەفۆنی بۆ کرد کەلەگەڵ رەفیق نیازمان وایە سەردانت بکەین خۆشحاڵی خۆی دەربڕی کاتێك چووینە لای دوای دانیشتنی سێ دەقیقە تەلەفۆنی هەڵگرت بەناوبراوی وت فەرموو تەشریفت بێت کەسم لا نییە کە تەلەفۆنەکەی داخست دەمووچاوی گرژ بوو، رووم کردە (مام جەلال) یەکێك لەم دوانەی کەمن و تۆین ئەو برادەرەی کەدێتە لای (فواد عارف) یەکێکمانی بە دڵ نییە ئەویش منم با جێتان پێ لەق نەکەم من دەڕۆم کاتێکی دیکە یان رۆژێ لەرۆژان دێمەوە خزمەتتان، (فواد عارف) ووتی: دانیشە هەتاوەکو قاوەکەت دەخۆیت هەڵسام بڕۆمە دەرێ لایان زەنگی شوقەکەی لێدرا کەدەرگایان کردەوە (عبدالوهاب الاتروشی) بوو من لەرۆیشتندا بووم هەموویانی پشت گوێ خست دەستی منی گرت و دانیشت لەتەنیشتم کەوتە پێکەنین و قسەی خۆش لەگەڵمدا داوای لێکردم یا ئەبێت دەعوەتم بۆ بکەیت یان دەعوەتم قبووڵ بکەیت هەرچی کردی وتم لەگەڵ تۆ دانانیشم (فواد عارف) ووتی من دەعوەتەکە دەکەم منیش قبووڵم نەکرد وتم ئێوە نیشتمان پەروەرن (عبدالوهاب ئەتروشی) قائدێکی پارتییە منیش سیخوورێکی بەعسیم، ئینجا (مام جەلال) کەوتە نێوانمانەوەو رازی بووم بەوەی شەو کەئەچینە گازینۆی لبنان لەوێ یەکتر دەبینین کە (عبدالوهاب ئەتروشی) گەڕایەوە دوو بەدوو لەناو ئوتومبێلەکە دەبین بۆ خۆمان دەکەوینە قسەکردن.

ئەتروشی چەند پرسیارێکی لێ کردم. وەکو گوایە من لەسەرانسەری کوردستان وەکیلم هەیە(مەکتەبی رێکخستن) وە لامان سەیرە کەتۆ لەناو بەعس بەم جۆرە بەچاوێکی مەزن تەماشات دەکەن!

وەلامم دایەوە، ئەمە راست نییە بەعس پێویستی بەوە نییە کەمن لەسەرانسەری کوردستاندا مەکتەبی رێکخستنم هەبێ بۆ دەنگ وباس کۆکردنەوە من خۆم جێی خۆم کردۆتەوە لەناو بەعس دا بەهەموو توانایەك یارمەتی خەڵکی لێقەماو دەدەم و بەهیچ جۆرێك بەشدارنیم دەربارەی گرتن و

لەسێدارەدان  من ئەوە نیم بتوانم نەخشەی بەعس بگۆڕم، دۆستایەتی‌یەکەی من باوەڕە ئەگەر بەقسەم بکەی وات لیٚ دەکەم تۆش بگەیتە پلەی من.

ئێستاکە تۆ پارێزگاری و بوو ئوتومبێل بەدواتەوەیە بۆ پاسەوانیت و کاتیٚ دەچیتە بەغدا ئەتوانیت ١٥ تەنەکە ماست و ١٥ تەنەکە پەنیر لەگەڵ خۆتدا ببەیت لەناو سەرکردەکانی بەعس دا دابەشی بکەی: هەریاڵەی تەنەکەیەك ماست و تەنەکەیەك پەنیریان  بۆ ڕەوانە بکە بەناوی خۆتەوە، لەسەر دیاری‌یەکە دەنووسی (عبدالوهاب ئەتروشی) لە (احمد حسن بکر)ەوە دەست پیٚبکە، ئەوانیش ماوەیەکی دیکە دیاری بۆ تۆ ڕەوانە دەکەن هاتووچۆی خێزانی دەبێت دۆستایەتی بەهێز دەبێت لەپاڵ ئەوەشدا باسی مەسەلەی کوردیان بۆ دەکەیت.

بەڵام دەزانم تۆ دەترسیت ناتوانیت ئەوە بکەیت لەترسی ئێران و خەڵکانی کوردی نیشتمان پەروەر.

بۆ بەیانی‌یەکەی سەعات ٧ی  بەیانی خۆم کرد بەژوورەکەی دا لەئوتێل بەیروت (مارتینس) دابەزیٚ بوو لەوێش باسی بەشێك لەو شتانەم بۆکرد ئەو باروئۆخی منی نەدەزانی.

*دوای ئەوە لەگەڵ (مام جەلال) قسەم کرد: کەماڵەوە ڕۆشتوونەتەوە منیش خۆم کۆدەکەمەوە ئەچمە نەمسا، زۆری پیٚتەچوو کەمالی برام لەبەغداوە هات نووسراوێکی دەست وخەتی پیٚ بوو کەداوام لیٚدەکات بگەڕێمەوە، تۆ هیچت لەسەر نی‌یە سەیرە منداڵەکانت لەگەڵ دایکیان لەبەیروت هاتوونەتەوە جیٚی سەرسوڕمانە تۆ بەتەنها لەبەیروت ماویت چیت پێویستە بڕۆ باڵوێزخانەی عێراقی تاکوفەرمان بدەین بەجیٚبەجیٚکردنی، حەز دەکەین بەیەکەوە لەگەڵ کەمالی برات بگەڕێنەوە ئەوەم پیشانی (مام جەلال) دا دوای لیٚکۆڵینەوەیەکی زۆر وتی:  با (کەمال) بڕواتەوە تۆ لێرە بمێنەوە چەند ڕۆژێك، هەتاکو دڵنیا دەبم، ئینجا بگەڕێوە.

لەدانیشتنەکە لەگەڵ کەمالی برام دوو بەدوو پیٚی وتم کە(عبدالوهاب اتروش)یت دیوە وتم ڕاست نی‌یە تەنها لەگازینۆی لبنان دوور بەدوور چاومان بەیەك کەوت.

دوای چەند ڕۆژێك گەڕامەوە بۆ عێراق یەکسەر هاتم بۆ ماڵەوە چاوم بە(عبدالخالق عبدالعزیز) کەوت کە بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بوو.

*(عبدالخالق عبدالعزيز): دەرچووی دانیشتگای (کلیە)ی شرطة بووە کادرێکی کۆنی بەعسی لەشرطة یەکەم کەسە کەئەفسەر بوویێ - جێی باوەڕی (احمد حسن بکر) بوو و زیرەك و لەسەرخۆ و ئازا و پاك بوو، لەخێزانێکی عەرەبی موصلی ناودارە، خاڵی (حسن توحلە)یە کە (سعید قزاز) خۆی شاردبۆوە و ماڵیان پشکنین، پەیوەندی ئێجگار زۆرە لەگەڵ کورد، دۆستێکی دێرینی من بوو، خۆشم یارمەتیم داوە کاتێك کە(ناظم کزار) حوکمێ دەرکرد، ڕاستی‌یەکەی ئەم دەورێکی گرنگی هەبوو کەلەسێدارە نەدرێم.

* ڕۆژێکیان چووم چاوم بە(صدام تکریتی) کەوت و وتی: ئیمڕۆ هەموو کاتەکەم لەگەڵ تۆ دەبەمە سەر، زۆرم لا سەیرە کوردێکی سنی‌ونەتەوەیی خەڵکی پشدەر لەگەڵ عەرەبێکی صبی دانیشتووی عمارە بەم شێوەیە یەکبگرن، ئەو مرۆڤێکی پیاو کوژ تۆش ئەوەندە خێرخواز، دانیشتنت خۆشە قەناعەتم پێ بکە.

* بەیانی‌یەکەی دەرنەچوو بووم لەماڵەوە (جمیل صبری عبدالله) مفوض بوو لە ئاسایشی گشتی پەنای بۆ هێنام کەنیازی چوونە دەرەوەی هەبوو بۆ دەرەوەی وولات بەمەبەستی تەداوی( چارەسەرکردن) کەتووشی نەخۆشی پێست بوو بوو کاروباری سەفەرەکەی لای (حامد العانی) بوو ئێستاکە ناظم کزار بۆتە بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بەهیچ جۆرێك ڕێگام نادات پێی وتم ئەبێت لەگەڵم بێیت بۆئەوەی بڕیار بدات سەفەر بکەم ئەوەندە پاڕایەوە ناچاری کردم، لەکاتێکدا پێم ووت من لەگەڵت دێم بەڵام من یەك جار ناظم کزارم دیوە کەبەڕێوەبەری پەیوەندی‌یەکانی (مجلس قیادەی ثورة ) بوو زۆر زەحمەتە بتوانم بگەمە لای چونکە دەورو تەسلیمی لەگەڵ دەکەن، پێشی کەوتم بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی واتە (دائرة امن العامة) لای (عقید عبدالواحد) نوری کەیاریدەدەری بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی بوو دانیشتم کەئاگاداری بکەن بەمەبەستی ئەوەی کەکەی کاتی بێت بتوانم چاوم پێی بکەوێت کەچوومە ژوورێ بەگەرمی‌یەوە بەخێرهاتنیان کردم بەتایبەتی (ناظم کزار) منیش پێرۆز باییم لێکرد بەبەمەستی دامەزراندنی لەبەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی، سێ قۆڵی سەریان پێکەوە نابوو کارە

نهێنی‌یەکانیان ئەنجام ئەدا ئەم سێ‌کەسەش بریتی بوون لەمانە (ناظم کزار) بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی، حامد العانی، عبدالخالق عبدالعزیز.

وتم (ابو حرب)، نامەوێت کاتت لێبگرم ئێوە ئێش وکاری گرنگتان لەبەردەستایە پەیوەندیت کردووە بەبەڕێوەبەرایەتی‌یەکەتەوە منیش هاتووم بزاەنێکی دڵسۆزی خۆتەوبیبنم هەبە تووشی نەخۆشی‌یەکی کوشندە بووە ئەیەوێت بڕواتە (المانیا) بەمەبەستی چارەسەرکردنی‌نەخۆشی‌یەکەی ئینجا تکام وایە معامەلەکەی لەبەر دەستایە بڕیاری خۆتی لەسەر بدەیت و بۆی تەواو بکەیت.

ووتی ئەمە ئاسانە دەست بەجێ بڕیاری دا بۆی ئەنجام بدرێت بەڵام منیش داواکاری‌یەکم هەیە وەرە بارێك کەوین ئیش بکەین بەیەکەوە هەروەها بەیەکەوە لەسەر ئەم مێزە کاروباری وڵات بەرین بەڕێکاوە وەنامێلم هیچ گیروگرفتێك بێتە ڕێگات وە چیت دەوێ هەتاکو بۆتی بکەم دەربارەی یارمەتی دانی خەڵك بەشێوەیەکی گونجاو(واسطة) بۆت جێبەجێ بکەم بەپێی توانا و یاسا.

وتم (ابو حرب): زۆر زەحمەتە بتوانین بەیەکەوە کاربکەین لەبەرئەوەی بۆچوونمان جیاوازە و زەحمەتە یەك بگرین هەروەها دۆستایەتی‌یەکەمان لەدوورەوە بێت باشترە، و زەحمەتە تۆش بتوانیت من قبووڵ بکەیت بۆ ئەو کارە، ئایا تۆ ئەدەوێت دەنگ وباست پێ ڕابگەیەنم کەئەمە بەعسیە یان ئەمە شیوعیە، ئەم کارە کاری من نیە بەڵام ئەگەر هاتوو ڕاستیەکانم ووت بەتۆ لەدوایی دا پێستم ناچێتە دەباخانە، ئێستاکە بەگشتی دانیشتوانی بەغدا باسی دامەزراندنی تۆ دەکەن و ئەڵێن( ناظم جزار) ناظم قصاب لەم شوێنە گرنگە دامەزراوە دەبێتە هۆی ئەوەی کەخوێن بەجۆرێك بڕژێت تاکو خوێن ئەکاتە ئەژنۆ، وە هەروەها ١٣ بەڕێوەبەری هەیە هەریەکە لەجێگای خۆی دانیشتووە لەپشت مێزەکەی جووڵەی تێدا نیە هەریەکە لەوانە نازانێت چۆن چۆنی لەگەڵ بەرێزتان بجووڵێتەوە و ڕاپۆرتی خۆی ئاراستە بەجەنابت بکات

(ابو حرب) وتی: من لەمرۆڤی وا دەگەڕێم ئەویش تۆی ڕازیم و دەرگای ژوورەکەم کراوەتەوە لەئاستی تۆدا وەدەبێت هەموو ڕۆژێك کەدانیشتم لەسەر کورسی‌یەکەم یەکەم کەس تۆ بیت بێیتە ژوورەوە و گفتوگۆ بکەین بۆ جێبەجێکردنی هەموو گیروگرفتێکی وڵات.

که ١١ ی ئازار بوو دلوای لێکردم بەناوی پشوودان بچم بۆ قاهیرە مەگەڕێوە هەتاکو وەلامت بۆ ئەنێرم باتۆش گیروگرفتت نەبێت لەگەڵ پارتی ڕۆژێك باوکی ناظم وتی چەند جارێکە دەمەوێت چاووم بە ناظم بکەوێت ناگەمە لای لەگەڵ خۆم بردمە ژووری.

حامد العانی برادەرێکی دلسۆزو بەڕێزە وتی بەگوێرەی یاسا ئاسایشی گشتی بەستراوە بەوەزارەتی ناوخۆو ئێمە ئەزانین کە (ابو حرب) پەیوەندییەکانی یەکسەر بەستراوە بەسید نائبەوە، (ابو حرب) بەهیچ جۆرێك هاتووچۆی سعدون غیدان ناکات حەز دەکەم بچیتە ناو ئەو بابەتەوە (ابو حرب) لەقسەی تۆ دەرناچێت، وام کرد دوای دوو ڕۆژ (ابو حرب) سەردانی سعدون غیدان بکات.

ڕۆژگار هاتوو ڕۆیشت ڕۆژانە لەیەکتر نزیك دەبووینەوە لەکاتێکدا ڕۆژانە یەکترمان دیوە لەگفتوگۆ کردن و لێکۆڵینەوە باسی ناوخۆو دەرەوەی وولات گومانت نەبێت باسی هەموو ڕووداوەکانمان کردووە شك وگومانم هەرگیز نەبووەو بەهیچ جۆرێك هەستم نەکردووە کە(ناظم کزار) بەرامبەر سەرۆکی کۆمار و بەڕێزتان (سید النائب) نیازی شتێکی هەیە ئەگینا بەپەلە خۆم ئەگەیاندە تۆ.

بەڕێز (سید النائب) وا بزانم ئەم حەقەم پێ ئەدەیت بەگەورەیی خۆت ئەمبەخشیت، ناچار بووم ڕام کرد دوای کودەتاکەی (ناظم کزار) گومانم نییە من ئەگیرام چونکە ڕەفیق پشدەری بەم جۆرە نزیك بووە چۆن ئاگاداری ئەمە نییە؟ یەکسەر منیش بڕیاری کوشتنم لەسەر ئەدرا، یان منیشی ئەبرد لەگەڵ خۆی.

*صدام تکریتی ووتی: ڕاستە چاکت کردووە کەڕات کردووە بەلام ئێمە (ناظم کزار) مان کردە بەم پیاوە و (محمد فاضل) ماوەیەکی زۆر دایکم جل ویەرگی بۆ ئەشوشت، بەم شێوەیە جێی باوەڕی من بووە.

تۆ مرۆڤێکی نیشتمان پەروەریت پێوەندیت بەهیچ وولاتێکی دەرەوە نییە، ئینجا سوپاسم کرد، وتم من عێراقیم فرمانە لەسەرم خزمەتی وولاتەکەم بکەم، ئێوەش بەڕاستترین گرووپی سیاسی دادەنێم کەلەخزمەتتان دا بم، بەسەلامەتی هاتمە دەرەوە و سوپاس بۆ یەزدانی مەزن لەم (امتحانە) ڕزگارم بوو.

*ئینجا چاووم بە سەعدون غیدان کەوت: هەموو ئەوگفتوگۆو لێکۆڵینەوەیەکەلەگەڵ (صدام تکریتی) کردبووم جارێکی کەش باسمان کرد بەدووروودرێژی.

*سەعدون غیدان: بۆی باس کردم کەبەچ جۆرێك (ناظم کزار) ئازارو ئەشکەنجەی دام زامداریان کردم پاش لەخۆم کردن کەوا خەریکە بمرم: دەستیان لەسەر هەلگرتم خۆم وا روحم دەردەچێت بەهیچ جۆرێك توانجم تێ نەدەگرتن، نەدەکەوتمە گفتوگۆ و پرسیارەکانیانم وەڵام نەدەدانەوە، ئێستاکە تەندروستیم بەرەو باش تر دەڕوات، دەستم لەکارناکەوێت وورده وورده باش ئەبێت.

پرسیاری کرد چەند وولات چوویت، وتم سوریا، میصر، لبنان، ترکیا، بلغاریا، یوغوسلافیا.

پرسیاریکرد لەتورکیا (عبدالرحمن) عارفت دیت.

وتم: لەاستنبول ڕۆژێکیان لەگەڵ ماڵەوە لەسەر دەریا بووین چاوەڕوانی کەشتی بووین، تاکو بچینە ئەوبەر لەناکاودا لەگەڵ (عبدالرحمن عارف) یەکمان گرت دوای ئەحوال پرسینێکی زۆر، ئینجا یەکە یەکە ئەوانەی لەگەڵمان دا بوون پێم ناساند ئەمە هاوسەرەکەمە ئەمەش کچی گەورەمە ڕووبار، ئەوەش کوڕی گەورەمە بازیان، ئەویش کوڕی پچووکم ڕەومز، بازیان پرسیاری کرد ئەم پیاوەم دیوە، کوڕم ئەمە سەرۆکی کۆماری کۆنە، بابە کۆمار یەعنی چی؟ عبدالرحمن عارف وتی کوڕم منم سەرۆکی کۆماری کۆنم.

*لە کۆڤارێکی عەرەبی لەسەر ڕووداوی تازەی عێراق دەنگ وباسی بڵاوکردبۆوە لەهەمان کات باسی ڕووداوەکەی ١٧ی تەمموزی ١٩٦٨ ئەکات کە چۆن (عبدالرزاق نایف) کودەتاکەی بەسەر عارف دا کرد، ئینجا ئەویشیان دوورخستەوە، و (احماد شهاب) کوژرلو (سەعدون غیدان)یش دەستی پەکی کەوت، عارف ووتی کاتێك لەلەندەن بووم لە(هاید پارك) قەدەمم لێ دەدا مەترسیم لەوە بوو کە ابراهیم داود ئەکوژن یان کوژرلوە، (د.خالد رمایا) پێی وتم خەفەت لەچ ئەخۆییت بیر لەڕابردوو مەکەوە، ئێستا ئیستکە بڵاوی کردەوە کە (ابراهیم داود) کراوەتە وەزیری بەرگری.

سوپاسی کردم کەیارمەتی کەس وکاریم داوە، داوای لێکردم کەئێمەش لەگەڵیان برۆین لەم میوانداریيە بەشدار بین، ئەوەش تەلەفۆن و ناونیشانمە لای من پشوو بدەن ئەگەر شتێکت پێویستە حەز ئەکەم یارمەتیت بدەم.

منیش سوپاسم کرد، زۆر پیاوەتی تۆم بەسەرەوە هەیە ئێمەش میوانداری کراووین لای خزمەکانی دایکی بازیان کەئێستاکە (معاون قائد قوة الجوية التركية)یەو جێگری سەرکردەی هێزی ئاسمانی تورکیایە، باوکی کوردێکی سلێمانی بووە.

سعدون ووتی من پیاوەتی تۆم لەبیرناچێتەوە وە بەهیچ جۆرێك ئێوە جێی شك نین کەهیچ پێوەندێکت هەبوو بێت لەگەڵ کودەتاکەی (ناظم کزار) کەباس کراوییت، بەزەقی ڕەئی خۆم پێتنیشان داوە وە حەقت ئەدەمێ کەڕات کردووە بۆ دەرەوەی وولات ئەگینا دوور نییە تۆش ئازارو ئەشکەنجەیەکی گەورەیان کردبایەی، دەگەیشتە کووشتن.

وتم: ڕاستە من برادەرێکی دێرینی (ناظم کزار) بووم ئەمە ئاشکراو ڕوونە ڕاستیەکەی ئەڵێم من لەزۆر شت ئاگادار بووم، بەلام لەکوشتن ومال وێران کردن بەشدار نەبووم و لە کودەتاکەش تاکو شەو سەعات (١١) نەم زانیوە، بیرم لێکردەوە باشترین شت ئەوەیە ڕا بکەم تاکو دونیا دێتەوە سەرخۆی، ماڵەوەم ناردەوە پێش گەڕانەوەی خۆم کەمنیش ئەگەڕێمەوە برای وەکو ئێوەم هەبێت بەتایبەتی وەکو ئێوەو (ابو مازن) و (ابو عروبه) و (سید نائب) و جنابی سەرۆکی، بۆچی دەربەدەری وولاتان بم چیم کردووە.

*هاتمەوە ماڵەوە بەکەیف وخۆشی (٣٠٠) صمون کەهەریەکەی پڕ لەشفتەو سەوزە بوو، دایکم بردیە شێخ عبدالقادر بەناوی خێری مولودی پێغەمبەر دابەشی کرد.

*بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی (عبدالخالق عبدالعزيز) بەگەرمەوە بەخێرهاتنی کردم وەکو جارانی پێشوو کاتی (ناظم کزار) یارمەتی‌یان دام، پێوەندیم گەلێك لەڕابردوو بەهێزتر بوو لەگەڵ بەعس لەهەموو ڕوویەکەوە

- سعدون غیدان: دەرچووی کۆلێژی عەسکەری، عەرەبێکی شۆفێنی، بیرو پیلانی سیخووڕی بوو، ئازا، داوێن پیس، حزبایەتی نەکردووە، تێر نەدەبوو لەماڵ کۆکردنەوە، ماستاو چی‌یەکی سەیربوو، زۆر جار دەستی بۆساکە دبلوماسی‌یەکەی درێژ دەکرد،ئەی وت کەی (سید نائب) داوای

لکردم ڕازی نەبووە، یەك سەر ئەچمە ماڵەوە هەتاکو ١٦ی تەمموز ١٩٦٨ لەدادگای کۆماری [(امر کتیبەی دبابات) بوو، بەشدار بووە لەکودەتاکەی ١٧ی تموزی ١٩٦٨ لە١٨ی تموزی ١٩٦٨ کرا بە ئەندام لە (مجلسی قیادەی ثورة)، لەڕۆژی سێهەم چووە پاڵ بەعس ووتی لەم ڕۆوە من بەفرمانی (احمد حسن بکر) هەڵدەستم و (صدام) چی بڵێت وەڵامی بەڵێ ئەبێت.

● ڕۆژێك لەساڵەکانی ١٩٦٩ دوو بەدوو لەگەڵ (صدام تکریتی) دانیشتبووین لەپڕا ووتی مرتضی حدیثی و سعدون غیدان دەیانەوێت بێنە ژووری چی ئەڵێیت، وەڵامم دایەوە ئەمە پێوەندی بەبەڕێزتانەوە هەیە بەهاتنیان خۆشحاڵ ئەبم کەهاتنە ژووری (سعدون غیدان) ووتی: من کاتێك لەکەرکوك لەفرقەی ٢ بووم بەپلەی نقیب، رەفیق پشدەریم ناسی، دەستی کرد بەچالاکی و دڵسۆزی من.

● صدام ووتی: دیارە نهێنییەکانیت ئەزانی بۆیە بەم شێوەیە باسی ئەکەی؟

صدام تکریتی ووتی ئەتنێرم بۆ سویسرا کەبچیت چاوت بە جنرال بەختیار بکەوێت و قسەی لەگەڵ بکەیت بۆئەوەی بەیەکجاری بێتە عێراق، یەکسەر (سعدون غیدان) ووتی: کارێکی باشە کە رەفیق ئەم ئیشە زۆر بەئاسانی ئەتوانێت ئەنجام بدات.

وەڵامم دایەوە وتم: نەخێر لەبەر چەند هۆیەك من بۆ ئەم فەرمانە سوودم نابێت، یەکەم فارسی نازانم، زمانی ئینگلیزییەکەم مام ناوەندییە، پلەی عەسکەریم نییە، من لە ئاستی ئەم پیاوە مەزنە نییم، منێکی سیخوڕ چۆن ئەتوانم ڕوویەڕووی ڕاوەستم، بۆئەم کارە گرنگە.

● صدام ووشەکانی منی پەسەند کرد و سوپاسی کردم.

● بەرامبەر بەخۆم هیچ گومانێك و شکێکم نەما کەئەو پەیوەندییەی کەهەمبووە لەگەڵ (ناظم کزار) کەئاگادارم لەکودەتاکە لەخۆم زیاتر کەس نایزانێت، ئەوە بووە هۆی ئەوەی پەرەیەکی تازە لەگەڵ بەعس هەڵدەمەوە، لەئەنجامی ئەوەی کەسەرکردەکانی بەعسم دی بەئاشکرا ڕوون بۆوە بۆم کەئێستاکە گەلێك زیاتر باوەڕ و ڕێزیان هەیە بەمن، لەئەنجامدا هەموو ئەو پارەیەی کەسەرفم کردبوو لەو ماوەیەدا بەزیادەوە پارەکەیان بۆ سەرف کردم.

- ئینجآ کەوتمە جموجۆڵی ئـەوەی کـەدەربارەی ڕووداوەکـەی (نـاظم کزار) دوای دەرچوونی لەبەڕێوەبەرایەتی ئاسایشــی گشـتی ئـەو خەڵکانـەی کەلەبەڕێوەبەرایەتی‌یەکەی ئەو کاریان کردووە، یەکە یەکە بچم بیـان بینـم دوور خرابوونـەوە لـەدەرەوەی بـەغدا بەوەزیفــەی زۆر نــزم دامــەزرابوون لەحلـەو بعقوبـە و کـەرکوك و رومــادی تەنــها بەڕێوەبەرایـــەتی گشــتی (عبدالخالق عبدالعزیز) نەگواسـترابۆوە وە کرابـوو بەبەڕێوەبـەری ئاسایشـی گشتی، ناوبراو جێی باوەڕی (احمد حسن بکر) بوو وە صدام یش ڕێـزی لێ دەگرت.

ناوبراو جێی متمانەی (ناظم کزار) نەبوو وە هەموو کات شـکی لێ دەکـرد نەی دەهێشت شوێنە گرنگەکان ببینێ جـار جـار بـۆم ڕاسـت دەکـردەوە لای (ناظم کزار) لەهــەموو ئـەو لێکۆڵینەوانـەوە بـۆم دەرکـەوت کـەکەس نـەبووە لـەناوەوەی عێراق ئـەم کودەتایـەی (نـاظم کـزار) ئاشـکرا بکـات، ئێسـتاکە گەیشـتمە ئـەو بـاوەڕە کەلەشـوێنێکی دیکـەش دا نووسـیومە کەدەوڵـەتێك لەدەوڵەتـە زل هێزەکـان بـوو بـەهۆی ئـەوەی نەیهێشـت ئـەم کودەتایـە سەرکەوێت ئەویش ڕۆژئاوا (امریکا) بوو.

- سەفەرێکی بەیروتم کرد چاوم بە(مام جەلال) کەوت باسی ئەوەم بۆ کرد کەوا وورده وورده گرژی ڕوو ئەدات بەرەو ئـەوەی کـەبارزانی و بـەعس نەگەنە ڕێکەوتن لەدوای چوار ساڵەکە.

- هـەموو ئـەو خەڵکانـەی کەدەمناسـین لەگەڵیان دادەنیشـتم جــێی باوەڕ بوون هانیان ئەدام کەچاکە لەگەڵ خەڵك بکـەم، بـەلام ڕۆژێ لـەڕۆژان یـەکێك نـەدەهات لەوانــە ڕوویــەڕوو پێـم ڕابگەیـەنێت بۆچـی پـەیوەندی بەشۆڕشەوە ناکەیت، هەتاکەی سیخوڕی دەکەی بـۆ بـەعس؟ هـەموو ئـەو کوردە دڵسۆزانە کەدەمدین دەستیان لەپشتم دەدا ماسـتاویان بـۆ دەکـردم بۆئەوەی سوودم لێ وەربگرن.

- (مام جەلال) پێی‌وتم هەوڵ بدە بەزووترین کـات لەڕێگـەی تایبـەتی خـۆت پـەیوەندی یەکسـەرانە بکـە لەگـەڵ (مـەلا مصطفـی بـارزانی) ئەمـە چووە مێشکم هەرچەندە کەلـەدوای ڕێکەوتنامـەی ١١ی ئـازار بـاڵی م.س. جماعەتی (مام جـەلال) چوونـە پـاڵ پ.د.ك (بـارزانی)منیشـیان وا ئاگـادار کردبوو کە (ملا مصطفی بارزانی) خۆش حـاڵ بـووە بـەوەی کـەمن لـەپاڵ

بەعس دا بمێنمەوە بۆ خزمەتی کورد گەڕامەوە بەغدا چووم خوشکە (ز-ا-ح)م دی، کەدۆستێکی دێرینی خێزانەکەمان بوو، نووسراوێکم ئاراستەی بارزانی کرد کەئامادەم بەسەرو ماڵ گیانی خۆم بەخت بکەم لەپێناوی کوردو کوردستان.

وەلەڕێگەی شەفیقی برام کەلەقەلادزێ دادەنیشێ وەلامم بۆ دەنێرێ، لەوکاتەی کەئەم نامەیەم نووسی لەژیانێکی بەختەوەر بووم چوار ئوتومبێلم هەبوو لەچەند بانقێك لەدەرەوە پارەم هەبوو هەرچی پێی بڵێن مشکیلە نەم دەزانی چییە، بەهۆی دەست ڕۆیشتن و پارە، ڕێزێکی تایبەتیم هەبوو لەناو کورددا بەتایبەتی کوردی بەغدا و نیشتەجێی قەلادزێ و کۆیە (حزب فقیر و میللەت دەوڵەمەندە) لەو کاتەی کەمن ئەو هەموو سەروەت و سامانەم هەیە کەدیتم بەعس لەسلکی دبلۆماسی (حقیبە دبلوماسیە) بۆ کورد هیچیان پێ نییە ئەمە پاڵی پێوە نام کەگیان فیدایی بکەم لەپێناوی کوردستانێکی ئازادو سەربەخۆ.

*مەکتەبی بارزانی بەبروسکە ئاگاداری حەسۆ میرخان دەکەن کەشەفیق مامە صادق بۆ ئیشێکی تایبەتی بێتە ئێرە (مەکتەبی بارزانی) حسۆ میرخان قسە لەگەڵ شەفیقی برام دەکات کەداوات دەکەن بچینە مەکتەبی بارزانی حەسۆ پێی دەڵێت (ڕەفیقی سەگباب)ی برات کەی واز دێنێت، شەفیق لەوەلامی دا دەڵێت تۆش باوکت هەیە، بەمەترسییەکەوە شەفیق ڕوو دەکاتە مەکتەبی بارزانی لەحاجی عومەران، دەگاتە لای مسعود بارزانی، ئینجا ئەحواڵی من دەپرسێت ئەڵێت ڕەفیق پیاوی باشە، شەفیق دەڵێ نایبینم و ئاگام لێنییە، پاکەتێك جگەرەی بەغدای دەداتێ دەڵێت ئەمە تەسلیم بەڕەفیقی براتی بکە، شەفیقی برام هات بۆ بەغداو پاکەتە جگەرەکەی دایە دەستم، دوای هەشتەمین جگەرە کەتووتنم بەتاڵ دەکرد لەناو تۆیەم جگەرەدا نووسراوەکەی مسعود بارزانی بوو خوێندمەوە خستمە سەرچاوم، بەڵێنم دا وەڵلاهی چیم لەتوانادا بێت دریخی ناکەم وە ئامادەم گیانی خۆم و ماڵ و منداڵم لەگەڵ براکانم بەخت کەین بۆ ئەم مەبەستە.

کەوتمە جموجۆڵێك لە۱۰۰۰٪ دۆستایەتیو برایەتیم زیاتر بەهێز بکەم لەگەڵ هەموو کاربەدەستەکانی حکومەتی بەعس بەتایبەتی (الجهزە امنی) واتە ئاسایش - استخبارات- مخابرات.

بەخۆم دا چوومەوە کەلەم دەقیقەیەوە چی بکەم و کارەکانم چییەو چۆن سوودم لێ وەرگیرێت بیر لەسەرمایە نەکەمەوە، ئامادەگیر بم بۆ هەموو کاتێ کەلێم بقەومێ ناوماڵەکەم کەم کردەوەو فرۆشتم لەگەڵ ئەو پارەیەی کەهەمبوو تەسلیم بەدایکم کرد بۆ رۆژی لێقەومان لەگەڵ (شەفیق) و (کەمال)ی برام سێ قۆڵی دانیشتین بۆ کارکردن و خزمەت گوزاری لەم چوارچێوەیەدا دامان رشت کە چۆن بجووڵێینەوە، یەکەم شەفیق تەتەریێت لەنێوان ئێمەومەکتەبی بارزانی، داوام کرد کەجفرەیەکی تایبەتیم بۆ بنێرن لەکاتی پێویست لەشلخی بەمۆوە بەلاسلکی بۆتان رەوانە بکەم بۆ شتی گرنگ، لەژێرەوە دەستم کرد بەوەی ئەو کوردانەی کەلەگەڵ بەعسن لە ١٠٠٪ جێگایان پێ لەق بکەم، خراپەیان بکەم بەئاشکراو بەنهێنی، وە بەئاشکراو بەنهێنی پشتگیری هەموو کوردێکی بەشەرەف بکەم چ روو بکاتە ماڵم یان خۆی ئاگادارم بکات یان ئاگادارم کەن، ئەمە بوو بە پرۆگرامی رۆژانەم، رۆژ بەرۆژ بیرو باوەرو توانام پاڵی پێوە ئەنام کەزیاتر شتێکی وا بکەم جێدەستم دیار بێت هەتاوەکو ئەگەر ماڵ وێران کردن و کوشتن ونان برینی تێدا بێت هەر کەسێك کۆسپ بێت بەرامبەر شۆرش منیش ئەمە هەڵوێستم دەبێت.

- سەفەرم کرد چوومە بەیروت لەئوتێل شێخ هاتمە خوارێ (عبدالرحمن زەبیحی) و حلمی علی شریف لەهەمان ئوتێل دابەزیبوون، ئەو کاتە (مام جەلال) لەبەیروت ئەژیا لەگەرەکی (بەیروت – رومانە) رۆژانە ئەهاتە لایان ئاگاداری (مام جەلال) م کرد کە عبدالرحمن زەبیحی لەمەکتەبی (شؤون الشمال) کە (صدام تکریتی) سەرپەرشتی ئەکات فەرمانی گرتنی دراوەبکەرێتەوە ئەگیرێت وە چاوەروانی شتی خەتەرناکی لێ دەکرێت، (مام جەلال) وەلامی دامەوە ئەگەر من پێی رابگەیەنم لەوانەیە (عبدالرحمن زەبیح)ی وا بزانێت پیلانی منە.

خۆم لەگەڵ (عبدالرحمن زەبیحی) دوو بەدوو قسەم بۆ کرد کە فەرمانی گرتنت لەسەرە لەمەکتەبی (شؤون الشمال) کە(صدام تکریتی) بەرێوەی دەبات بروای هێنا بەقسەکەم وتی پارەم پێویستە وتم چەندت دەوێ ئامادەم وتی مادام لەماڵی (مام جەلال) ئەژیم مقداری ٣٠٠ دینار بەشی یەك ساڵم ئەکات بەیەکجاری ئوتێل شێخی بەجێهێشت رۆیشتە ماڵی (مام جەلال).

● عبدالرحمن زەبیحی: خەڵقی کوردستانی ڕۆژهەڵاتە، سیاسەتمەدارێکی کوردی ناسراو، زیرەك و زانا، ڕۆشنبیر، خوێندەوار، پاك، دڵسۆز بۆ گەلەکەی، چەند لەسەری بنووسی کەمە.

● لەگەڵ (مام جەلال) دوو بەدوو گفتوگۆو لێکۆڵینەوەیەکی دوورو -ژێژمان دەست پێ کرد بۆم ڕوون کردەوە کەگرژی دەستی پێکرد بەعس دەستی کرد بەجموجۆڵ گەڕامەوە بۆ بەغدا.

● پیلانی بەعس دەست بخاتە ناو (مشیخەتی بارزان– عەشیرەتی بارزان) بوو، بۆئەم پیلانەش (عبیداللە بارزانی) کە (قونسل) بوو لەباڵوێزخانەی عێراقی لەجەزائیر دا گەڕاندیانەوە بۆ بەغدا، وە (شێخ عوسمان) شێخ احمد بارزانییان هێنا بۆ بەغدا لەگەڵ عمادی کوڕی و (ئەدهەم) منداڵی بوون،بایەخێکی یەکجار زۆریان دا پێیان، کەئەمانە ئەبنە هۆی ئەوەی کە عەشیرەتی بارزان دوو بەرەکییان تێ بکەوێت و بەشی زۆری عەشیرەتەکە پاڵیان پێوە ئەدەن، ئەمە ئەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤێکی بارزانی ڕووبەڕووی مرۆڤێکی بارزانی دژی یەك ڕاوەستن و یەك بکوژن، بەعس حساباتێکی یەجگار زۆریان لەسەر کردبوو کەئەتوانن ئەو بۆشاییەی کە جماعەتی (مام جەلال) بەجێیان هێشتووە جێیان دیارە بەهاتنی عبیداللە و (شێخ عوسمان) ئەم بۆشاییە پڕ ئەبێتەوە و شۆڕش لاواز دەبێت، لەهەمان کات دا ١٠٠٪ ئاگاداری هەموو جوولانەوەیەکی (شێخ عوسمان) بووم بەجۆرێك پێوەندیم پێوە کرد لەگەڵیك شت لەخۆیزیاتر ئاگادار بووم وەکو پیلانی بەعس کەفرمانی شتێکی دەردەکرد کە(شێخ عوسمان) جێبەجێی بکات، منیش پێش جوولانەوەی (شێخ عوسمان) یەکسەر ئاگاداری مەکتەبی بارزانیم ئەکرد،لەهەموو شتێکی گرنگ و پیلان دانان وە جێبەجێکردنی، (شێخ عوسمان) ئەی ووت پێش جوولانەوەمان بەکارەکە هەستین یەکسەر ئەوەی ئەمانەوێت پێی هەڵستین ئاشکرا دەبێت لای شۆڕش.

وە بەعس کەوتە دوو دڵی کەوا لەناو خۆیان دەستێکی ناپاك هەیە یان ئەوانە بەپیلان هاتوون سەرانسەر، ئەو بیرو باوەڕەی کە(شێخ عوسمان) هەی بوو کەلەپاڵ بەعس گەورەترین دەسەڵات بگرێتە دەست شکستی هێنا.

بەلام (عبيدالله بارزانی) دەورێکی ڕاگەیاندنی هەبوو کە کوڕی گەورەی (مصطفی بارزانی)یە قسەو ووتارو کۆبوونەوەی لەگەڵ ڕۆژنامەکان و پەیام نێرەکان بڵاونەکرایەوە، بەلام سوودبەخشێکی گەورەی نەبوو بەڵکو تەنها بایەخی هەبوو ووردە ووردە ماهیەتی لای (صدام) کەم بۆوە، یەعس لەدووروو نزیکەوە چاودێرییەکی ووردیان دەکرد بەو ناوەی کەژیانی لە خەتەردایە.

● (عبیدالله بارزانی): لەساڵی ۱۹۵۷ دراوسێ بووین لەگەڵ ماڵی (مەلا مصطفی بارزانی) لەگەڕەکی (الاعظمیـة) لەشەقامی ضباط (شارع ضباط)، هاتووچۆی خێزانیمان هەبوو ڕۆژگار دۆستایەتی و برایەتی لەگەڵ ئەم بنەماڵە گەورەو بەڕێزە ڕۆژ بەڕۆژ بەهێزتر دەبوو تاکو ئەم بڵاوکردنەوەیە واتە ساڵی ۱۹۹۹.

عبیدالله بارزانی لەگەڵ من، ئەم زاتە بەڕێزە ڕۆژ بەڕۆژ هاتووچۆمان پەرەی ئەساند بەرەو زیاتر دەڕۆی هەرچەندە بۆچوونەکانمان لێک جیاواز بوو، بەلام برادەرێتیمان هەروەکو خۆی بوو کەدەهاتە ماڵی ئێمە منیش لەوێ نەبوومایە دایکم وەکو کوڕی خۆی سەیری دەکرد،زۆر جار هاتۆتە ماڵی ئێمە نانی خواردووە ڕێشتۆتەوە دەرێ ئەنجا من گەڕاومەتەوە بۆ ماڵەوە.

لەشۆڕش ڕادەکات دێتە موصل پارێزگاری موصل (خالد عبدالحلیم) ئاگاداری صدام دەکاتەوە پێی ڕادەگەیەنێ، عبیدالله جل وبەرگی سەربازی لەبەردەکەن بەفڕۆکە دەیهێننە بەغدا صدام دەڵێت بۆ ئەوەی مەلا مصطفی زویر نەبێت و ئاشکرا نەبێت. ئەوە بوو کرا بەقونسل لەجزائیر بەردەوام یەکترمان بەسەر دەکردەوە بەنامە یاخود بەتەلەفۆن و ناوە ناوە دیاری جوان جوانی بۆ دەناردم (جل وبەرگ و بۆین باخ (رباط)) بەتایبەتی.

جارێکیان دووربینێکی ( ) بۆ ناردبووم ئەمەش قەدەغەیە استخباراتی عەسکەری وەری گرت ئەوانیش تەسلیم بەمنیان کرد بەشی زۆری لەووتووێژەکانی خۆی ئاگاداری دەکردم کەنیازی ئەوەیە شۆڕش نەمێنێت ئەویش بچێتەوە بارزان لەگوندی ڕێزان جێنشین بێت.

من بەدووروو دریژی ئاگاداری (عبیداللە بارزانیم) کرد چەند جاریك هەروەها بەردەوام بووم کەئەمەویّ پیّ رابگەیەنم، وەهەندیّ جار دایکم لیّ مان ئـەدا کەئەویش سەری بکاتە سەر بۆ هەمان مەبەست وە دایکی بازیانیشم لیّ هان ئەدا.

(عبیداللە) تۆ یاری بەئاگر دەکەیت دوا پۆژت ئەمانە جیّی باوەڕ نیـت لای بەعس هەموو هەڵسان و دانیشتنێکت وە لایانە کە چی دەکەیت و بـۆ کـویّ دەچیت تەلەفۆنت لەژێر کۆنترۆڵ دایە ماڵەوەت لەژێر کۆنترۆڵ دایە ئەوانەی کەپارێزگاریت دەکەن بـەناوی پاسـەوان ئەمانـە کارمـەندن لـە(مخـابرات) و (اسـتخبارات) و (ئاسـایش) واتـە هەرسـیّ لاکـە چـاودێریت دەکـەن وە خەڵکانێك لەگەڵدا هاوڕێن لەگەڵیانیت بۆ پشوودان ئەچنە جیّی ڕابـواردن و کات بەسەر بردن لەمانە بەشێکیان ئەم فرمانەیان پیّ سپێراوە کەچاودێری تۆ بکەن هاتووچۆی باڵوێزخانەیەك دەکەیت ئەمە زۆر زۆر خەتەرناکە ڕۆژێك دێت دەست بەجیّ لەناوت دەبەن، دڵت بـەو پلەیـە خـۆش نـەبێت کەئێستا پێت دەڵێن وەزیری وولات بۆ ئاگادارێت جیّی متمانە نیت لای (صدام).

لەسـاڵی ١٩٨٥ لـەڕاژان کـاتێك لـەهاتووچۆکردندا بـووم لـەنێوان پـارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان ڕۆژێك مسعود بارزانی و ئیدریس بارزانی سیّقۆڵی پرسیاریان لێکردم دەربـارەی عبیـداللە بـارزانی کەبۆچی ڕزگارت نەکرد، چونکە تۆ یەکێك بووی لەهەرە نزیکەکانی، وەڵامم دانەوە وتم دوای دوو شت کـەوتبوو پـارەو،(........) باوەڕیـان پـیّ هێنـاَم بابەتەکەمان داخست.

● کۆمەڵێك لەکوردەکانی بـەغدا کەناسـراوبوون بـەئاگاداری حکومـەت چوونە لای بارزانی بەمەبەستی ئەوەی ببنە هۆی ناوبژی لـەنێوان بـەعس و شۆڕش. من بەپیّی زانیاریم ئاگادارم کردن کەئەوانەی دوو لایەنن (مـزدوج) ن و بەشێکیان جیّی بـاوەڕن لەدڵـەوە هـاتوون بەگشتی کـوردی بـەغدا نایەوێت شەڕ ڕوو بداتەوە، ئەمـە شـتێکی باشـە، چونکـە خـۆی لـەخۆی دا شەڕ ماڵ وێرانی‌یە لەلایەکی دیکەشەوە هـەندێك جیّی پیّ لـەق دەبـیّ وە بەشێکیان بەئاشکرا سەر بەشۆڕشن وە بەنهێنی لەژێریشەوە لەگەڵ بەعسن ئەمانە چاوەڕوانی ئـەوە دەکـەن لافـی کوردایـەتی لیّ بـدەن ببنـە نوێنـەری کورد واتە شۆڕش.

هەرچەندە بەتێکڕایی کوردی بەغدا بەزۆری پاکن، بەڵام ئاسان نی یە لەژێر سێبەری بەعس دا بژیت (بەغداد) بەئاشکراش لافی نیشتمان پەروەری و کوردایەتی لێ بدەیت وە بەناوی شۆڕشەوە قسەو ووتار بڵاوبکەیتەوە.
چاوم کەوت بە(حبیب محمد کریم فەیلی) سکرتێری (پارتی دیموکراتی کوردستان) لەماڵی(......) نووسراوێکم ئاراستەی مەکتەبی بارزانی کرد دەربارەی بارودۆخی ئەو ڕۆژە هاتووچۆو گفتوگۆ هەبوو لەنێوان بارزانی و حکومەتی بەعس گرژییەکە لەزیادی دا بوو لەئەنجام دا نەگەیشتنە هیچ مەرجێك بۆ جێبەجێ کردنی گیروگرفتەکان وەپیلانی بەعس ئەوەبوو کەشەڕ دەست پێبکاتەوە.

- شەڕ دەستی پێکردەوە:

بەعس هەرچی لەتوانای دا بوو بەکاری هێنا بۆ ئازارو ئەشکەنجەدان و کوشتن و ماڵ وێران کردن و سوتاندنی دێهات و خەڵە بۆئەوەی بەدەستێکی پڕ لاو کوشندە دەست بەسەر کوردستان دا بگرێت هەرچییەك لەتوانای دا بوو بەکاری هێنا.
بۆئەوەی بەئیش وکارەکانی خۆم هەستم دوانەکەوم، یەکەم شەفیقی برام بوو بەتەتەر لەنێوان خۆم و مەکتەبی بارزانی وە چەند جار بۆئەوەی دەنگ وباسەکانم دوانەکەوێت کاتێك کە(شەفیق) دوا دەکەوت دایکم تێوە دەگلاند لەرێگەی ئەو نامەکانی منی ئەبردە (کۆیسنجق) کەدیتم هاتووچۆکە ئاسان نی یە و من ناوم بەسیخوری بڵاوبۆتەوە لەهەمان کات شەفیق برامە هاتوچۆکردنی جێی متمانەیە چ لای میری و چ لای بەشێك لەسەرکردەکانی شۆڕش، ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی شەفیق مان دوور خستەوە لەتەتەری سێ مرۆڤی دیکە کەیەکێکیان ماوە ئەژی دڵسۆزو نیشتمان پەروەر و برایەکی خۆشەویست بوون هەستان بەم کارە بەبێ هیچ جۆرە یارمەتی یەك.
وەیەکێکیان کاك امین بەنەخۆشی شێر پەنجە لەساڵی ١٩٧٧ گیانی سپارد بەگەل ونیشتمانەکەی، ڕەنگە ئەگەر شەهیدانەی بۆ بکەم گاڵتەم پێبکەن.بەدلخەوە ئێستا توانای ئابووریم نی یە کەبتوانم سەر لەمنداڵەکانی بدەم و برێك پارەیان پێش کەش بکەم یان شەهیدانەیان بۆ ببڕنەوە.
بۆ ئەو مەرجەو جێبەجێکردنی دێیەکی سێماڵی لەسەر ڕوویاری (سیروان) بوو بەبارەگای من بۆ نامە نووسین لەبەغداوە کە ئەهاتم دوو ڕۆژ دەمامەوە

لەوێ نامەکانم دەنووسی هەرچەندە ئوتومبێلەکەی من هیچ بازگەیەك بۆی نەبوو داوای پشکنینی بکات هەروەها خۆشم لەهاتووچۆکردن دا کەس بۆی نەبوو داوای پێناسەم لێ بکات.

لەرێگەی (حمەی ولی حمەی کرم) لەبنکەی پێشمەرگایەتی بەمژوە بەلاسلکی ئاگاداری مەکتەبی بارزانیم کرد کەلەم رۆژانە بەعس فڕۆکەکانی مێکی رووسی بەچەکی ناپالم بۆردوومانی شارۆچکەی (قەلادزێ) دەکات، [نێردراو] بەیروت - مارتینس) ] رابەری لاسلکییەکە لە (حمە ولی) ئەپرسێ کەیەکێکە لەناویراوەکانی ئەو ناوچەیە دەڵێ ئەمە یەکەم جارە جفرەی وام دیبێت و بیستبێتم پێم بڵێ ئەمەت لەکوێ بوو، وەلامی ئەداتەوە دەڵێت تاجرێکی کوردی فەیلی لەبەغدا نایناسم ئەم کاغەزەی دامێ تکای لێ کردم کەلەرێگەی بارەگایەکی پێشمەرگەوە رەوانەی بکەم و خۆشم لێرە پێشمەرگە بووم لەساڵی ١٩٦١ حەزم کرد سەردانێکتان بکەم.

● جارێکیان شەفیقی برام لای علی (شعبان) سێ رۆژ بەند دەکرێت بەبۆنەی ئەوەی کە برای (رەفیق) پشدەری یەخۆی پێ نیشان نادا بەوەی کەتەتەرە لەنێوان مەکتەبی بارزانی و (رەفیق پشدەری).

● جارێکیان دایکم نامەکەی بردبوو بیگەیەنێتە (شەفیق)ی برام لەکۆیسنجق لەبازگەی نێوان کەرکوك و تەق تەق ژنێکی شەروکی دایکم دەپشکنێ، لەپڕدا دایکم وا دەکات پارەی لێ بکەوێتە خوارێ مقداری ٥٠ دینار، ژنەکە لەخۆشی پارەکە واز لەدایکم دەهێنێ.

● یەکێك لەو برا دڵسۆزو نیشتمان پەروەرانە کەلەژیاندایە شایانی باس کردنە لەهەموو روویەکەوە هەرچەندە خوێندەواری نەبوو، بەلام کەمی وا هەیە لەدونیادا بەم جۆرە بتوانێت لەسەر سنگی کتێبێکی ٥٠٠ لاپەڕەیی لەبەربکات. من زۆر خۆم بەقەرزاری ئەو دوو برایە دەزانم کەهیچ جۆرە دەسەڵاتێکم نییە لەخزمەتیاندا بم نەبەماڵ ونەبەکردەوە. لەهەمان کات دا ئەوانەی کەدەم نارد بۆ مەکتەبی بارزانی دەبێت ئەو خاڵانە بخەمە بەرچاو کەچەند بایەخ و گرنگییان پێ داوە یەکسەر حەمەی وەلی کەیشتووە لەشوێنی تایبەتی دایان ناوە بەخێر هاتن و رێزیان لێگرتووە نامەکەیان لێ وەرگرتووە و بەزووترین کات وەلامیان داوەتەوە وە هەندێ جار دوای چەند

دەقیقەیەك (مسعود بارزانی) چاوی پێ کەوتوون ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کەقیادەی شۆڕش شتی گرنگی پشت گوێ نەخستووە.

● لەساڵی ١٩٧٥ برووسکەیەکم لە (عبدالرحمن زەبیحی) یەوە بۆ هات کەلەبەیروت بوو، ڕوونی کردبۆوە دەڵێت لەفلان ڕۆژ دەگەڕێمەوە بۆ بەغداد، لەکاتی دیاری کراو لەفرۆکەخانەی بەغداد چاوەڕوانم کە بێیت بەپیرمەوە منیش لەڕۆژی دیاری کراودا چوومە فرۆکەخانەی بەغداد، دیتم خەڵکانێکی کەژمارەیان دەگەیشتە ٥٠ کەس زیاتریش هاتبوون بەپیریەوە کاتێك لەفرۆکەکە دابەزی من بۆم هەبوو بچمە ژووری ترانزێت بەپیریەوە چووم بەخێرهاتنەوەم لێ کرد، پاسەپۆرتەکەم لێ وەرگرت تەسلیم بەیەکێك لەو ئەفسەرانەی کەسەر بەبەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی بوون دامێ و بۆ جێبەجێ کردنی (لەژوورێك سێ کەسی لێیە بەرگی مەدەنیان لەبەرە یەکێکیان سەر بە استخباراتە وە دووەمیان سەر بە مخابراتە) سێهەمیان سەر بەئاسایشە، ئەمانە لێپرسراوی فرۆکەخانەکەن لەهەموو ڕوویەکەوە بەتایبەتی بۆ ئیش وکاری نهێنی و بۆ ئەو خەڵکانەی کەئەیان پشکنن و بەپەلە ئیش وکاریان بۆ جێبەجێ بکەن، گرتن و بەردان لەهاتنە ژوورەوەو لەچوونە دەرەوە ئەوان بەرپرسیارن.

ماوەی سەعاتێکی پێ چوو ئینجا پاسپۆرتەکەی (عبدالرحمن زەبیحیان) داینەوە.

من هەستم بەشتێ کرد، پرسیارم کرد لەو ئەفسەرەی کەپاسپۆرتەکەم دابووێ (هل هناك مشكلە ) واتە هۆیەك هەیە؟ وەلامی دامەوە نەخێر ئاساییە، بەلام ناوەکەی نزیك بوو لەناوێکی دیکە کەشتی لەسەر بوو.

لەگەڵ (عبدالرحمن زەبیحی) چووینە ناو میوانە ئازیزەکانی کە بەشی زۆریان پارتی کۆن بوون دوایی بوونە باڵی مەکتەبی سیاسی جماعەتی (مام جەلال تاڵەبانی).

دوای دانیشتنێکی یەك کاتژمێری لەکازینۆی فرۆکەخانەکە، ئینجا بڵاوەمان لێکردو (عبدالرحمن زەبیحیم) گەیاندەوە ماڵەوە لەشوقەیەك بوو لەنهۆمی دووەم لەگەڕەکی (تل محمد).

● بەیانییەکەی چوومە لای، پارێزەر (عبدالله کانی مارانی) لابوو، دەست بەجێ بە(عبدالله)م ووت: بەڵکو ڕێگەمان پێ بدەیت من و (عبدالرحمن

زەبیحی) پێکەوە هەندێك نهێنیمان هەیە باسی بکەین ئەویش وەلامی دامەوە وتی: من ناچمە دەرێ، ئێوە بڕۆنە دەرێ قسەی خۆتان بکەن. چووینە دەرێ و ڕووم کردە (عبدالرحمن زەبیحی) و دەستم خستە سەرشانی و پێم ڕاگەیاند ئ بۆچی هاتیتەوە؟ من لەبەیروت ئاگادارم نەکردی کەفەرمانی گرتنت بەسەرە؟ ئێستێ هۆی نەگرتنمان ئەوەبوو کەتێت پەسپۆرتەکەی تۆم داوە ئەفسەرەکە بۆ ئەنجامدانی کەسەرنج ئەدا تۆ فەرمانی گرتنت لەسەرە ئەویش بەتەلەفۆن ئاگاداری (مدیر خفر -امن العامة) بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی خەفەرەکان ئەویش لەڕێگەی خۆیەوە ئاگاداری بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی (عبدالخالق عبدالعزیز) دەکات کەفەرمانت لەسەر چییە؟ ئەڵێت با (ابو بازیان) (ڕەفیق پشدەری) زویر نەبێت ئەم کارە ئەنجام مەدەن هەتاکو ئاگاداری (ڕەفیق پشدەری) نەکەن، ئینجا وا هاتووم چی ئەڵێیت بگیرێت بەردانت نییە، من پێوەندیم بەسەرەوە نییە، بەلام ئامادەم بەیەکەوە ڕوویکەینە ناوچەی کەلار دوای بوو بەعاتی ترکەوتەکەینە ناوچەی (پ.م) وە (کەمالی) برام چاوەڕوانی ئەمە ئەکات ئایا چ پەسەند ئەکەی؟ (عبدالرحمن زەبیحی) ووتی: من باوەڕم بەم شۆڕشە نییە ئێران دەستیبەسەردا گرتووە دوا ڕۆژی سەرنەکەوتووە لەبەرئەوە ئەچم خۆم تەسلیم بەحکومەت ئەکەم بەهیچ جۆرێك ڕا ناکەم وناچمە پاڵ شۆڕشێك دوا ڕۆژەکەی ئەزانم چی بەسەر دێت چونکە ئێران بەتەواوەتی زاڵە بەسەر شۆڕشەکەدا.

هاتینە ژوورێ بە(عبدالله کانی مارانی) وت ٢٥ دینارم بدەیە، وتم من ٣٠٠ دینارم دایتێ ئایا ناتوانم ٢٥ دیناریشت بدەمێ، ئینجا خۆی کۆکردەوەو شتومەکی بەندیخانەی چ پێویستە هەڵمان گرت بەیەکەوە چووینە ئاسایشی گشتی لای مدیری شعبەی ٣ سێ(عبدالقادر الراوی) ماوەیەك دانیشتین پرسیاری کرد ئەم برادەرە ناناسم، کەوەلامم دایەوە ئەمە (عبدالرحمن زەبیحی)یە بەپێی خۆی هاتووە هیچ گومانێکی لەخۆی نییە تەسلیم دەبێت. (عبدالقادر الراوی) ووتی فەرمانی گرتنی لە(مەکتەبی شؤون الشمال)ەوە دەرچووە وەرن بابچینە بەندیخانە.

● دەستەیەکی حزبی لەبەغدا گیران لەمانە (لیلی قاسم)یان لەگەڵدا بوو. یەکێك لەناو خۆیان (مزدوج) بوو واتە دوو لایەنە بوو ئەو بوو بەهۆی ئەوەی ئەوانە کەشف ببن، لێکۆڵینەوەیەکی زۆریان لەگەڵدا کردن لەئەنجام

دا یەکێك دەچێتە ناویان بەناوی وەزیری نـاوخۆ گفتوگۆیـان لەگەڵدا دەکات پێیـان ڕادەگەیـەنێ دان بـەوەدا بنێـن کەئێمـە ئـەو کارانـەمان کـردووە ئێـوە بەردەدرێن.

بەداخـــەوە زۆر هـــەوڵم دا شـــتێکیان بـــۆ بکـــەم ســـەرنەکەوتم، لـــەیلا و هاوڕێکانیان بڕیاری لەسێدارەدانیان بەسەردا سەپاندن و جێبەجێیان کرد.

سـەعات چواری ئێـوارە لەهـەمان ڕۆژ، شـەوکەت بـەگی جـاف تەلـەفۆنی لەگەڵ کردم کەبچم سەردانی بکەم لەماڵەوە بەپەلـە، کەچوومـە ژوورێ لایـان ژمارەی زیاتر لە ٢٠ بەگزادەکانی جاف دانیشتبوون بەهۆی ئەوەی کە (صلاح جاف) یش لەسێدارە دراوە، وەختی خۆی لەگەڵ چەند بەگزادەیـەك چووینـە لای بەڕێوەبـەری ئاسایشـی گشـتی (عبدالخـــالق عبدالعزیـــز) ئـەویش پێـش نیازێکی پێشکەش بـە(مجلسـی قیـادەی ثورة) کـرد کـەبڕیاری سـێدارەدانی جێبەجێ نەکرێت و گفتیان دابوو کەنـەکرێت، یـەکێك لەوانـە وەزیـری نـاوخۆ بوو.

پێم ڕاگەیاندن بەبرادەرانی جاف چیتان دەوێ! لەمن؟ وتیان تەرمەکـە، چونکە ئەو ڕۆژە گرژ بوو، واتــە شـەڕی نێوان شـۆڕش و بـەعس لەوپـەڕی دا بوو، لاشەی کـوژراو و زامـداری سـوپا بـە ژمارەیـەکی زۆر دەهاتـەوە مرۆڤـی کورد لەخۆیەوە دەترسا بەتایبەتی لەجێیەکی وەکو بـە(غداد) و (موصـل) و (کەرکوك).

● تەلـەفۆنم لەگـەڵ وەزیـری نـاوخۆ (سـعدون غیـدان) کـرد، مـردوو کەدەمرێت شەیتان دەستی لێ هەڵدەگرێت ئەمانە بڕیاری سێدارەیان لەسـەر جێبەجێ کرا ژمارەیـان ١٧ کەسن، یـەکێکیان لەوانـە (لیلـی قاسـم)ە دونیـا هاوینـە گەرمـە بـارودۆخ نارێکـە بـەڕێزتان ئەگـەر فـەرمان بـدەن مـن دەچـم لەمەیت خانە تەرمەکانیان وەردەگرمەوە، هەر ئەمشەویش وا دەکەم بیـانێژن کەبەخامۆشی بچێتە سەر، قسەکەی منی پەسەند کرد،ئینجا تەلەفۆنم لەگـەڵ بەڕێوەبـەری ئاسایشـی گشـتی (عبدالخالق عبدالعزیز) کـرد بـۆم بـاس کـرد کەلەگەڵ (سعدون غیـدان) ئـەم گفتوگۆیانـەم کـرد، ئـەویش پەسـەندی کـرد، داوام لێ کرد کەئاگاداری ئاسایشی وەزیرییە بکەیت کەنزیکمان نەبنەوە، مـن خۆم لەوێم کارەکـان جێبـەجێ دەکـەم، بـەبێ دەنگـی و هیـچ ڕووداوێك ڕوو بدات.

بەبرادەرانی بەگزادەی جافم وت ژمارەیەکی کەم بەدوو ئوتومبێل ئەچین با قەرەباڵغی دروست نەکەین کاتێك گەیشتینە بەر مەیت خانە (طب العدلي) پیاوێکی بەتەمەن کورتە باڵا عەینەك لەچاو ئەویش هات ڕاوەستا، لەنزیك ئێمە سەرنجمان دایە وەك ژنی سپی‌پۆشی بەتەمەنیەوە پێوە کرد ە لای نزیك بووەوە بەزمانی عەرەبی پرسیارم لێکرد هێی چییە لێرە وەستاویت:

ووتی کارم هەیە، وتم کارت چی‌یە وەڵامی دامەوە بەدەنگێکی نزم لەسەرخۆو لەوانەی ئیمڕۆ لەسێدارەیان دان منیش یەکێکم لەگەڵیان جێبەجێ کرا ئەویش (لیلی قاسم)ە من باوکی ئەوم.

وتم تۆ باوکی هەموومانیت شانازیت پێوە دەکەین کەئەمە یەکەم جارە لەمێژووی عێراق لەسەر سیاسەت لەسێدارە بدرێت ئەویش کچێکی کوردە بەناوی لیلی قاسم کەبەڕێزتان باوکین.

بەڕێز چیت دەوێت تاکو بۆت جێبەجێ بکەم وە دەستم بەگیرفانم دا کرد مقداری ٧٠ دینارم پێ بوو تکام لێکرد کەخۆشحاڵ ئەبم ئەو دیاری‌یە پچووکە لەمن وەربگرێت.

وەڵامی دامەوە وتی: من خاوەن گەورەترین سامانم لەکوردستان من باوکی لیلی قاسمم تەنها ئەوەم دەوێت تەرمەکەی وەرگرمەوە، منیش خۆم بۆ نەگیرلو گریام.

وتی: لیلی ڕازی نییە کەس بۆی بگرێ، ئیمڕۆ لای بووین سێ جار خۆی گۆڕی هیچی نەخوارد نەبادە لەکاتی سێدارەدانی بڕشێتەوە، یا دوژمن بڵێت کچە کوردەکە ترساوە.. هەموو کات دانیشتنمان لەگەڵی دا ئەکرد هەر پێ دەکەنی یەك دوای یەك نوکتەی بۆ دەگێڕاینەوە وە گفتمان داوەتێ کەئێمەش ئەم شەو هیچمان نەگرین یەك لەدوای یەك نوکتەی بۆ بگێڕینەوە.

ئوتومبێلێکی فریاکەوتن (سیارە الاسعاف) هات لەبەر تەرمەکان تایەکانی لەئەرزدا نیشتبوو چووە ژوورێ تەرمی ١٧ کوردی تێدا لەسەر یەك، وەك کەلاکی حەیوانی گۆشتی سەربڕاو کەلە ئەورووپاوە دێت ئەخرێتە ناو گوێنی سپی بەم شێوەیە یەك لەسەر یەك ڕیزیان کردبوو بەهەمان شێوەش تەرمەکانیان لەسەر یەك دانرابوو لەسەرو هەموویانەوە تەرمی لیلی قاسم بوو کەناوی چووە ناو شەهیدانی کورد.

سەیارەیەکی پۆلیسی نەجدە لەدواوەی ئەڕۆیشت کەئێمەی بینیت لەترسان هاواری کرد کەدوور بکەوینەوە لێی چوومە پێشی پێم ووت بەفرمانی وەزیری ناوخۆ خاوەن تەرمەکان هاتوون وەریان بگرنەوە، ترسی پێ ناوێت، باوکی لیلی تەرمەکەی وەرگرتەوە.

## تێبینی:

لەمەکتەبی بارزانی پرسیارم زۆر لێ کرا کە و ئاشکرای کەم و تیشک بخەمە سەر ئەو مرۆڤە تاوانبارەی کە ئەو نهێنییەی ئاشکرا کرد، بووە بەهۆی ئەوەی لیلی قاسم و هاوڕێکانی لەسێدارە بدرێن. بەڵێ ئێستاکە تیشک چۆتە سەر (منذر نقشبندی) کەئێستاکە بەئاشکرا بەردەوامە لەتیرۆرکردن - لەبەغدا ئەژیت.

- لەگەڵ مەکتەبی بارزانی ڕێکەوتین بەمەبەستی ئەوەی کەکار بکەین بەشێوازێکی پوخت و نوێ بێجگەلە کاری گۆڕینەوەی نامە، کاربکەین لەپێناو بەرژەوەندی شۆڕش ومیللەت، واتە هەڵسین بەکارێك کەبچینە ناو قووڵایی سەرکردەکانی بەعس، بۆئەوەی سەرنجیان ڕابکێشین بەرامبەر بەماهیەتی شۆڕش.

دوو کەس کەلەسێبەری شۆڕش دا بوون (علی بەگی جاف) و (بەکری مام ڕەزا) وە هەروەها ئەو برادەرە دڵسۆزەمان کەبەردەوام هاتوچۆی دەکرد(کاکە حمە وەلی) وام خستە بەرچاوی بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی و وەزیری ناوخۆ کە دەنگوباسی ڕاستەوخۆ بەدەستمان دەگات دەربارەی هێزی پێشمەرگە ژمارەیان، بارودۆخی ئابوورییان، سنووری ئێران سەرلەنوێ کراوەتەوە بۆ بەرژەوەندی شۆڕش وە هەندێك زانیاری ڕاستەقینەو بەڵگەدار لەفڵان ڕۆژ ژمارەیان وە جۆری چەك گەیشتە ناو شۆڕش واتە ئەم زانیارییانە لەمەکتەبی بارزانییەوە دەنێران، بەڵام لەڕێگەی علی بەگی جافەوە و بەکر پێشکەش بەوەزارەتی ناوخۆم دەکرد کەئەم دووانە نوێنەرن چەند جارێك ئەو برادەرە کاك (حمە وەلی)م لەگەڵ خۆم بردە لای وەزیری ناوخۆ کەئەمە مقداری پارەیەك جگەرەی دیوپۆنتی کڕیوە لەفرۆشگای شۆڕش بەم نیازە هاتوچۆی حاجی عومەران دەکات، وەزیری

ناوخۆ زانیارییەکەی ئــەوەندە لا گرنگ بـوو بەکاسێت تۆمـاری کـرد منیـش دەمگێڕیە سەر زمانی عەرەبی، ڕێك وپێکم دەخست، ئەو زانیارییـە ڕاسـتانە کـاتی خـۆی شـتێکی زۆر گرنـگ بــوو کــەقادەکانی بــەعس بگەنــە ئــەوەی کەشۆڕش زۆر بەهێزە وە پەیوەندییەکانی دەرەوەی بولاتی پێشانە پتەوتر دەبێ.

ئـەو زانیاریـە درۆیانـەی کـەپێیان دەگـات، ژمارەیـان کەمـە، بـاروبۆخی ئابووریـیـان خراپـە، لـەناوخۆیاندا ناکۆکیـان هەیــە، بۆیـان ڕوون بـۆوە کـە هـەمووی درۆیـە، شـۆڕش بــەهێزە بـارزانی سەرپەرشـتی دەکـات تــەنگ و چەڵەمەیان نییە.

لەلایـەکی کەشـەوە، بەشـێوەیەك کوشــتارو زامــدار زۆر بــوو، کەڕۆژانــە لـەزیادی دابــوو هەرچــەندە اسـتخباراتی عەسـکەری دەی ویسـت بەشــەو تەرمەکان دابەش بکات تەرمێکی یەجگار زۆر دەگاتە بەغداد و لەزیادی دایە.

(ئیستخبارات) هەر چی کـرد بۆیان نەشاردرایەوە ئـەوەیش بـوو بـەهۆی ئەوەی کە پاڵەپەستۆ هەر گوشار زیاتر بکاتە سەر صدام.

زروفـی ئـابووری بـەرەو خراپـی ئەڕۆیشـت، جەنەراڵــە عەسـکەرییەکان بەڵێنیان دابوو بەصدام ڕاستیان نەکرد، درۆیەکانیان ئاشکراو بوو.

● گەیشتە ئەوەی باوەڕ بکەم ١٠٠٪ بەنـهێنی گفتوگۆ هەیـە لـەنێوان بەعس و حکومەتی شا وا خەریکن نزیك ببنەوە لێك.

بەپەلە ڕۆیشتمە بەیروت ویستم بەنهێنی بەناوێکی ترەوە سەفەر بکەم بـۆ ئـێران ڕوو بـەڕوو چـاوم بـەبارزانی بکـەوێت بـۆ ئـەوەی ئاگــاداری بکەمــەوە بەدلخەوە سەرنەکەوتم و گەڕامەوە بەغدا. لەڕێگای (حەمەی وەلی) بەتایبەتی بەدووررو درێژی نووسراوێکم ئاراستە کرد کە شۆڕش لەخەتــەرێکی گەورەدایـە بەهۆی نزیك بوونەوەی بەعس و شاه، هەروەها برادەرەکـەمان ئـەکات وەکـو دەقی نووسراوەکە هەموویت بەقسە ئاگادار دەکاتەوە.

● م.ك تەلـەفۆنی لەگـەڵ کـردم کـەدوای دوو ڕۆژی تـر لــە(بــەیروت- شەقامی بلیس) چێشتخانەی سقراط (بەیروت -شارع بلیس- مطعم سقراط)، سەعات یەك چاوەڕوانتم، لەکاتی دیاریکراو لەساڵی ١٩٧٥ ڕۆیشتم گەیشـتمە نزیك شوێنی مەبەست کۆمــەڵێك ئەهاتنــە دەرێ لەچێشـتخانەکە لەوانـە (مـام جەلال) و (شێخ عزیز رەزا) بوون، مام گەڕایەوەو دانیشـتین بـەدوورو درێـژی

باسی هەموو شتێکی بۆ کردم کە شا وا خەریکە بەتەواوەتی دەست بەسەر شۆڕش دا بگرێت بتوانین هەوڵ بدەین هەریەکەمان لەلای خۆیەوە (گفتوگۆ - مفاوضە) یەك دروست بکەین لەنێوان (صدام) و (بارزانی)، بۆ ئەم مەبەستە مامۆستا (ابراهیم احمد) کاسێتێکی ناردووە پەنجە بۆ ئەم ڕووداوە گرنگە درێژ ئەکات، لەگەڵ (مام جەلال) بەیەکەوە چووینەماڵەوە لە(بەیروت- رومانە) بوو بەتەواوەتی گوێم لەکاسێتەکە گرت. پێشەکی بۆ چەواشەکردن دەنگی باڤێلی کوڕە گەورەی (مام جەلال) تۆمار کرابوو.

ئەدجا وشە بەنرخەکانی مامۆستا ابراهیم احمد بەدوورو درێژی باسی ماهیەتی شۆڕش دەکات کەپێش ئەوەی ئێران بەتەواوەتی دەست بەسەر شۆڕش دا بگرێت، ڕێکەوتن لەنێوان بەعس و شۆڕش هەموو ئەوە خەتەرانە پووچەڵ دەکاتەوە.

بەیانییەکەی لەگەڵ (مام جەلال) هاتینە فڕۆکەخانەی بەیروت من ڕووم کردەوە بەغدا و (مام جەلال) ڕۆیشتە قاهیرە کاتی دیاری کراوی وەرگرتبوو لەکاربەدەستانی میسری کەبیانبینێت.

● کەگەڕامەوە بۆ بەغدا بۆ ئەم مەبەستە کەوتمە جموجۆڵ کردن وە پرۆگرامێکم بۆ خۆم داڕشت کەلەکوێیەوە دەست پێبکەم، بەپیلان جوولامەوە.

١- بەدوورو درێژی بەنووسین و قسەکردن ئەم خستە بەرچاوی سەرکردەکانی بەعس کەشۆڕش چەند بەهێزە لەهەموو ڕوویەکەوە.

٢-بۆم ڕوون دەکردنەوە بەهیچ جۆرێك شۆڕش بەشەڕ کۆتای نایەت، نەسوپای عێراقی توانی شۆڕش لەناوبەرێت، نەشۆڕش ئەو دەسەڵاتەی پەیدلکرد کەدەست بەسەر هەموو پارێزگاکان دا بگرێت وەکو موصل، دهۆك، هەولێر، کەرکوك، سلێمانی.

٣-پیلانی (CIA) و شای ئێران ئەوەبوو کەشەڕ ڕوویداتەوە لەنێوان بەعس وکورد، هەرچەندە هەردوولا (بەعس وکورد) تاوانباری گەورەن، دەیانتوانی لەئەدجامی گفتوگۆکردن ڕێك بکەوتنایە ئەو ماڵ وێرانییەیان نەچەسپاندایە بەسەر هەموو عێراق.

٤- ئێستاكە بارودۆخ زۆر ڕوون و ئاشكرایە بۆ هەموو لایەك، هەردووك لا لەناوەوە زۆرزۆر بەهێزن، هیچ گۆڕانكارییەك ڕوونادات لەعێراقدا واتە( كوردەتا بەسەر بەعسییەكاندا ناكرێت).

٥- بارودۆخی ئێستاكە دوای ئەو لێكۆڵینەوەیە لەبەرئەوەشی گشتیدایە كە بكەونە گفتوگۆ و ڕێكەوتن لەنێوان بەعس و شۆڕش، هەموو پیلانگێڕی دەسیسەی شاو (CIA) كە (هێلمزی) بەڕێوەبەری (مخابراتی كۆنی ئەمریكی)، كە ئێستاكە بەپلەی باڵێوزی ئەمریكی لەتەهرانە لەو پلە گەورەیەی پێشووی هاتۆتە ئەو پلە پچووكە گومان نییە بەپیلانێكی زۆر گەورەو نهێنی هاتووە بۆ جێبەجێكردنی، ئەگەر بێتوو هەردوو لاتان (صدام) و (بارزانی) بكەونە گفتوگۆ و ڕێك بكەون كورسییەكەی (هێلمز) دەكەوێتە لەقین هەموو ئەو دەسیسانەی هەیە پوچەڵ دەبێتەوە.

**<u>تێبینی:</u>**

١- لەسەركردەكانی بەعسەوە دەستم پێكرد لەبەشێكی زۆر كەس وكاری (احمد حسن بكر) و (صدام تكریتی) وە هەروەها لەبەشێك لەعەرەبە نیشتمان پەروەرەكان كەدۆستایەتی یان لەنزیكەوە هەبوو لەگەڵ سەركردەكانی بەعس و خزمانی (بكر) و (صدام).

٢- چاوم كەوت بەچەند كوردێكی ئازاو نیشتمان پەروەر كەپێویستە ئەوانیش دەوریان هەبێت بۆ ئەم مەبەستە بەڵام بەداخەوە...

٣- بەڕاستی شایانی باس كردنە بەو جۆرەی كەدكتۆر عبدالرحمن قاسملۆ بۆئەم مەبەستە دەورێكی زۆر گەورەو گرنگی هەبوو، بەیانێكی بڵاوكردەوە بەو ناوەی ئاشتی بەرقەراربێت لەنێوان بەعس و شۆڕش. دكتۆر عبدالرحمن قاسملۆ بەم جۆرە ناسیم كاتێك (مەلا مستەفا بارزانی) لەخانووەكەی (نوری سعیدی) كۆن بوو لەساڵی ١٩٥٩ من لەباخچەكە ڕاوەستابووم كەچاوی بەمن كەوت بانگی كردم و وتی (رحمن) بەكوردێكی جەربەزەت دەناسم سوود بەخش دەبێت بۆ نان خواردنی نیوەڕۆ لەخزمەت (مەلا مصطفی) دا بووین (مام جەلال)، (دكتۆر عبدالرحمن قاسملۆ) و هاوسەرەكەی (نەسرین) بەندە.

* (حەمەی وەلی حەمەی کرم)– (سعدون غیدان):

لەکاتی چاوپێکەوتنی حمەی ولی لەگەڵ (سعدون غیدان) بەندەش ئامادەبوو لە کۆبوونەوەکان بەسفەتی (مترجم) لەهەمان کات لەلای حکومەت کەحمە وەکیلی منە و کار بۆ بەعس دەکات.

لەهەمان کات ئەم پیلانەیان دادەنا بۆبەرژەوەندی شۆڕش بەئاگاداری مەکتەبی بارزانی، مسعود بارزانی.

تاکو بتوانین ماهیەتی شۆڕشی لەهەموو ڕوویەکەوە و ڕاستیەکانی بزانین، تاکو لەم ڕێگایەوە جموجۆڵ بکرێت بەعس لەگەڵ بارزانی گفتوگۆ بکات.

کەقسەکانی (حمەی وەلی) م بەعەرەبی بۆ باس کرد، تۆماری کرد، جۆری چەکەکانی بنکەو سەربازەکانی ئێرانی کەتۆپە گەورەکانیان بەکاردەهێنن دژی سوپای عێراقی و بۆردوومانی پێ ئەکەن.

(سعدون غیدان) کامیرایەکی دا بە(حمە وەلی) و وتی: ئەم جارە ڕەسمی بنکەو بازگەکانی ئێرانی پێبگرە لەمەو دوا ئێمە وا ئەکات کەبیر لەگفتوگۆ بکەینەوە لەگەڵ بارزانی.

کاتێك حمە گەڕایەوە بەدوورو درێژی بەنووسراو ئاراستەی مەکتەبی بارزانیم کرد، خستمەبەرچاویان وە(حەمەی وەلی)ش کامێرەکەی تەسلیم بە(مسعود بارزانی) ئەکات ئەویش لەقسەکردن لەبەرکردن‌گەلێك زۆرتر لەنامە درێژەکانی من لەسەر سنگی لەبەری کردبوو ئاگاداری ئەکات.

(مسعود بارزانی) ڕازی نەبوو بەوەی کەبنکەو تۆپی سەربازەکانی ئێرانی پێ بگرن، وتبووی ئەمە ئەبێتە هۆی ئەوەی لەبەرامبەر ئێرانی‌یەکان کارێکی ناشیرینە و جوان نی‌یە، ڕەنگە بەعسی‌یەکان ڕۆژێك سوود لەمە وەربگرن.

● لەڕێگەی (کاکەحەمە) نووسراوێکم ئاراستەی مەکتەبی بارزانی کرد بەدوورو درێژی ئەوەی پێی هەستابووم خستمە بەرچاویان بۆ ئاگاداری کردن، ئینجا لەگەڵ دەنگوباسە نهێنی‌یەکانی ڕۆژانە کەدەمزانی ناردم و گەیشتە شوێنی خۆی. ناوبراو (حەمە وەلی) دوای ٣ سێ ڕۆژ گەڕایەوە یەکسەر چوومە لای نووسراوێکی دیکەم ئاراستەکردن لەبەر گرنگی بارودۆخی ئەو ڕۆژە بۆ مەکتەبی بارزانی.

● من لەلایەن خۆمەوە چیم توانی چ بەنووسین و چ بە قسە ڕووبەڕوو خستمە بەرچاوی سەرکردەکانی بەعس، بەو ئامانجەی کەبکەونە

گفتوگۆکردن لەگەڵ بارزانی. ئێستا گەیشتمە ئەو باوەڕە کەبەهیچ جۆرێك سەرکردەی بەعس لەبیروباوەڕیاندا نی‌یە لەگەڵ بارزانی لەژوورێك دانیشن بۆ جێبەجێ کردنی بەیانەکە.

راستە گومانم نی‌یە لە ١٠٠٪ لەنێوان صدام وشا بەنهێنی گفتوگۆکەیان بەردەوامە، کۆبوونەوەکەیان لەدەرەوەی ئەوەوەیە. تێکەڵاو بوونی هەبوو و مەرجەکە خەتەرناکە، ئاگادارین پیلانێکی گەورە هەیە. بە چوار کاتژمێر چیم دەزانی خستمە سەرکاغەز و بەقسەش بەدوورو درێژی نووسراوەکەم بۆ(کاکە حەمە) باس کرد دووجار خوێندمەوە کەئەویش مسعود بارزانی بکات ئاگادار بکاتەوە.

(کاکە حەمەش) نووسراوەکەی تەسلیم کردبوو وە بەدووروودرێژی هەمووی بەقسە باس کردبوو وەگێڕابوویەوەو (لەساڵی ١٩٩٢ ناوبراو خۆی ناساندبوو بەکاك (مسعود بارزانی) لەدانیشتنێکدا ئەمەی بۆ گێڕابۆوە).

لەگەڕانەوەی دەگاتە مەهاباد لەنێزگە چاوپێکەوتنەکەی شای ئێران و صدام تگزیتی لەجەزائیر بڵاودەبێتەوە.

* (انهیار حرکة الکردیة) (هەرەس هێنانی بزووتنەوەی کوردایەتی) ١٩٧٥/٣/٧ دونیام لێهاتەوە یەك ناخۆشترین ڕۆژم بوو لەژیان دا لەکاتێکدا ئەم شۆڕشە مەزنە ئامادجی هەموو کوردێکی ـنیشتمان پەروەر و بەشەرەف بوو، ئێستاکە وەکو بەفری بەهار توایەوە.

بەم هەموو دەست ڕۆیشتنەو دەسەڵاتەی کەتۆپ وچەك و تەقەمەنی، واتە شتوومەکی عەسکەری بەحەفتاهەزار پێشمەرگە کۆتایی پێهات. پێشمەرگە پۆل پۆل خۆی تەسلیم دەکاتەوە بەچەکەوە.

من وکەمالی برام لەگەڵ ماڵەوە چووینە بنکەی کارکردنی ڕۆژانەمان کەلەسەر چەمی سیروان بوو دەسەڵاتێکمان بۆ نەمابوو لەگەڵ ئەمین و دوویرادەرەکەو ئێمە (پێنج پیاوو ئافرەتێك) دەستمان کرد بەگریان، چونکە هیچ بەڵگەیەکمان پێنەبوو، هیچمان نەزانی کەلەسەری گفتوگۆ بکەین تەنها ئەوەمان وت دوژمنانی کورد (دەوڵەتە دراوسێکان) عێراق وئێران و تورکیاو سوریا هەرچەندە دوژمنی یەکن، بەڵام بەرامبەر بەکورد یەك هەڵوێستیان هەیە.

ئەمەریکاش کەکۆماری مهابادی ڕووخاند وریاکردنەوەی سەرۆکی کۆماری ئەمەریکا بۆ ستالین ئەوە بوو کەئەڵێت: ((هەتاوەکو ئەوەندە سەعاتەی دیکە سوپای سووری ڕووسی لە(ئازربەیجان)ی ڕۆژئاوای (ئێران) نەکشێتەوە (برا وبحرا وجوا) واتە (بەهێزی پیادەو دەریایی وئاسمانی) لەگەڵتاندا دەجەنگم)).

ئەوەبوو سوپای سووری ڕوسیا کشایەوە سوپای شای ئێران کوردستانی داگیرکردەوەو کۆماری مهاباد ڕووخا.

لەهەمان کات من لەناو جەرگەی دوژمنم بەناو سیخوڕم، دڵسۆزێکی بەعسم، بەشدارم وەکو ئەوان، ئەبێت پێبکەنم خۆشحاڵی خۆم دەربڕم هێرش بەرمە سەر قیادەی شۆڕش.

نهێنییەکانی خۆم و براکانم کمال و شفیق ومالەوەمان لەگەڵ ئەو سێ برادەرە تاکو دوێنێ سوێندمان دەخوارد بەشۆڕش و قیادەکەی هەموو هەڵوێستێکمان ئەوەبوو بۆ سەرکەوتنی شۆڕشەکە.

جا ئەو برادەرە شۆڕش گێڕەی کەدوێنێ پێشمەرگەبوو، دوای هەرەسەکە ئەهاتەوە ناو ماڵ ومنداڵەکانی خۆی چ دادەنیشت یا کارێکی میری دەکرد خۆی بەتاوانبار نەدەزانی.

ڕێکەوتین خۆم و هەموو ئەو خەڵکانەی لەگەڵم ئیشیان دەکرد، واتە تەتەر بوون بەقسە یا بەکردەوە لەمن زیاتریان کرد و ئیش وکارەکەی خۆیان زۆر بەپاکی و دڵسۆزی بردە سەر، ئیتر برادەرێتی و دۆستایەتیمان هەر دەمێنێت، بەڵام ئەمە لەبیرخۆمان دەبەینەوەچونکی ئەمە ئاشکرا بێت یەکسەر لەسێدارەمان دەدەن، بەڵێنتان پێ دەدەم ئەوەی زەق بێت منم متمانەم پێبکەن پارچە پارچەم بکەن دان بەوەدا نانێم بڵێم من ئەم کارەم کردووە.(ئیتر لێم گەڕێن بۆ خۆم چۆن دەجووڵێمەوە).

*شەفیقی برام:

پێنج جاریان بەپێ گەیشتوەتە بارەگای مەکتەبی بارزانی بەبێ دواکەوتن یەکسەر لەگەڵ مسعود بارزانی کۆبۆتەوەو کەوەڵامی نووسراوەکانی منیان داوەتێ و گەڕاوەتەوە.

دایکم دووجار نامەکەی منی لەبەغداوە بردە (کۆیسنجق)، ئینجا تەسلیم بە(شەفیق)ی برامی کردووە.

دوو جـار لەگـەڵ (حمــەی وەلی) (حمــەی کــەرەم) بەیەکــەوە لــەدێی (ئەحمەدئاوا -گازێنۆکە) ئەچوونە (حاجی عومەران) و بۆ مەکتەبی (بارزانی)، یەکسەر بەبێ دواکەوتن لەگەڵ (مسعود بارزانی) کۆبۆتەوە، (حەمەی کەرەم) بەتەواوەتی شارەزا بوو باشیان ناسی لەهەموو ڕوویەکەوە.

• حەمەی وەلی حەمەی کەرەم: مەوالیدی ١٩٣٢ کەلار، دێی ئەحمەد ئاوا ناسراوە بەگازینۆکە، کاسب کار،ئازا،لەساڵی ١٩٥٩ لێپرسراوی دووهەمی پارتی بووە لەکەلار لەساڵی ١٩٦٢ پ.م بوو لەبەمۆ.

یانزە جار هاتووچۆی کردوە لەدێی ئەحمــەد ئـاوا، بەگازینۆکـە ناسـراوە لەکـەلار، چوارجـار بـەپێ لـەدۆڵی شــەمیدانەوە چۆتــە بارەگــای مەکتــەبی بارزانی، حمـە دووجاریـان لەگـەڵ (شـەفیق)، حـەوت جـار بەماشـێن لـەدێی (ئەحمەد ئاوا) چۆتە ئێران بەسێ ڕۆژ گەیشتوەتە مەکتەبی بـارزانی و بەسـێ ڕۆژیش هاتۆتەوە (نووسراوی تایبەتی) بۆ هێناووم لە(مسعود بارزانی) یەوە.

## تێبینی:

هەموو جارێك لەهاتووچۆ کردن و گەڕانەوەی پرسیارم لێکـردووە سـەعات چەند گەیشتن وەسەعات چەند چاوت کەوت بە(مسعود بارزانی).

(حەمەی وەلی) وەڵامــی ئەدامــەوە، کەئەگەمــە ئــەوێ لەبــەر بــەرژەوەندی گشـتی لەشـوێنێکی تایبـەتیم دائـەنێن، ئـەنجا شـەوەکەی دوو بـەدوو لەگـەڵ (مەســعود بــارزانی) بــەدووروودرێژی گفتوگــۆم ئــەکرد وەنووســراوەکەی ئەخوێندەوەو پرسیاری لێئەکردم منیش وەڵامم ئەدایەوە.

جارێکیان حمەی‌ولی پێی دەڵێت کاك (مەسـعود) ئاگـادارن کـە ٢٤ کـەس کوژرابـوون لەوکاتـەدا (عبدالوهــاب ئەتروشــی) تــێ دەپــەڕێ ڕاناوەسـتێت لەکاتێکدا ئەزانێت ٢٤ پ.م لەهێزەکەی کوژراون چۆن سەرکردە ئەبێت ئەمــە هەڵوێسـتی بێـت خـەڵك قسـە ئـەکات بۆچی ئەمــە نــاکۆڕن بــە(.....) کــاك (مەسعود بارزانی) وەڵامی ناداتەوە.

• تاکو دوێنێ هەڵوێستێکم هەبوو ئێستاکە وەکو بەعسی‌یەکان ئـەبێت توانجیان تێبکرم، بەڵام من چی بکـەم چۆن بجووڵێمـەوە، هەڵوێسـتم چـۆن چۆنی بێت چونکە ئەبێت بەشدار بم لەگەڕانەوەو بەخێرهاتنەوەی بەشێك لەو

خەڵکانەی کەناسراون، چ بەفڕۆکە، یان لەڕێگەی سنوورەوە بەپێریانەوە بچم چاووم پێیان بکەوێت.

● صالح یوسفی: یەکەم کەس لە(ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پ.د.ك) بەپەلە بەنیازی گفتوگۆ گەیشتە بەغدا لەئوتێل (کلیوپاترا) دایان بەزاند چوومە خزمەتی بەخێرهاتنم کرد داوای لێ کردم کەچاوی بە(صدام حسین) بکەوێت. وەڵامم دایەوە وتم وەرە خوارێ شۆڕش نەما، وتی باشە با چاوم بکەوێت بە (سعدون غیدان) دووبارە پێم وتەوە وەرە خوارێ شۆڕش نەما وتی دەباشە باچاوم بکەوێت بەبەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی، هەر وتم وەرە خوارێ زۆر وەرە خوارێ شۆڕش نەماوە، تەنها ڕەنگە بتوانیت ئەفسەرێك یان ئەفسەرێکی ئاسایش ببینیت.

پارەم دا بەیاوەرەکەم لەسەر کاغەزێك ئەم شتانەم بۆ نووسی کەبۆی بکڕێ (کراس، بیجامە، قۆندەرە، دەرپێ، و فانیلە، گۆرەوی، وخاولی، تاقمی ریش تاشین) کەئەم شتانەیان هێنا پێم ووت بڕۆ خۆت بشۆ ریشت بتاشە کەلێ بوویتەوە چاوەڕوانم بکە.

گەڕامەوە لای وتم: ئەوە کلیلی ماڵەوەیە فەرموو بابەیەکەوە بتگەیەنم، ماڵەکەت وەك خۆیەتی دەستی لێ نەدراوە.

لەساڵی ١٩٩٦ لەزانخۆ لەگەڵ هاوسەرەکەم (ئێرانی فیض الله بیگی) چووینە ماڵی سەیدا صالح یوسفی خۆم بەخێزانەکەی سەیدا ناساند بەگەرمی‌یەوە بەخێرهاتنی کردین خۆشحاڵی خۆی دەربڕی بیری کەوتەوە کەمن بەچی جۆرێك هەڵوێستم پێ نیشان داون، ڕوویەڕووی کچەکەی بەبیرم هێنایەوە، وتم بۆچی سەیدا صالح یوسفیت کوشت، نەهاتمە ماڵتان، ئەی ئاگادارم نەکردیت، کەژیانی سەیدا یوسفی خەتەرناکە مانەوەی لێرە کووشتنە، تۆ نەتهێشت ڕێگات نەدا بەرهەڵستیت کرد خاوت کردەوە و پێت وتبوو هەتاوەکو کەی دەربەدەربین، ئەویش لەوەڵامدا وتی ئەم دەزانی دەیکوژن ئەگینا بەقسەم دەکردیت.

*لەسنووری عێراق – (خانەقین– منذریة)

چاوەڕوانی بەکری (مام رەزا) و (علی سلیم بەگم) دەکرد کەچاوم پێیان بکەوێت و پێیان ڕابگەیەنم کەبەناوی ئەوان ڕاپۆرتێکم نووسیوە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی و وەزیری ناوخۆ هاتووم ئاگادارییان

بکەمەوە نەبادا لەکاتی هاتنیان بۆ عێراق ڕێزیان لێ بگرن، چونکە ناوم دابوون بەئاسایشی گشتی وپێیان بڵێن ئێوە خزمەتی بەعستان کردووە بۆ من زیانێکی گەورەیە کاتێك ئەمە بزانن ڕاست نییە، پەنجەم دەخەنەسەر کەرەفیق پشدەری پاراستنە ئیشی بۆ شۆڕش کردووە.

## تێبینی:

بۆ ڕوون کردنەوە زۆر جار لە(مەسعود بارزانی) یەوە هەندێك دەنگوباسی گرنگ و ڕاستەقینەم بۆ دەهات تاکو بیخەمە بەرچاوی بەعسیەکان کەببێتە هۆی ئەوەی ماهیەت بەشۆڕش بدەن و بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی دان بەمافی کوردا بنێت و بۆ جێبەجێ کردنی منیش دەمکرد بەڕاپۆرت بەناوی (بەکری مام ڕەزا) یان

(عەلی سەلیم بەگ) دەمنارد.

بەکری مام ڕزا: لەبنەماڵەیەکی نیشتمان پەروەری کۆیسنجەقە لەقەڵاتزێ لە دایك بووە دەرچووی کشتوکاڵییە، ئازا، زیرەك، خوێندەوار، کورد پەروەر، لەسەرەتا پێشمەرگە بووە ناسراوە بەباڵی م.س جماعەتی (مام جەلال).

عەلی سەلیم بەگی جاف: لەبنەماڵەیەکی ناسراو دانیشتووی کەلار– ئازا– زیرەك– خوێندەوار– نیشتمان پەروەر– ئەندام بووە لەحزبی هیوا، کادرێکی پارتی کۆن بووە،لەپێشمەرگە کۆنەکانی شۆڕشە ناسراو بوو بەباڵی م.س جماعەتی (مام جەلال).

● لەکاتێك هەر لەسنوور بووم دوو ئوتومبێلی ئاسایشی (بعقوبە) هاتبوون بۆ (مندرية) چاوەڕوانی (شوکت ملا اسماعیل) یان دەکرد. ناوبراو گەیشت بەپیرییەوە چوون ڕێزیان لێ گرت دوایی بەرەو بەغدا کەوتە ڕێ وەدەست بەجێ یەکێك بوو لەو خەڵکانەی کەدایانەزراند، بەمە ڕازی نەبوو نووسراوێکی ئاراستەی (صدام تکریتی) کردبوو کەچاوی پێ بکەوێت. لەکاتی دانانی ئەچێتە ژوورەوە بۆ لای سکاڵای خۆی دەکات، کەئەبوو لەجێگەیەکی گرنگی دابنێن، (صدام) ئەڵێت تۆ ترسنۆکی گفتی خۆت بەجێ نەهێنا کەئەت

وت بەو نیشانە هەڵدەستم ئەمەش زۆرە بۆ یەکێکی وەکو تۆ، (شوکت ملا اسماعیل) دەگێڕێت ئەڵێ ڕەفیق پشدەری کەشفی کردووم لەناو شۆڕش ئەو کاتە صدام ئەڵێت نامەوێ گوێم لەو قسەیە بێت کەئێستا وتت ناوی ڕەفیق پشدەری مەهێنە، لەو لاو ئەولاوە چەند پرسیارێکی هاکەزاییان لێ کردم لەم بابەتەوە.

● ڕۆژێکیان سەردانی (فواد عارف) م کرد بەبۆنەی گەڕانەوەی بۆ عێراق، چونکە ئەویش وا ئاشکرا بوو کەپەیوەندی بەشۆڕشەوە کرد پێشەکی زۆر زۆر سوپاسی کردم کەسەرم لەماڵی داوە، گوتی تەنها تۆ بوویت کەفریای ئێمە بکەویت، دەستی یارمەتیت بۆ درێژ کردووین کاتێك عطای کاکە حەمەو نوالی کچی ماجد مصطفی کەهاوسەری فەرهادی کوڕمە، دێنە لات هەموو کارێکیان بۆ ئەنجام دەدەیت بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە لەکاتێکدا من کەڕاومەتەوەو هەتاکو ئەو سەعاتەش فەرهادی کوڕم هەر لەبەندیخانەیە.

پرسیم لەبەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی هۆی چییە فەرهادی کوڕی فۆاد عارف بەرنادەن؟ ئەویش بۆی باس کردم هۆیەکان چین. منیش ئاگاداری فۆاد عارفم کرد کەگوایا بەڕێزتان لەلندن بوون یەکێك ( ....) بەئێوەی وتووە کاك فۆاد بۆ ناگەڕێیتەوە بۆ عێراق تۆش، ووتووتە تاکو صدام مابێت لەحوکم، من ناگەڕێمەوە.

فۆاد عارف وتی ئێمە چەند کەسانێك بووین پێش ئەوەی شەڕ دەست پێبکاتەوە لەبەغداوە چووینە لای بارزانی بەمەبەستی ئەوەی ئاشتی بەردەوام بێت منیان هێشتەوە بەبێ ئەوەی ئامادەگیرم هەبێت لە(رضائیة) لەئوتێل بووم ژوورەکەی تەنیشتم هی بارزانی خۆی بوو کەچی سەرانسەر نەیانهێشت من ئەو پیاوە ببینم، تاکو دوای هەرەسەکە ئینجا بارزانیم دیت و زۆر ڕەخنەم لێگرت کەبەم شێوەیە ڕەفتار لەگەڵ من کراوە، ڕەفیق من لەئێران نەچوومەتە دەرێ، منیش ئەم قسانە وەکو خۆی گەیاندە شوێنی مەبەست کەئەمە ڕاست نییە، ئینجا فەرهاد فۆاد عارف بەردرا. ئەو کەسەی کەئەو ڕاپۆرتە درۆزنەی لەسەر (فواد عارف) نووسیوە ناوی (عبدالرحمن)ە جار جار دیومە لەهەولێر لەترسان بەگەرمەوە سڵاوی لێ دەکەم دەڵێت چۆنی وەڵامی دەدەمەوە دەستەکانت ماچ ئەکەم چونکی ماهیەتی دێتەوە بیرم.

* لەفرۆکەخانەی بەغداد، چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد کەلەتەهرانەوە کۆمەڵێك کورد کەبەشداری شۆڕش بوون دەگەڕێنەوە بۆ وڵات لەمانگی ٥/١٩٧٥. کەدابەزین لەفرۆکەکە دیتم خەڵکێکی ڕۆشنبیرو نیشتمان پەروەر و ناسراو کەلەناو جەماوەری کورد جۆری ڕێزیّ بەگەرمییەوە بەپیریانەوە چووە، وام کرد ژووری میانداریان بۆ بکەنەوە (صالح الشریف).

دوای خواردنەوەی چا ماوەی سەعاتێك بەیەکەوە دانیشتین ئەم هێشت ساکەکانیان (جانتا) بەهیچ جۆرێك تەماشا بکرێت چونکە ئاگاداریان کردم، ڕێکەوتین کەبەیانییەکەی لەشوێنێکی دیاری کراو چاومان بەیەکتر بکەوێت.

ئەمانە دکتۆر (کەمال خەیات)، (دکتۆر کەمال مظهر)، (دارا رشید جەودەت)، (خسرەو تۆفیق)، (کەمال محی‌الدین).

*سیاسەتی بەعسم بۆ ڕوون کردنەوە کە چۆن لەخۆبایی بوون (غرور)، وا تەماشای کێشەی کورد دەکەن کە ئیتر هەموو شتێك کۆتایی هات، دوای هەرەسەکەی کورد. عزت دوری ووتبووی وادەکەین هەر صەد ماڵ چەقۆیەکیان پێبێت بۆ کاروباری چێشت خانە کەژن بەکاری بهێنێت بۆ وورد کردنی باینجان و تەماتە و خەیار و گۆشت.

کاتێك (ڕێکەوتنەکەی جەزائیر) بڵاوکرایەوە مقۆ مقۆ پەیدا بوو لەناو بەشێکی زۆری کادرانی بەعس دەربارەی ڕێکەوتنەکە ئەیانووت بۆچی (صدام) لەگەڵ (بارزانی) ڕێنەکەوت صدام لەگەڵ دوژمنی عەرەب کەشای ئێرانە بەم شێوەیە چۆکی دانا بەشێکی زۆری لەخاکی عێراقی خۆشەویست و نیوەی (شط العرب) ی دایە (ئێران).

کاتی خۆی (نوری سعید) دەڵێت دەستم بەبڕن ئەمە ئیمزا ناکەم، فەرمانێك لەقیادەی بەعسەوە دەرچوو بەهیچ جۆرێك دەربارەی ڕێکەوتنی جەزائیر نابێت گفتوگۆی لەسەر بکرێت هەر کەس باسی بکات بەخراپی لەحزب دەردەکرێت وە شەش مانگ دەخرێتە بەندیخانە.

بەدڵخەوە، ئەوانەی دەگەڕێنەوە بەشی زۆریان بەجۆرێك وورەیان بەردابوە، باوەڕیان بەکورد نەماوە قسەو ڕەفتارو نووسینیان بەگوێرەی خۆشحاڵی بەعس بوو.

ئینجا برایانی بەڕێز کۆمەڵێکی ڕۆشنبیر و سیاسەتمەدار و شارەزا پێویستی ناکات من ڕێگاتان پێنیشان بدەم بەگەورەیی خۆتان بم بەخشن

١

دلوا لەبەڕێزتان دەکەم کەئەرکی سەرشانی ئێوەیە، باروبۆخی ئیمڕۆی کوردیان بۆ ڕوون بکەنەوە کەکورد لەژێر سیاسەتێکی جیهانی دەوڵەتێکی وەکو ئەمەریکا، ئەم ڕێکەوتنەی لەنێوان دوو دەوڵەتی کەدوژمنی سەرەکی یەکن کەئەویش عێراق و ئێرانە بەڕێوەبرد. وایکرد کەهەرەسیان بەسەرکوردا چەسپاند، لەکاتێکدا بەهێزترین شۆڕش بوو لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

لەو دوو خاڵەی کەهەیە سیاسیو سەربازی(پێشمەرگە) بڵاوەیان پێکرد، بەعس ئاگاداربوون کەقیادەی شۆڕش بەسەرۆکایەتی بارزانی هەوڵی ئەدا بۆئەوەی مافەکانی کورد بێتە دی. ئەگەر هاتوو ئێوەی بەعس ئەوەی بارزانی هەوڵی بۆ ئەدا کەئەویش حوکمی زاتی بوو ئێوە خۆتان هەموو مافەکانی کورد (حوکمی زاتی) ڕاستەقینە جێبەجێ بکەن و بیچەسپێنن ئەمە یەك لایەنە دەبێت هەتا هەتایە جارێکی تر کورد ناچێتەوە شاخ، بەڵام بەو شێوەیەی ئێستاکە ئێمە ڕۆشنبیری کوردین ڕاستی‌یەکانتان دەخەینە بەرچاو بۆ مێژوو و دوارۆژ، کورد نزیکترین نەتەوەیە کەپاڵپشتی عەرەب بووە، بۆ نموونە(صلاح الدین الایوبی) جێ دەستی دیار بووە.

من بەڵێنم دانێ ئەتانبەمە لای یەکێك لەکاربەدەستانی بەعس ئەوەی کەمن پێم ووتن تیشك بخەنەسەرئەو خاڵەی کەخەیاڵتان خاوە کورد هەر ئەمێنێ، ئەمە سیاسەتێکی ڕۆژانەیە ئەگەر ئەمە نەکەن (مافەکانی کورد جێبەجێ نەکەن) جارێکی کە دوور، یان نزیك شۆڕش بەرپا دەبێتەوە.

من بۆم نی‌یە کەدڵنیشتین ئەو قسانە بکەم، بەڵام ناهێڵم ئازارو ئەشکەنجە بدرێن و بتان گرن چۆن بەفرۆکە هاتنە خوارێ و چوونە ماڵێ هەر ئاواش بەم شێوەیە دەپارێزرێن من مەسئولیەتی ئێستاو دوا ڕۆژتان دەکەم.

کەلەقسەکانم تەواو بووم، هەموو ئەو برا دڵسۆزە ڕۆشنبیرانە سەیرکردنێکی سەرسوڕهێنەر سەیریان کردم، سوپاسیان کردم کەئەمە بیرو باوەڕو بۆچوونمەو، ئاوا ووردەم بەرزە.

ئەوانیش هەموویان بڕیاریان دا کەهەڵوێست و قسەکانی منیان پەسەند کرد، لەناوخۆیاندا باس لەوەکرا کەیەکێك هەڵبژێرن بەناوی هەموویان قسەکان بکات، بڕیار لەسەر دکتۆر (کەمال خەیات) درلو قسەکانی کەدەیکات لەناو خۆیاندا پەراوەیان دەکرد.

(د.کمال مظهر) و (د.کەمال خەیات) و (صالح یوسفی) و (دارای ڕەشید جەودەت) و (کمال محێدین) خوشکە (زەکیە ئیسماعیل حەقی) ئامادەبووین.

* ئاگاداری بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتیم کرد کەئەو بڕادەرانە هاتوونەتەوەو ڕۆشنبیری کوردی تامرازێ شێوەیەکی باش ئەبەخشن بۆ پڕوپاگەندە کردن لەبیرۆکەی بەعسی تکادەکەم ئەوەیە کە چاوت پێیان بکەوێت پێیانی بەعسیان بۆ ڕوون بکەیتەوە ئەویش ڕازی بوو.

● لە٥/٥/١٩٧٥ چووینە ئاسایشی گشتی لای بەڕێوەبەری (شعبە)ی سێ هەریەکە استمارەیەکیان دانێ پڕیان کردەوە کەبریتی بوو لەناونیشانیان.

ئینجا چووینە لای سکرتێری بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بە (د.کەمال خەیات)م وت تەماشای ئەو وێنەیە بکە کە بەزامبەزمانە، چاوەکەی چەندە زەق ئەو (عیون الشعریە) چاوی هنازلوە ئێستاکە لە ژوورەوە بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی چاوی لەهەمووانە. ئینجا چووینە لای (عبدالخالق عبدالعزیز) بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی کۆمانم نییە قسەکانی کە لەوێ کران لەژوورەوە هەمووی تۆمار کران.

بەگەرمەوە بەخێرهاتنی کردین، باسی سیاسەتی بەعسی بۆ ڕوون کردینەوە کەئێمە هەڵوێستمان هەموو کاتێك خزمەتی گەلی عێراقە بێجیاوازی، ئینجا هێرشێکی توندی کردە سەر (بارزانی) و شۆڕشەکەی و پێی گوتین ئێوەش ڕۆشنبیری کوردن سوود بەخش دەبن بۆ وڵاتەکە.

● ئینجا د.کمال خیاط لەجیاتی هەموویان بەدوورو درێژی ئەم قسانەی کرد، کە نزیکەی ٢٠ دەقیقەی خایاند.

زۆر لەسەرخۆ دەستی بەقسەکردن کرد بەناوی هەموویانەوە ووتی: سوپاستان دەکەین کەکاتێك لەفرۆکە دابەزین بەم شێوەیە بەخێرهاتنتان کردین، ئەوپەڕی ڕێزتان لێگرتین، ئێستاکەش ئەم دانیشتنە لەخزمەت بەڕێزتان کەبەڕێوەبەری ئاسایشی گشتین، بەم شێوەیە لەگەڵمان دانیشتووی بەڕاستی جێی سەرسوڕمانی ئێمەیە کەئەبێت لەدەرەوە ئەمە باس بکەین، هەروەها ئێمەت وا لێکرد باوەڕت دا بەئێمە کەباروودۆخی ئێستای عێراق و بەتایبەتی هی کورد ڕاستییەکان چی هەیە بیخەینە بەرچاوتان ڕوویەڕوو

ڕوونی بکەینەوە ئەگەر ڕازی بیت، چونکە ئێمەی ڕۆشنبیری کورد مێژوو دوارۆژ حسابمان لەگەڵ دەکات.

متمانەمان وایە لەڕێگای ئێوەوە کە دەسەڵاتدارن برایانی سەرکردەکانی بەعسیش ئەم ڕاستییە بزانن، با هیچی تر دوژمن دەست نەخاتە وڵاتەکەمان. عێراقێکی بەپیت وپەرەکەت، خاوەن نەوت چوار دەورەمان چاویان بڕیوەتە ئێمەو، داگیرکەر لەیەکەم ڕۆژەوە هەوڵی دووبەرەکی ئەدات، شەڕو ئاژاوە و کێشەی کورد شتێکی سەرەکییە، ئەبێت ئێوە ڕێگایەك بدۆزنەوە کەجارێکی دیکە هەمان شۆڕش ڕوونەداتەوە وە بەشێوەیەکی سیاسی نەهێڵن کورد چەك هەڵگرێت و ڕوو لەشاخ بکاتەوە.

لای ئێوە ئاشکراو ڕوونە ئەو هەموو هێزەی شۆڕش لەپڕدا وەکو بەفری بەهار توایەوە، ئەمە خۆی لەخۆیدا ڕوودلوێکی سیاسی بوو چونکە لەدەرەوەی وڵات ئەم پیلانە کرا.ئەگەر ئێوە بتانەوێت جارێکی دیکە هەمان شۆڕش ڕوونەداتەوە ئەوەی کەبارزانی داوای دەکرد بۆ گەلی کورد حوکمی زاتی ڕاستەقینە بوو.

ئەبێت ئێوە مافەکانی کورد دانی پێدا بنێن وە جێبەجێی بکەن و حوکمی زاتی ڕاستەقینە بێتە کایەوە. ئەو کاتە ئێوە بەتەواوەتی جێی پارتیوبارزانی دەگرنەوە، هەمووکورد لەدەورووبەری بەعس کۆدەبێتەوە وە سەرکەوتننتان هەتا هەتایی دەبێ، ئێمە ڕاستمان لەگەڵ کردن چونکە ئەم دانیشتنە ڕۆژێ لەڕۆژان مێژوو باسی دەکات و ئەگەر بەشێوەیەکی ئاشتی دیموکراتی هەموو مەسەلەکانی کورد جێبەجێ نەکەن مەحاڵە سەرکەوتن بێننە دی.

لەیەکەم چرکەوە کە (د.کەمال خەیات) دەستیکرد بەقسەکردن هەردوو چاوم بڕیبووە (عبدالخالق)و تەماشام دەکرد، سەرنجم دایە وردە وردە ڕەنگی سوور هەڵگەڕا و زیاتر گرژتر ئەبوو کەقسەکانی تەواو بوو بەبەڕێوەبەری ئاسایشی گشتیم ووت کە بەڕێزتان ڕێگامان پێ بدەیت هەموو ئەو برایانە بۆ نان خواردنی نیوەڕۆ لەئوتێل (خیام) لای منن تکام وایە کە (عبدالقادر الراوی) فەرمانی پێبدەیت لەگەڵمان بێت.

لەسەر سفرەی نان خواردن نزیکەی ١٢ کەس بووین، شەو سەردانی بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتیم کرد، یەکسەر وتی ئەمە چیبوو تووشی منت

کرد، دوای لەناوچوونی شۆڕشیان بەم جۆرە ڕوویەڕووی من ئەم قسانەیان کرد،ئایا لەکاتی شۆڕش هاتبانایە بۆ گفتوگۆکردن ئەوکاتە چۆن چۆنی قسەیان ئەکرد. وتم ابو مازن (عبدالخالق) ئەمانە هەر هەموویان مرۆڤی ڕۆشنبیرو نیشتمان پەروەرن، وولاتیان خۆش دەوێت؛ لە دڵسۆزییەوە ڕاستییەکانیان خستە بەرچاوت؛ تاوەکو بەپێیانە لەنزیکەوە بزانیت ئەمە ئاواتی کوردە بەم جۆرە بیر دەکەنەوە لەجێبەجێ کردنی. خزمەتێکی گەورەیە بەرامبەر سەرکردایەتی بەعس ڕاستییەکان بزانن، بۆئەوەی نەخشەی بۆ بکێشن چۆن لەگەڵ کورد هەڵسوکەوت بکەن، تۆش وابکەیت ئەم ڕوودلوە گرنگە وەکو خۆی بگاتە شوێنی خۆی.

**تێبینی:**

ئەو ڕۆشنبیرو نیشتمان پەروەرانە بەو جۆرەی گفتوگۆو قسەکەیان چیان وتبوو لەگەڵ پێشەکییەکەی بەبەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی، وەکو دەمی خۆی ئاسایشیگشتی بەنامیلکەیەك بڵاوی کردەوە بەسەر سەرکردەکانی بەعس بۆ چاوپیاخشاندن من کەئەمەم زانی مەترسیم لێنیشت کەبیانگرن بەتایبەتی لەکمال خەیات و کمال مظهر.

بەڵام بەعس پیلان و سیاسەتی هەر بەردەوام بوو، لەچەواشەو ئازارو ئەشکەنجەو نەخۆشییەکەیان (غروری) گەیشتبووە دەرەجەی ۱۸۰ دەرەجە، مانگانە بەرەو زیاتر دەڕۆیشت.

* چوومە پارێزگای (دیوانیە): بەو نیازەی سەردانی قائد فرقە، (عمر مزاع) بکەم، چوومە خزمەتی لەفرقە بێئەندازە ڕێزی لێ گرتم وەمنی بەهەموو کاربەدەستانی فرقە ناساند بایەخی پێدام وتی ئەمە (ڕەفیق پشدەری)یە دۆستێکی نزیکی سەرۆکی و (نائبە) جێی باوەڕیانە، وتم هاتنم بۆ ئێرە سێ تکام هەیە کەبۆم بکەیت و بۆم ئەنجام بدەیت.

لەلایەن خۆتەوە چیت لەتواناداا بوو بەم ئیشە هەڵسیت، بەتایبەتی ئیشی یەکەمیان کە زۆرم لاگرنگە بۆ بەرژەوەندی وڵات سوودێکی گەورەیدەبێت. بڕوا ناکەم ئێوەی عەرەب ئەوە هەڵوێستان بێت کە مرۆڤی کورد بەم شێوەیە

تەماشا بکرێت و کردەوەی لەگەڵ بکرێت بڕوات بێت بەشەخسی من دوو کەس دەناسم لەو لێقەوماوانە ئەوانیش ژیانم بۆ دابین کردوون.

١- نزیکەی ١١٠٠ پۆلیس لەوانەی کەپەیوەندییان بەبارزانییەوە کردوو دوای هەرەسەکە گەڕاونەتەوە پاڵ حکومەت، ئێستاکە هەموویان وەکو مەڕ لێرە کۆکراونەتەوە بۆیان نییە لەسنووری پارێزگا دووریکەونەوە، زۆریان ژیانی ئابووریان زۆر خراپە، هەرچەندە کاسبی عەیب نییە، بەڵام ئەمانە ناونیشانێکی تریان پێیە کەپێشمەرگە بوون گەڕاونەتەوە ئێستا لەبەر باروئۆخی ئابووری بوونەتە بۆیاخ چی و کوڵ هەڵگر وردەواڵە دەفرۆشن لەسەر شەقامەکان، دانیشتوانی شارەکە بەجۆرێك ڕێزیان لێ دەگرن بەهەموو توانایەك دەستی یارمەتییان بۆ درێژ دەکەن، وە بەشێکیان بەنهێنی سواڵ دەکەن ئایا ئەوەیە هەڵوێستی عەرەب لە (بعقوبە) لەناو ئەو تۆزو خۆڵە ئێستاکەش خەڵکێك ماوە ڕێگا نادەن بچێتەوە شوێنی خۆی. نزیکەی دوو مەتر دووریووم لەخوشکم نەم ناسیەوە لەبەر تۆزو گەرمای کەمپەکە. کەلەبەغداوە هاتم بەرەو دیوانیە سەرنجی ڕاکێشام کەچەند خانوویەکی تازەکراوە هەر ژوورەی خێزانێکی کوردی تێدایە.

٢- لەم ڕۆژانە چوومە (ناصری)یە سەردانی برادەرێکی خۆشەویستم کرد گەڕاوەتەوە، یەکێك بوو لەدۆستە نزیکەکانی بارزانی، ناسراوە پێی دەڵێن (شەفیق ئەحمەد ئاغا). تکام لە پارێزگاری (ناصری)یە و بەڕێوەبەری (ئاسایشی گشتی ناصری)یە کرد کەئەم پیاوە مەزنە ئەگەر لەدەرەوە مابایە دەیتوانی بچێتەوە دەرەوەی وڵات، یان لەئێران بمێنێتەوە، بەڵام بۆیە گەڕاوەتەوە کەبەئازادی لەوڵاتەکەی خۆی بژیت.

٣- برازایەکم سەربازە ناوی محمد شفیق مامەیە بانگی کە چی دەوێت بۆی بکە.

٤- برایەکی دڵسۆز و خۆشەویستم هەیە ناوی (ئاغای حمەی حاجی)یە ڕەنگە هۆی سەرەکی ئەوە بووە کەهاتوومەتە ئێرە بزانە چی دەوێت کارەکانی ئەنجام بدە.

- <u>وەڵامەکانی (عمر مزاع):</u>

١- شتێکی کورت دەربارەی پۆلیسەکان دەزانم، بەڵام ئێستاکە باشت بۆ ڕوون کردمەوە، بەیانی من دادەبەزم شەرت بێت ناگەڕێمەوە هەتاکو کێشەکانیان بۆ چارەسەر نەکەم.

٢- ناردی بەشوێن برازاکەم لەبیمارستانی سوپا سەربازی بوو لەگەڵ بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە عقید فلان هتد تێبووی دەوری بێکەین نیشین. برازاکەم ئەم هەڵوێستەی قبووڵ نەکرد (هزاع) وتی چیت دەوێ بۆت بکەم بێتە لای خۆم یەکسەر لای بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە دەبیت؟ وتی مراسلی ناکەم و ئینزیباتیش بەمن ناکرێت، دەچمەوە شوێنی خۆم کەسەربازێکم.

## تێبینی:

(محمد) ئێستاکە شێتە. کوڕی گەورەشی ٢٢ ساڵە، بۆ خۆی لەکۆڵانان ئەخەوێت بەتایبەتی لەقەڵادزێ و رانیەو کۆیە دەژی، خەڵکی ئەم ناوچەیە دەیناسن، جار جار دەیبەنە حمام یان ماڵەوە دەیشۆن و بەرگی تازەی لەبەردەکەن.

٣-بانگی (ئاغای حمەی‌حاجی) کرد لێی پرسی چیت دەوێ بۆت بکەم و ئیشت چییە؟

ئاغا وتی: من مقاولم

(عمر هزاع) وتی: راوەستە ئێوە ڕاستگۆ نین هەموو مقاولێك خەریکی پارە کۆکردنەوەیە لەڕێگایەکی چەوتەوە تۆ چۆن ئەم برا گەورەیەی منت دۆزیوەتەوە هێناوتەتەوە ئێرە من دەسەڵاتم نییە بەرامبەری فەرمان دەرکە هەتاوەکو بۆت جێبەجێ بکەم.

ئاغا وتی ئیشێکم لەئەشغال وەرگرتووە کەئەوەندە مەتر چوارگۆشەیە بۆیان بگوازمەوە، دەمەوێ فرقە کتابێکم بۆ بکات لەو شوێنەی کەگڵی لێ هەڵدەکەنن ئەمە لەدوا ڕۆژدا دەبێتە قووڵاییەك زیانێکی گەورەی دەبێت بۆ بارەگای سوپا ڕێگا نادەین هیچی دیکە گڵ لێرە هەڵکەنین بیگوازنەوە بۆ شوێنێکی دیکە.

(عمر هزاع) لێی پرسیار کرد سوودی تۆ لەم کـارە چـەندە؟ وتـی مـەتری وابزانم ٦٠ فلسە.

(عمر هزاع) وتی: هەر ئێستاکە کتابێك بکەن لەسەر بڕیاری ئـەم مقاولـە چۆنی دەوێت ئاوا بۆی بنووسن تاوەکو من ئیمـزای بکـەم، ابـو بازیـان(رفیـق پشدەری) بەخۆڕایی نەبوو کەوتم بەشی زۆری مقاولەکان ساختەچین.

(ئاغای حمەی حاجی): خەڵکی سلێمانیـیە لەساڵی ١٩٦٦ گیرابوو لەسەر کوردایەتی، توانیم بـەری بدەم و ناسیاویم لەگەڵیـەیدا کرد وەکو برایـەك، نیشتمان پەروەر، زیرەك، کاسب بوو، شارەزا بـوو کە چۆن ملیۆن لەسـەر ملیۆن دابنێت.

## تێبینی:

هـەموو ئـەو داواکاریـیانـەی کەلـە(عمـر هـزاع)م کــرد ڕۆژانــە بەتەلــەفۆن ئاگاداری ئەکردم کەئیمڕۆ چی هەڵوێستێکی هەبووە بۆ ئەم مەبەسـتە لەگـەڵ فلان وفلان کۆبۆتەوە.

(زکیە اسماعیل حقـی): هاتمـە لای بـۆ ماڵـەوە لەسـەر داواکردنـی خـۆی ئاگـاداری کـردم کـە(حبیـب محمـد کریـم) لەقاهیرەیـە ئەمـەوێت بچـم بـۆ لای سەردانی بکەم، چونکە زۆر بێتاقەتـە لەبەر بارودۆخی ئێسـتای کـورد دوای ئەم کارەساتەی کەبەسـەر کـورد دا تێـپەڕ بـوو، گومـان نـیـە لـەڕۆژگارێکی سـەخت و تـاریك ژیـان دەباتـە سەر، پرسـیاری لێکـردم ج ڕاسـپاردەیەکت هەیەبۆی بەکورتی یەکەی چیـیە پێم بڵێ ؟

وتم: ئومێدەوارم هەر چۆنێك بێت ڕۆژگار لەقاهیرە و لە شوێنی تـر بباتـە سەر و لەهەموو لایـەك ئـەوە باشـترە، نـەك بگەڕێتـەوە و بیر لـەوە بکاتـەوە گەڕانەوەی نەمانە، بەعس جێی متمانە نییە، ڕۆژێك دێـت وەکـو حبیـب کـە سکرتێری پارتی بووە دواڕۆژی لەناوی بەرن.

بەکورتی و کوردی پێم ڕاگەیاند بگەڕێتەوە مانای کوشتنە. مانگی نەبردە سـەر حبیـب گەڕایـەوە زکیـە (ئیسـماعیل حـەقی) تەلـەفۆنی لەگـەڵ کــردم، هەروەها بەڕێوەبەری ئاسایشیگشتی ئاگادلری کردم کە(حبیب) گەڕاوەتەوە،

چاوت پیّی بکەوێت. چوومە خزمەتی و بەخێرهاتنم کرد، کەوتینە گفتوگۆ کردن دوو بەدوو خوشکە زکیەش بەشداری بەشێك لەقسەکانمانی کرد.

وتم: ئایا زکیە خان ئاگاداری نەکردیت کەگەڕانەوەت خەتەرناکە، هەروا بەئاسانی بەعس دەستت لیّ هەڵناگرێت؟ چاوت لێیە وا لەسەر عمودی کارەبای ماڵتان خەریکی ئەوەن تەلەکان چاك دەکەن؟ ئەوانەی ئەم کارە دەکەن کارمەندن لەئاسایشیگشتی ئەوە (لاقیتە- گوێ دێن) دائەنێن کەگوێیان لەهەموو قسەو تەلەفۆنی ئێوە بێت. ڕادیۆکەم بەرز کردەوە تاوەکو قسەکانمان لەگەڵ ڕادیۆکە بەکبگرێت لەدانیشتنەکە گرژیم پێوە دیار بوو بەجێم هێشت بەتووڕەیی.

گەلاوێژ خێزانی دارا تۆفیق: گەلاوێژ خان هاتنە ماڵمان (دارا) ئێستاکە لەبەیروتە دوای هەرەسەکە نەیتوانیوە لەئێران بژیت (دارا) وەڵامی ناردبوو بۆ گەلاوێژ خان کەئەبێت چاووت بەرەفیق پشدەری بکەوێت و بچیتە لای ئایا چی پەسەند دەکات بگەڕێمەوە یان لەبەیروت بم؟

وتم: گەلاوێژ خان لەڕێگەی خزمەکەتان کاك نوری وەڵامم بۆ ناردیت کەڕەوانەی حاجی عومەرانت دەکەن.

گەلاوێژ کاتی خۆی وەڵامی ناردبوو بۆم کەمەترسیم لەسەرنییە ڕۆژ نییە یەکێك لەئەندامانی (مجلسی قیادەی ثورة) تەلەفۆنم لەگەڵ نەکات من ماڵەکەم بەجیّ ناهێڵم.

پێم وت: دوایی بەو شێوە سووکایەتییە تۆو منداڵەکانت ڕەوانەی حاجی عومەرانیان کردیت بەدیلی، ئەمەخۆی لەخۆیدا شتێکی ناشیرینە، من ئەمتوانی لەڕێگەی تایبەتی خۆم بەسەلامەتی بتگەیەنم بۆ لای کاك دارا. ئێستاکەش هاتوویت دەڵێیت دارا تۆفیق لەبەیروتە ئەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ بەغدا؟ من چی بۆ دەستنیشان بکەم؟ گەڕانەوەی لەسێدارە دانە جا ئێستا بێت، دوای ١٠ ساڵی کە بێت.

دوای ماوەیەك گەلاوێژ ئاگاداریکردمەوە کەدارا تۆفیق گەڕایەوە. چاووم پیّی کەوت بەخێرهاتنم لیکرد بەبۆنەی گەڕانەوەی. (دارا تۆفیق) وتی: چاپخانەیەکم دەستی بەسەردا گیراوە لای حکومەت، ئەم چاپخانەیە هی شەخسی تایبەتی خۆمە زۆر مەمنونت دەبم بۆم وەرگرەوە مقداری ١٠٠٠ دیناریشت دەدەمیّ.

وتم: دلرا من پارێزەر نیم، ئیش بەپارە ناکەم، ئـەتوانیت بپرسیت هیچم نەکردووە هەتا باسی بکەم ئەشتوانی بپرسیت ئەوەی کردوومە بۆ یارمەتی دانی خەڵك بووە، بەشێکیان پـارەم داونەتێ پـارەم وەرنـەگرتووە، ئـەم چاپخانەیـە هـی شۆڕشـە ئەگـەر وەری بگرمـەوە وا دەزانم بـۆ خۆمـی وەردەگرمەوە.

* بەسەردان هاتبوومە سلێمانی، چونکە من لەهەولێر جێ نشین بووم. چوومە ماڵی خزمێکم کەناوی (جەلال عبدالرحمن شرف) بوو لەساڵی ١٩٩٢ لەپڕدا گەلاوێژ خان هاتە لایان بەسەردان ڕووم کردە گەلاوێژ خان.

وتم: ئێستاش نـازانم هـۆی چـی بـوو کـەدلارات بەکوشـت دا؟ بـڕوا ناکـەم بەئاسانی ئەم سیاسەت مەدارە ئاوا بێتە ژێر پەتی قەنارە.

(جەلال عبدالرحمن شرف): پلـەی ئەفسـەر بـوو، خـەڵکی (کۆیسـنجاقە)، ئـازا، زیـرەك، خوێنـدەوار،نیشـتمان پـەروەر،سیاسـەتمەدارێکی کـورد، لەبنەماڵەیەکی نیشـتمان پـەروەر و زانـا بـوو، مـامی (مـەلا صدیـق عبـدالله) سەرۆکی دادگای ناوچەی (کەرکوك) و (سلێمانی) و (هەولێر) بوو ئێسـتاش باسی شارەزایی دەکەن.

● جارێکیان چوومە لای خوشکم بدریـە لەقـەلادزێ، دیتـم خواردنێکی زۆر دروست کـراوە سـەرنجی ڕاکێشـام پرسـیارم کـرد مـەولودی پێغەمبـەرە، یاخود گەرەکێکتان دەعوەت کردووە؟

خوشـکم وەلامـی دامـەوە ئـەو خواردنـەی کـە دروسـتمان کـردووە بۆاسـتخباراتی عەسـکەرییە چونکـە لێرە بۆتـە عـادەت چـەند مـاڵێك بـەم شێوەیە خواردنیان بۆ دروست دەکەن.

وتم ئەمـەیان لێ تێـك دەدەم ژەهریـان بـۆ دروسـت دەکـەین، ئێـوە ماڵـە قەسابن چیتان لەوە داوە، ئەمانە دوژمنی کوردن پیاو خراپ و دزو ماڵوێرانی کوردن کەبەسەردان دێمەوە بۆ ئێرە ئەیان بینـم دەپاڕێنـەوە لـەمن کـەڕۆژێك نانێکیـان لەگـەڵ بخـۆم ئێسـتاکە بەتەلـەفۆن ئاگاداریـان دەکەمـەوە دەڵێـم ئێوارەکەی لای ئێوە دەبم بۆ نان خواردن و لەدواییدا ناشچم.

یـەکێك لەسـێخوڕەکانی اسـتخباراتی قـەلادزە زۆر بـەگرژیو زۆر بەشێوەیەکی نارێك وپێك توانجی لەئافرەت دەگرت بەنهێنی ئاگاداری بـراو برازاکانم کـرد، دەڕۆم بـۆ (کۆیسـنجق)، لـەم ماوەیەدا شـەڕێکی بـۆ دروسـت

بکەن، باش دارکاری بکەن، لەناو سینەما باشیان لێدابوو کراسەکەیان دڕاندبوو. کەئاگاداریان کردمەوە بەیانییەکەی هاتمەوە قەلادزێ، پێش هاتنەوەم ئاشتیان کردبوونەوە، داوام لەبەشی زۆری پیاوە مەعقولەکان کرد کەزۆر بایەخ نەدەن بە (تەنامەکانی ئستخباراتی عەسکەری و ئاسایش)؛ تکام وایە بەو شێوەیە ڕێزیان لێ نەکرێ.

- بەعس دەستی کرد بەگرتن و ئازارو ئەشکەنجەو دوور خستنەوەو گواستنەوە بۆ جنوب ٤١ خێزانیان گواستەوە بۆ جنوب.

لەسلێمانی بووم کەئەم دەنگ وباسەم بیست چوومە ئاسایشی گشتی سلێمانی بەدوورو درێژی باسی سلبیاتی ئەم هەڵوێستەم کرد، وەلامیان دامەوە کەئەم فەرمانە لای ئێمە دەرنەچووە و بەڕاستی دانانێن. بەلام ئەمە لەسەرەوە کراوە، ئەمانە کوردایەتی ئەکەن، خەڵک هان ئەدەن، خەتەرناکن جەماوەر هان ئەدەن، دوارۆژ زۆر خراپە بۆ بەعس. لەگەڵ تایەری عەبە پشی بەیەکەوە چووینە بەغداد کاتێك گەیشتینە ئاسایشی گشتی ئەو (تایەر) لەناو ئوتومبێلەکە مایەوە منیش یەکسەر چوومە لای بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی.

وتم: لەسلێمانی بووم کەئەوەم بیست کە ٤١ کوردی نیشتمان پەروەرتان دوور خراونەتەوە بۆ جنوب، ئایا هۆی چییە لەم بارودۆخەی ئێستاکە ئەمە بەزەقی نیشان ئەدەن؟ کەڕوونی دەکەنەوە نیازتان خراپە بەرامبەر بەکورد؟ دوژمنانتان لەم کارە سوود بەخش دەبن؟ پڕوپاگەندەی پێئەکەن دژی بەعس کاتێك ئەمەم بیست زۆر دڵتەنگ بووم، چونکە ئەمە متمانە دروست ناکات لەنێوان بەعس وکورد لەهەمووی ناخۆشتر بۆ من لەناو ئەو ٤١ کەسەی کەدوور خراونەتەوە یەکێك لەوانە کەنزیکترین دۆستمە برایەکی دڵسۆز و خۆشەویستە ئەمە لەخۆیدا بۆ من وەکو سووکییەکی گەورەیە لەبەرچاوی خەڵك، کەنەتوانم بەخزمەتی هەستم بەرامبەر ڕوودلوێك کەئەویش زیان دەبەخشێ بەبەعس لەهەمان کاتدا ماهیەتی من کەم دەکاتەوەلەناو کورد کەدەسەلاتم نەبێت بۆ پووچەڵ کردنی ئەم بڕیارە وتی: ئەمە بەفەرمانی مەکتەبی بەڕێوەبەری شمالە من هیچ دەسەلاتێکم نییە، بەلام ڕاپۆرتێك بنووسە لەسەر ئەم ٤١ خێزانە کەدوور خراونەتەوە بۆت ڕەوانە ئەکەم وەکو

دەقی خۆی. هەروەها ڕای بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی خۆم بەدوورو درێژی باسی ئەم هەنگاوە پیرۆزەی تۆ ئەکەم.

## تێبینی:

ڕاستی یەکەی تێگەیشتم و شارەزا بووم کەدەستێکی گەورە هەیە لەناو بەعس دەجوولێتەوە بۆئەوەی جەماوەری کورد ماهیەتی بەعس بناسێت کەئەمە هەڵوێستی بەعسە.

(ابراهیم حمە خورشە)، دانیشتووی سلێمانی، کاسب،ئازا، نیشتمان پەروەر،پاك.

● هاتمە سلێمانی چوومە ماڵی بەڕێوەبەری ئاسایشی سلێمانی (ابو ریم)، پێم ڕاگەیاند کەلێرە دەرناچم هەتاکو ئەم سێ مرۆڤە بڕیاری بەردانیان نەدەیت. لەژووری (ابو ریم) دانیشتم هەرسێکیان هێنانە ژوورێ بەونیازەی کەوا بەریوون وتم لەخودابەزیاد بێت کەئەم ئامادجەم هاتەدی، کەدانیشتن دەستم درێژ کردە سەر حەمە سووری مینە عرب وتم: (ابو ریم) من زۆر قەرزداری ئەم پیاوە مەزنەم ئەو مامۆستامە لەوەوە زۆر شت فێربووم، ئەمە مرۆڤێکی نیشتمان پەروەرەو دڵسۆزە،شایانی باس کردنە لەهەموو ڕوویەکەوە، هەروەها لەناوچەکەی ئێمە زۆر ناسراوە، لەکۆتایی چلەکاندا ڕێگای پیشان دام ئەو کاتە من تەمەنم ١٦ساڵان بووە ئێستاکە ناوبراو وازی لەسیاسەت هێناوە، بەڵام منی تووش کردووە ئەوا ئێستا لەخزمەت بەعس دام. ئینجا دەستم درێژکرد بۆ (حاجی کاکە الله) پیاوێکی کاسبە، دۆستێکی دێرینی باوکم بووە هیچ پەیوەندی یەکی بەسیاسەتەوەنی یە تەنها بۆی دروست کراوە.

ئەوەی کەسێ‌هەمیشە، (ئاغا غفوری نجیم) یان پێ وتووە هەتاوەکو بۆی کراوە خراپەی ئێمەی کردووە ئەوەتامن دەبمە هۆی بەردانی ئەگینا ١٠ تا ١٥ ساڵ حوکم دەدرا، بەڵکو لەمەولا ئەگەر دەستی ڕۆی خراپە لەگەڵ‌نەکات وە هەروەهامی خەڵك دڵنەکات.

- لەهەمان كات (عەلی حسن ئاغای) سەرۆكی هۆزی (مەنگوور) خاوەن دێی‌شەروەتە، لەگەڵ (بایز ئاغای) برای گیرابوو و، ئازارو ئەشكەنجەیەكی زۆریان دابوون توانیم بەریان بدەم.

علی حسن اغا: سەرۆكی عەشیرەتی مەنگوڕە- عاقل- زیرەك - دەوڵەمەند، قسەخۆشەكانی بەشێكی زۆری خەڵك لەبەری كردووە.جارێكیان (محمد زمام) كاریەدەستی بەعس لەسلێمانی ئەچێتەگوندەكەی قسە بۆ دانیشتوانی دێكەدەكات ئەڵێ ئێمەی بەعس بەم جۆرە خزمەتی ئێوە دەكەین بەتایبەتی جوتیارەكان وخاوەن ئاژەڵەكان، حەوزێكتان بۆ دروست دەكەین مەڕەكانتان ساڵی دوو جار ئەیخەنە ناو حەوزەكە پاك دەبێتەوە هیچ نەخۆشی‌یەكی نامێنێت، ئەو دار بەڕووانەتان بۆ دەكەینەفستەق چۆنیەتی جۆری توتنەكەتان دەگۆڕین بەجۆرێك باروبۆخی ئێوە دەگۆڕین كەجێگەی سەرسوڕمان بێت.

(عەلی حسن ئاغا) وەڵامی ئەم فشەو درۆیەی (محمد زمام)ی بەشێوەیەكی تر باس دەكات، كاتێ قائمقامی قەڵادزە وەكو خۆی پێنیشان نادات، واتە ووشەكان وەكو خۆی دانی پیادا نانێت هەڵی دەگێڕێتەوە، لەگەڵ خۆم بردمە لای بەڕێوەبەری ئاسایشی سلێمانی، بەتەلەفۆن داوام لە(محمد زمام) كرد هاتە لامان و ووشەكانی خۆیم گێڕایەوە كەسوخنرانیت كردووە لەدێی شەروەت وە (عەلی حسن ئاغا) وەڵامی داویتەوە وەكو خۆی دەقی قسەكانی (عەلی حسن ئاغا) یان پێ نەوتبوویت ئەمە ڕاستی‌یەكەیەتی:

(عەلی ئاغا) دەڵێت: پیاوێك لەگوندەكەی ئێمە لەگەڵ دایكی نەژیان ژنی نەهێنابوو ناوی (نەبی) بوو خەڵكی گوندەكە چەند جار ئاگاداری دایكی (نەبی) یان كردبۆوە كەئەچن بۆ دارهێنان و گەلای بەڕوو هەرچەندە (نەبی) كەرێكی پێدەبێت خۆشی باری دووكەر ئەخاتە كۆڵی ڕۆژێكیان نەبی ناگەڕێتەوە دایكی (نەبی) دەست دەكات بەشیوەن وگریان خەڵك ئەچنەوە شاخ بەیانی‌یەكەی ئەیدۆزنەوە كەبارەكەی لەكۆڵ باردەكا هەڵناسێتەوە تاكو گوو بەخۆیدا دەكات.

علی ئاغا ووتبووی ئەترسێم بەعسی‌یەكانیش بارەكەیان ئەوەندە زۆر لەكۆڵ كەن ڕۆژێك دێت ئەوانیش گوو لەبن خۆیان بكەن. بەداخەوە علی ئاغا كۆچی دوایی كردووە ئەگینا پێم دەگووت قسەكانت ڕاست دەرچوو.

*حەمەی مەلاشریف: کوێخایەکی مەنگوڕە، خاوەن دێی سوورەکوڵێیە، سەخی، ئازا، پیاوێکی لەسەر تەنگ وچەڵەمەی زەوی کوشت کەخەڵکی دێی شێنێی خۆشەویست بوو، لەم کاتەشدا کەس چەکی پێ نەبوو ئەوەی مابووشی شاردبوویەوە لەماڵێ، یان لەژێر گڵ وبەرد. بەئاشکرا کەس بۆی نەبوو چەك هەڵگرێت. پۆلیس و سیخوڕو ئیستخباراتی قەڵادزە و ڕانیە کوون بەکوون گرد بەگرد وشاخ بەشاخ دەگەڕان بەشوێنی‌دا بۆئەوەی بەزیندوویی بیگرن، لەناوشاری سلێمانی لەسێدارەی بدەن وای لێهات خەڵك بەنهێنی یارمەتی بدات، بوو بەبنێشتە خۆشەی بن دانی خەڵکی، هەتاوەکو دەهاتمەوە قەڵادزێ ئەم باسەیان بۆ دەکردم گەیشتمە ئەوەی بایەخی پێ بدەم سەرنجی ڕاکێشام. ڕۆژێکیان من و مامۆستا مەلا محمد دەڵکەیی دوو بەدوو باسی باروبۆخی ئێستای میللەتی کوردمان دەکرد کە لەدوای هەرەسەکەوە ئەمە یەکەم جارە پیاوێك ڕوویکاتە شاخ لەسەر کوشتن بەم جۆرە خەڵك ڕۆژانە باسی بکات. لەکاتێکدا هیچ پەیوەندی‌یەکی بەسیاسەتەوە نەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو برا ئازیزەم ڕای خۆی‌خستە بەرچاوم کەمانی حەمەی مەلا شریف سوودی لێوەردەگیرێت ئێستاکە سیخوڕو پیاوەکانی بەعس هەوڵی کوشتنی ئەدەن، ئەگەر بتوانیت ئەم پیاوە ڕزگار بکەیت هەروەکو خۆی بمێنێتەوە وەڵلاهی سوودبەخش دەبێت ماوەیەك پێش ئێستاکە منیشیان ڕاسپارد لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە کەبچین بیهێنینەوە، منیش بەنهێنی‌یەوە وەلامم بۆ دەنارد کەئێمە نەبینێت حکومەت نیەتی خراپە.

وەلامم دایەوە مامۆستا ئەوە پیلانێکی ئێجگار ڕێك وپێکی دەوێت دلڕشتنی ئەبێت بناغەیەکی هەبێت.

مەلا محمد دەڵکەیی: خەڵکی پشدەرە -لەبنەماڵەیەکی ئایینی‌ناسراوە، سیاسەتمەدارێکی کوردە، خوێندەوار، زیرەك، ئازا، پاك، نیشتمان پەروەر دڵسۆز بۆ نیشتمانەکەی، گیرا ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر درا.

● بۆ مەسەلەی حەمەی مەلا شریف بەم جۆرە جووڵامەوە، چاوم بە قائمقام و ئاسایش و ئیستخبارات و هەروەها ڕێکخراوی بەعس کەوت لەقەڵادزێ، هەروەها بەڕێوەبەری ئاسایشی سلێمانی وە پارێزگاری سلێمانی و ئیستخباراتی سلێمانی باسی حەمەی مەلا شەریفیان لەگەڵ کردم، بەدوورو

دزێژی ئەو هەوڵدانـەی بەنـهێنی، یـان بەئاشـکرا ویسـتوویانە بیکـەن بـۆ ئـەم مەرجە ئاگاداریان کردمەوە.

● راپۆرتێکــم ئاراســـتەی مەکتـــەبی کارویـــاری شمـــال کـــرد کەسەرۆکی ەکەی (صدام تکریتی) بوو دەربارەی حەمەی مەلا شریف ئەم نووسی: دوای هەرەسەکە ئەمە یەکەم رووداوە لەناوچەی قەلادزەو رانیە وە ئـەڵێن سـلێمانیش، کەئـەڵێن چەکدارێك بـەخۆیی و کوڕەکـانی ژمارەیــان وا خەریکە دەگاتــە ١٠ کـەس، ڕوویـەڕووی حکومـەت ڕاوەسـتاوون هـەتاکو ئـەم سـەعاتە کاریەدەسـتانی پارێزگـاری سـلێمانی و ئاسـایش و ئیسـتخباراتی عەسکەری وە بەهەموو ڕێکخراوەکانی بەعس نەبەگرتن و نەبەکوشتن هیچیان بۆ نەکراوە ڕۆژانە ئەمە لەزیادی دایە، ناویان ناوە کوێخا ڕینگۆ ئەڵێن حـەفتا هـەزار پێشـمەرگە هەرەسـی هێنـا وا خەریکـە ئـەم ١٠ کەســە بچنـە چـاوی حکومەت.

فەوجێك پۆلیـس و بـەیاریدەدانی سریەیەك عەسـکەری لەشـاخی قـەندیل دەگەڕێن بەشەوو بەڕۆژ لەو بەردە بۆئەم بـەرد ڕادەکـات خـۆی دەشـارێتەوە ناگیرێت جارجاریش تەقەیەك دەکات جا ئایا گوولەی ئەوە یان هـی ناوخۆیـە پۆلیسێك یـان عەسـکەرێك زامـدار دەبێـت مـن وای بـەباش ئـەزانم ئەمـە بـەم شێوەیە بمێنێ خەتەرناکێکی گەورەیە بەهێزی سەربازی چارەناکرێت چونکە شوێنی دیاریکراوی نی‌یە خۆی نادات بەدەستەوە شــەوانیش لـەم دێ بۆئـەو دێ جەماعەتەکەی پشوو دەدەن وە بـەڕۆژیش لەشـاخ خـۆی دەشـارێتەوە و وەبـەدووربینیش چـاوی بڕیوەتـە ئـەو شـوێنەی کـەپۆلیس و سـەربازی لێیــە بەهۆی ئەوەی لەناو گەنجاندا باس دەکرێت کەمرۆڤێکی ئازایە ئاگای لەهەموو شتێك هەیە، من ئەگەر فــەرمانتان لەسـەر بێـت لـەرێگای خۆمـەوە ئـەچم بـۆ دیتنی بزانم ئەمە چی‌یە؟ سیاسی‌یە؟ ئایا بەکرێگیراوە؟ چەتەیە، پیاو کوژە، چی دەوێت؟ هەتاکو لەراستی‌یەکانی تێبگەم، ئەو کاتە بەگوێرەی باروبۆخی ئێستاکە و هەڵسەنگاندنی مەسەلەکە ئەتوانم ڕاسـتی‌یەکانتان بخەمـە بـەرچاو ئێستای ئێمەی تێدا دەژین گەلێك ئاسانترە لەبەیانی بەمەرجێك ئەگـەر ئەمـە سـەر بـەدەرەوەی وڵات نـەبێ، چونکـە وا پروپاگـەندە هەیەکـەگوایا لـە دەرەوەی وڵات (ئێران) یارمەتی دەدرێت.

● ئاگاداریان کردمەوە کەصدام تکریتی دلوات دەکات:

کاتی دیاری کراو چوومە خزمەتی، دوای بەخێرهاتنم فەرمووی کارێکم هەیە لای تۆ.

وتم دوارۆژی دونیایە جەنابی (سید نائب) کارێکی هەیە لای من.

وتی: ان شاء الله جێبەجێ دەبێت.

وتم: ان شاء الله.

وتی: ئەمەوێت لەگەڵ من کار بکەیت.

وتم: ببم بەشۆفێر یان پاسەوانی تایبەتی.

وتی: شۆفێرم بۆچییە، پاسەوانم بۆچییە؟ ئەمەوێت لەگەڵ خۆم ئیش بکەیت.

وتم: من لەدایك و باوکێکی کورد هاتوومەتە دونیاوە، کاتی خۆی پێشمەرگە بووم، مخابراتی دەوڵەتە ئیقلیمیەکان ناووم دەزانن، ئایا ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی پێستم بچێتە دەباخانە ئایا دەمپارێزیت؟

وتی: ئەتپارێزم.

کەهاتمە دەرەوە لەخۆشی دا دەستم کرد بەگریان، خۆم بەخۆم ووت رەفیق هەتاوەکو ئێستاکە لەرێگای بەرێوەبەری ئاسایشی گشتی، یان وەزیری ناوخۆ، یان استخباراتی عەسکەری راپۆرتێکم ئاراستەی (سید نائب) دەکرد، ئێستاکە شکوور بۆ یەزدانی گەورە دەرگای یەکسەرم بۆ کرایەوە بتوانم خزمەتکاری کورد بکەم، بەجۆرێك دڵخۆش بووم وام زانی دونیا پێشەکی زۆری هی منە.

● دوای ١٥ رۆژ ئاگادار کرامەوە کەبۆچوونەکانت هەمووی پەسەند کرا دەربارەی چۆنیەتی گفتوگۆکردن لەگەڵ (حەمەی مەلا شریف). بەیاوەری شەفیق وحەسەنی برام چوومە لای کوێخا قادرو کوێخا خدر کەئەمانە خزمێکی نزیکی حەمەی مەلا شریفن، دۆستایەتی و ناسیاویەکی رابردووی زۆریان لەگەڵ بنەماڵەی ئێمە هەیە، ١١ رۆژ لەو شاخ بۆ ئەم شاخ دەگەراین چ بەپێ، یان سواری ئێستر تاوەکو چاومان پێ بکەوێت وە هەندێك جار هانیان دەدام کەبگەرێمەوە لەشەوی ١٢/١٣ ی مانگی ٤ی ١٩٧٦ لەکەناری شاخی قەندیل لەژوورێکی تاریك چاومان بەیەکتر کەوت، من و دوو براکەم ئەوو کورەکەی، پێنج کەس ماینەوە بەتەنها.

لەبارودۆخێکی یەجگارناخۆشدا بــوو لەهــەموو ڕوویەکــەوە نــەیدەزانی دۆستەکانی یا دووژمنەکانی بەتەواوەتی دەستی بخاتە سەریان، متمانەی زۆر زۆر کەم بوو تەنها باوەڕی بەم چەند کەسانە بوو کەلەگەڵی دەژین، دوای گفتوگۆیەکی دوور و درێژ بەکورتی بەوەندەی پێم وت ئەتەوێت ڕێزێك لە ڕێزان خەڵك دەستت بۆ درێژ بکەن، پێتین ئەمە یەکەم مرۆڤ بوو کەچەکی هەڵگرت لەدوای هەرەسەکە، لەناوچەی پشدەرو ئاکۆ خەڵك بەپیرتەوە بێن؟ ئەگەر ئەتوانیت قسەی من نــەدرکێنیت سوێندت دەدەم بـەقورئان و تـەڵاق، ئینجا ڕێگات بۆ دادەنێم بەبێ من هیچ شتێك ناکەیت.

ووتی: مـن یەکـەم جـارە تـۆم دیبێـت بـاوکت بـاش دەناسم و شـەفیق و حەسەن باشتر، وا چەکەکەم دانەنێم، بمکوژە یا تەسلیمم بکەوە بەحکومـەت چیت دەوێت چی بکەم ئامادەم توانای ئەم ژیانەم نەماوە.

وتم: هەر کەسێك بەناوی منەوە نامەی بـۆ هێنـایت لێی وەرمەگرە، بڵێ چونکە من خوێندەوار نیم، هەرکەسێك پێی ڕاگەیاندی بەزمانی منــەوە وەرە، تەلاشێ، یان وەرە ڕانیە، هەر شوێنێك بێت بەقسەی ئەو نەکەیت، هەتاوەکو ئەگەر خۆشم یان حەسەن و شەفیق هاتن لەئێستا گەلێك زیاتر ئاگات لەخۆت بێت.

ئەوانـەی هاتوچۆیـان کردوویـت وە ئەوانـەی لـەماڵیان بوویت حکومەت ئـەیزانی، بـەڵام داواکـاری حکومــەت ئەوەیــە کەبـەزیندوویی بتگـرن و لـە سلێمانی لەسێدارەت بدەن، لە دوای خۆم تەنـها بـاوەڕت بـە مامۆستا مـەلا دەڵگەیی و (کوێخا قادرو کوێخا خدر) و (شـەفیق و حەسـەن) بێـت، ئەمانـە جێی باوەڕن، بەڵام وریا بە کـەدێن بتبینـن کەسیان لـەدواوە نـەبێت نـەبادا بتکـوژن، سـەعات ٨ی شــەو چ کوێخایــەکی مــەنگوری ناوچەکــە خزمــەتی نەکردوویت یان خراپەی کردوویت ئەمەم بۆ دەست نیشان کە.

ووتی: (کوێخا – فلان)

هەمان شەو وەڵامم بۆ ئەو کوێخایە نارد کەسبەی نیوەڕۆ بۆ نان خواردن میوانی دەبم و ٢٠ کەسم لەگەڵە، وتم سـبەینێ کاتی نیـوەڕۆ چاوەڕوانم بـن، کەدێم.

بەیانییەکـەی سـەعات (٩) گەیشــتمە دێی نــاویراو، ســەعات یــانزەش (حەمەی مەلا شریف) بـەخۆیی و جەماعەتەکـەی بـەرەو دێ هـاتن، یەکسـەر

دانیشتوانی دێیەکە سەریان سوڕما ئاوا بەئاشکرا ڕوو دەکاتە دێیەکە بەپیریەوە چووم دەستمان خستە ناو دەستی یەك چووینە سەریان بەیەکەوەڕاوەستاین بەکورتی چەند قسەیەکم کرد.

وتم: ئەوەی ڕێز لەم پیاوە بگرێت و میوانداری بکات ڕێز لەحکومەت دەگرێت، ئەمە حەمەی (مەلا شریفە)، پیاوێکی ناسراوی ناوچەکەیە، جێ باوەڕی حکومەتە خەڵکینە ئێوەو ناوچەکە من باش دەناسن من لەسەر فەرمانی جەنابی (صەدام تکریتی) یەوە هاتووم، ئەم پیاوە مەزنە بۆی هەیە بەچەك بسووڕێتەوە وەهاتوچۆ بکات تەنها بۆ ئەو قەدەغە نییە کەچەك هەڵگرێت.

نەنە باران دەباری پاڵتۆکەم شتێکی زۆرنایاب بوو لەلایەکی کەشەوە دیاری ئەم پیاوە ئازیزو مەزنە ج (ەنابی بابا علی شێخ مەحمودی نەمر) بوو زۆر لام بەنرخ بوو، کەمن پاڵتۆی ئەم زاتە گەورەیە ببەخشم، لەبەر حەمەم کرد، ئینجا هاتمە بارەگای پۆلیس و عەسکەری لەگوندی سورە گوڵێ دێ (حەمەی مەلاشریف)، لەوێوە بروسکەیەکم ئاراستەی مەکتەبی (کاروباری شمال) کرد کەکوێخا (حەمەی مەلا شریف)م دی و گفتوگۆمان کردو سەرکەوتوبووم، بەئەفسەرو پۆلیسی گوندی سورە گوڵێم وت: لەگەڵ دانیشتوانی دێیەکە زۆر ناشیرین جوڵاونەتەوە ئەمە ڕێبازی بەعس نییە ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆری خەڵکتان داوە و لەگەڵ ئافرەتانی گوندەکە ناشیرین جووڵاونەتەوە.

گەڕامەوە بۆ بەغدا: ڕاپۆرتێکم نووسی، حەمەی مەلا شریف هیچ پەیوەندییەکی بەدەرەوە نییە، ئێرانییەکان ویستوویانە ڕایان کێشن بۆ لای خۆیان. بەهیچ جۆرێك چاویان پێنەکەوتووە، پیاوێکی سیاسی نییە، کاسبی ماڵی خۆیەتی. پێم ڕاگەیاند تۆ چۆن بە ١٠ چەکدارەوە ئەتوانیت بەرەنگاری بەعس ڕاوەستیت لەئەنجامی گفتوگۆ و قسەکردن مل کەچ بوو، ئەبێتە یەکێك لەدڵسۆزەکانی بەعس، دواڕۆژ دەبێتە پاسەوان ئێستاکە هەنگاو بەهەنگاو لێی پچینە پێشەوە، لەدواڕۆژدا وادەکەین بکاتە بەردەمی دانگا، بەڵام ئێستاکە باوەکو خۆی بمێنێتەوە لەفلان دێ یە قسەم بۆ خەڵك کرد کەئەمە دڵسۆزێکی بەعسەلەم ڕووەوە سەریەستە.

ئەوانەی کەڕۆژانە ئاگاداری ئیستخباراتیان کردووە کەچۆن چۆنی بجوولێنەوە، ئێمە ئامادەین بیکوژین، هیچ کامێکیان ڕاستیان نەکردووە ڕۆژانە ئاگاداری حەمەی مەلا شریف یان کردووە.

ڕەئی مەکتەبی شمال: لەسەر هەموو بڕیارەکانی من ڕازی بووین داوایان ئەکردم ئەبێت ئامەش بکەیت کەمەنگایت بۆ ئەمانە (صلح العشائر) لەنێوان حەمەو کەس وکاری کوژراو ئاشتبوونەوە بکرێت.

**تێبینی:**

١- وا بڵاوبۆوە کەڕەفیق پشدەری ئەمەی بەپیلان کردووە بۆئەوەی بەکوشتی بدات و پارەی پێ وەربگرێت.

٢- تەنها ڕاستییەکەی (کەمال) و (حەسەن) و (شەفیقی) برام و (مەلا دەلگەیی) و (عمر دەبابە) و (عەلی عەسکەری) و (دکتۆر خالد حمە سعید) و (ابراهیمی حمە خورشە) و (ئەنوەری جەمیل بەگی جاف) و (حەمە سووری مینە عرب) و (بابکر ئاغا) و ئەمانە دەیان زانی کەمەبەستی من ئەوەیە کەدوارۆژ هێزێکی چەکدار هەبێت کەبریتی بێت لەقاعدەو بنکەیەکی پێشمەرگە.

● نیسان هاتمەوە قەلادزێ، چاووم بەحەمەی مەلاشریف کەوت وامکرد مانگانە مقداری ٢٠٠ دیناری بۆ ببڕنەوە، کەاعتبار دەکرێت بەوەی کەوەکیلی ئەمنە، هەروەها چاووم بەکوێخا خدری دۆڵی شێنێ کەوت بۆ ئاشتبوونەوە مقدارێك پارەم بۆ سەرف کردن. باشم لەبیر نییە ئایا ١٥٠ دینار یان ٢٠٠دینار بوو، قاتێك جلیشم کرد بۆ کوێخاکەی شێنێ کرد.

● دۆڵی شێنێ: دانیشتوانی ئەو دۆڵە بەشێنێیی ناودەبرێن، واتە هۆزەکەیان بەناوی شێنێیی، وەك کەچۆن دەڵێن هۆزی (جاف) یان هۆزی (هەرکی). وورده وورده دانیشتوانی ئەودۆڵە لەبەرئەوەی زەوییەکەیان تەسکە بەو شێوەی کەزیاد دەکەن جێنشینی هەموویان نابێتەوە، کەم کەمە ڕوودەکەنەناوهۆزی مەنگوڕو مامەش و سوێسنی، چ لەکوردستانی عێراق یان کوردستانی ئێران.

بەڕاستی لەهەموو ڕوویەکەوە شایانی باس کردنن ڕۆشنبیران و شاعیرەکان چەند بنووسن لەسەر شێنێی هەرکەمە، چونکە نیشتمان پەروەرو فیداکارن، یەکەم ناوچەیە حکومەت نەیتوانی دەست بەسەری دا بگرێت بۆ ڕاگوێزانی و گواستنەوەی.

شێنێ دەروازەی شۆڕشی تازەیە کەدەستی پێکردووە، دەنگ وباسی جەنەراڵ بەفر زۆر لەشوێنان باس دەکرێت، بەڵام دەوری هەرە گەورە شێنێی هەیبوو لەو فیداکارییە لەپاڵ ئەوەشدا ئەو بەفرەی کە باری بەو شێوەیە سوپای عێراقی چەواشە کرد.

خۆشحاڵی خۆم دەردەبڕم کەتوانیم ئەو دوو دێڕە لەقوڵایی دڵمەوە بیخەمە سەر نامیلکەکەم هەرچەندە لەسەر ئەوان کەمم نووسیوە.

## لەمانگی تەموزی ١٩٧٦ ڕۆیشتم بۆ بەیروت:

بەو ناوەی کەپێویستی پشوودانم هەیە، لەو هاتووچۆیانەدا ماندوو بوویووم. دەست بەجێ کەگەیشتمە بەیروت تەلەفۆنم لەگەڵ مامۆستا ابراهیم احمد کرد، کەئەوە ناونیشانمە و ئەمەوێت لەڕێگای خۆتەوە ئاگاداری (مام جەلال) بکەیتەوە هاتنم بۆ ئێرە مەبەستم لەبینینی بووە و بەتەواوەتی جێگاکەیم نەدەزانی ئەگینا لەبەغداوە دەچوومە ئەو شوێنەی کەئەو لەوێیە.

دوای ٢٤ ڕۆژ بەسەر تەلەفۆنەکەدا، ئێوارەیەك تەلەفۆنەکەم هەڵگرت بەدەنگ یەکترمان ناسیەوە، مام وتی بێ دواکەوتن هەرئێستا بەپەلە وەرە بۆ ئەم ناونیشانە، چاوەڕوانتم، ئەگەر دوابکەویت نام بینی. منیش چووم بۆ شوێنی دیاریکراو.

زۆرم چاوەڕوان کرد، ماندووبووم ئەوەندە ڕاوەستام، دۆندرمەیەکم خواردو دانیشتم، لەپڕدا دوای ماوەی ٤٠ دەقیقە بەئوتومبێلێکی بیجۆی سپی، بەژمارەیەکی سوری ڕاوەستا، دەرگا کرایەوە و منیان سوار کرد لەم شەقامە بۆ ئەم کۆڵانە هەر هاتوچۆمان دەکرد و لەژێر چاودێری ئوتومبێلی دیکەش بوو دوای ئەوەی بڕوایان کرد کەبەتەنهام، ئینجا چووینە شوێنێکی تایبەتی دوو بەدوو دانیشتین دەستمان کرد بەگفتوگۆ، پرسیارم لێکرد ئەرێ

(مام جەلال) ئەم هەموو گەڕان و هاتووچۆیە چی بوو بەمنتان کرد؟ منت هێنابەپەلە خۆشت دوای ٤٠ دەقیقە هاتیت.

وتی: لەو ڕۆژەی تەلەفۆنت کردووە مامۆستا ابراهیم احمد و برادەران باسی ئەوە دەکەن کەپێشتنەکەت خەتەرناکە؟ ڕاستە بەنیو بشەری ناکوژێت، بەڵام حکومەت ئابلووقەی لەدەدان کاتێ [illegible] بەیەکەوە دەکوژن.

* (مام جەلال):

هەموویم لەبیر نەماوە بەباشی و پێویستیش ناکات هەمووی بنووسم، ئەتوانم بڵێم ١٠١ پرسیاری لێکردم، منیش لەیەکەم خاڵەوە، لەدوای هەرەسەکەوە ئەم باسانەی خوارەوەم بۆکرد بەکورتی:

١–غروری بەعس لەهەموو ڕوویەکەوە پێویست ناکات بەدرێژی باسی بکەم، دکتاتۆرەکەی (صدام) لەهەموو دکتاتۆرە ناسراوەکانی ڕابردوو، ئەتوانم بڵێم لەپێش هەموویانە وەیە لەپێش (هیتلر)یشەوە.

٢– بەشی زۆری ئەو کوردەی کەگەڕایەوە خۆی تەسلیم بەبەعس کرد، بەراپۆری دوورو درێژ هەموویان خستە سەر کاغەز تەسلیم بەکاربەدەستانی بەعسیان کرد (لەخودا بەزیاد بێت) ٩٨٪ ی نەخوێندرانەوە و خرانە پشت گوێ ئیتر تەنگ وچەڵەمەیەك نییە وە نابێت پێی بڵێن کێشەی کورد.

٣– دوای هەرەسەکە، ئەوانەی شان بەشانی حکومەت وەستابوون، ج سەرۆکی هۆزەکان، یان حزبە سیاسییەکان، یان پیاوە ناسراوەکانی کورد، ئێستاکە بەهیچ جۆرێك بایەخیان پێنادەن.

٤– بەشێوەیەکی ئەوتۆو ناشیرین تەماشای کورد دەکەن، کەهاوڵاتی دووەمە، لەهەندێ جاردا سێهەمە. چۆن کاتی خۆی پێش سەد ساڵ پێش ئێستا جیاوازی لەپێستی سپی و ڕەش کراوە لەئەمەریکا، بەعسیش بەهەمان شێوە تەماشای کورد دەکەن، بەڵکو کەمتریش، کورد خاوەن ماڵ ودارایی و خێزان نییە.

٥–هەڵوێست و جوڵانەوەیان باس ناکرێت. لەیەکەم ڕۆژی هەرەسەکەوە بە تەقدیری خۆیان وا دێتە بەرچاویان کەلە ٩٠٪ کوردیان لەگەڵە و لە ٨٠٪ی هاتۆتە ڕیزی بەعس، ئیتر بەئاشکرا ڕای خۆیان دەردەبڕن، دەڵێن: مەحاڵە جارێکی تر شۆڕش ڕووبداتەوە. کەوتوونەتە ناو کوردستان هەرچی حسابی

مرۆڤایەتی هەیە بۆی ناکەن. ڕۆژانە لەناو جەماوەر وا دەجووڵێنەوە بەو شێوەیەی کەکورد بۆی نییە خاوەن هیچ شتێك بێت.

بە(مام جەلال)م گوت:

لەم بارودۆخەی ئێستاکە بەجۆرێك ئاشکراو ڕوونە کەشۆڕش ئەم جارە دەست پێبکاتەوە بەهێزترین شۆڕش دەبێت.

هەروەها بۆ ئاگاداری لەناو دەزگای سەرۆکایەتی بەعس دا زۆر شت دەکرێت کە بەهیچ جۆرێك لەبەرژەوەندی ئەواندا نییەو هەر بەناوی (مجلسی قیادەی ثورة)وە فەرمانەکە دەردەچێت، ئینجا نازانم شۆڤێنییەکەیانە، یان دەستێك هەیە پێیان دەکات.

مام پرسیاری لێکردم وتی: هۆی چییە بەم شێوەیە تۆ پەلەی بۆ هاتنەوەی ئێمە؟

وتم: من لەڕاست خۆمەوە ئیتر چی دیکە توانای ئەم هەموو سیاسەتە شۆڤینییەی بەعس کەڕوویەڕووی کورد دەجووڵێتەوە، توانام نەماوە هیچی دیکە بەدەمیانەوە پێبکەنم و بەدرۆوە بڵێم ڕاست دەکەن. بۆ ئاگاداریت لەو ڕۆژەی شۆڕشم بەجێهێشت و هاتوومەتەوە پاڵ حکومەت بەهیچ جۆرێك بەم شێوەیەی ئێستا ڕێزم لێ نەگیراوە و دەسەڵاتم وا بەهێز نەبووە، ئەتوانم بڵێم هەر چیم بوێ بۆم دەکەن، (صباح میرزا) و (بارزان تکریتی) وتیان خۆزگەم بەخۆت کەبەم جۆرە دەسەڵاتت هەیە.

دوو کەس نەبێت (بکر) و (صدام) بەکات ئەچمە لایان، دوای ئەوان هەموو وەزیرەکان و کاربەدەستان بەبێکات دەتوانم بیان بینم چیم دەسەڵات بێیکردووم لەهەموو جۆرە یارمەتییەك، ئینجا هەندێکیان پارەشیان دەدەمێ یارمەتی لەکەس قبووڵ ناکەم، بەڵام من ئێستاکە بەختەوەر نیم کەدەبینم و ئاگادارم کە(بکر) و (صدام) چیان نیازە لەپیلانیان بەکاری بهێنن بۆ نەمانی کورد.

مام وتی:

ماویەتی، بایەکلا ببێتەوە، هێشتاش خەڵك باشیان ناناسێت، باهەموو کورد لەبەعس شارەزابێت.

مام وتی: ئێمە وا حزبێکی سیاسیمان دانـاوە بەناوی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە، ئێستاکە لەسوریا مەشق و ڕاهێنانی سەربازی دەکەین بۆ

ئامادەبوون و گەڕانەوە ولآت، بەلآم یەکەم، تۆ ئەم کارەم بۆبکە هەرچەندە ئیش وکاری تایبەتی من ناکەی. دووجار دووبارەی کردەوە وتی کارەکەی من ئەوەیە ئامۆژگاری صدام نەکەی.

وتم: مەترسە ئەو کەری دێزەیەو ئامۆژگاری کەس قبولّ ناکات، هەتا هی من قبولّ بکات.

وتی: حەز دەکەم بەیەکەوە سەرێکی سوریا بدەین لەگەلّ من بەم ئوتومبیلە بەهیچ جۆرێك تەماشای پێناس (هویە) ت ناکەن.

وتم: خۆشم پێم خۆشە، بەلآم ئەمە زۆر خەتەرناکە.

هەروەها پێم وت: هەلّوێستی ئێوە تێگەیشتم، خۆشحالّی خۆم دەردەبڕم و من لەئێستاوە ئامادەم و هەموو فەرمانەکانتان لەسەرچاو دادەنێم.

مامە، ئەوپەڕی ڕێزو سلآوم بگەیەنە بەمامۆستا ابراهیم احمد و گشت ئەو برا دلّسۆزانەی کەشان بەشانی ئێوە وەستاون. هەمووکوردێکی دلّسۆز و بەشەرەف و نیشتمان پەروەر، وەکو چۆن چاوەکانی خۆی دەپارێزێت، بەم شێوەیەش پشتگیری لەم حزبە تازەیە دەکات، (ان شاء الله) سەرکەوتوو دەبن.

پرسیارێکم هەیە: چیت پێ سپاردووم دلّنیا بە ئەنجامی ئەدەم.

ئایا ئیتر بە یەکجاری بەگژ بەعسدا دەچنەوە؟ هیچ مەجالێکی تێدا نییە ئاشتیبێتە ناوەوە؟ چونکە من زۆر بەئاسانی ئەتوانم ڕووبەڕوو لەگەلّ صدام قسەی تێدا بکەم، ڕێگام پێ ئەدەیت لەم خالّە بجوولێمەوە؟ تکام وایە بەگەورەیی خۆت بم بەخشیت.

ووتی: کەی ئەمە بەشەڕ تەواو دەبێت؟! دوا ڕۆژی هەر گفتوگۆیە، بەلآم لەصدام زۆر دوورە دان بەمافی کورد دابنێ.

گەڕامەوە بەغداد و چاوم بەو برادەرە ئازیزانەو (شۆڕشگێڕو نیشتمان پەروەر و سیاسەتمەدارانی کورد) کەوت لەوانە (عەلی عەسکەری) و(عمر دەبابە) و (دکتۆر خالید) و (حمە سعید) و (مسعود محمد) و (محمد حاجی طاهر) و (عەلی مام رزا).

مەسعود محمد: دوای ئەوەی بەدوورو درێژی قسەم بۆ کرد دوو بەدوو لەمالّی خۆیان لەبەغداد وتی:

لەلایەکەوە خۆشحاڵی خۆم دەردەبڕم کە بتوانم لەم ڕووەوە خزمەتێك بکەم بۆ نیشتمانەکەم، بەتایبەتی لەم بارودۆخەی ئێستادا.

وتی: ئەتوانی بەزووترین کات بەپەلە بچیتەوە بەیروت، تاکو چاوت بە(مام جەلال) بکەوێت؟

وتم: من زۆر بەئاسانی ئەتوانم کەی بمەوێت سەفەر بۆ دەرەوەی وڵات بکەم، بەڵام مەبەستت چییە لەسەفەری من، وا بەم پەلەیە.

وتی: دەمەوێت بەزووترین کات چاوت بە(مام جەلال) بکەوێت.

وتم: کاتێك گەیشتمە بەیروت لەڕێگەی مامۆستا ابراهیم احمدەوە ئاگادارم کرد من دوای ٢٣ ڕۆژ، ئینجا مامم دی ئاسان نییە مرۆڤ بچێتە دەرەوەی وڵات ڕوویەڕوو لەگەڵی دانیشێت، بەڵام ئەتوانم ڕاسپاردەکەت وەکو خۆی بگەیەنم.

ووتی: دەمەوێت پێی بڵێی ئەم شۆڕشە هەڵئەگیرسێتەوە، چونکە شۆڕشێك بەناوی ئەوەوە ڕوویدات کوڕانی مەلا مصطفى بارزانی لێی تێك دەدەنەوە.

وتم: بۆ ئاگاداریت کوڕانی بارزانی ئاگادارن.

لەگەڵ (عەلی عەسکەری)یش لەبەغداد، لەدووکانێکی بەرگ دروو، (شارع النهر) بەناوی (خیاطة ابو صابر) دوو بەدوو لەژووری دووکانەکە دانیشتین، بەدووررو درێژی باسی (مام جەلال) م بۆکرد و هەموو ڕێبازی حزبی تازەم کە (یەکێتی‌نیشتمانی کوردستان) بوو بۆ گێڕایەوە.

لەهەمان کاتدا شێخ سالار و شەفیقی برام لەدوورەوە دانیشتبوون، لەم وتوێژە ئاگادار نەبوون.

(عەلی عەسکەری) خۆشحاڵی خۆی دەربڕی و بەجۆرێك گەشایەوە وتی لەخۆشیا قاچم عەرز ناگرێت چاوەڕوانی ئەم ڕۆژەم دەکرد.

(عمر دەبابە)ش کە چوومە ماڵەوە بۆ لای، دوو بەدوو بۆم باس کرد کەوتە خۆشی و شادی و وتی بەڕاستی ڕووداوێکی گرنگە بۆ هەموو گەلی کورد، (ان شاء الله) چیمان پێبکرێت لەم ڕێگا پیرۆزە ئەنجامی دەدەم.

(دکتۆر خالید حمە سعید)یشم لەبیمارستانی (شەمماعیە)م دیت. کەبۆم باس کرد سەری سوڕما و ئاگادارم کرد کەچاوم بەوبرایانە کەوتووە.

(محمد حاجی تاهیریش): هەروەکو برادەرانی دیکە دەقی ڕووداوەکەم وەکو خۆی بۆ باس کرد، وتی: ئێمە تەمەنێکە لەگەڵ مام یەکتر دەناسین (ان شاء الله) پاڵ پشتی دەبم چونکە ئەمە سەرکەوتنە بۆ گشت گەلی کورد.

(علی مام رزا)یش: یەکەم وشە سوێندم دا بەقورئان و تەلاق کەئەبە ئەمریکێنی، تاکو (مام جەلال) دەگەڕێتەوە بۆ وڵات.

وتی: هەڵۆی کوڕم نەخۆشییەکەی (مەنگۆلی)یە لەشێوازە خراپەکەیە، سەرم سوڕماوە، ئەخوات و ئەنوێت و جلی جوانیش لەبەردەکات، خەوی بەحەبی ڤالیۆمە، کەخەبەری دەبێتەوە ئەو قسەیەی ئەو دەیکات کەس نییە بتوانێت بۆ یەك ڕۆژ بەخێوی بکات.

زۆر خۆشحاڵ دەبم کەدەست بدەمە چەك و قەڵەم و بەشەرەفەوە لەم شۆڕشەدا بەشداریم، بەڵام دەبێت چاوەڕوان بکەم هەتاوەکو (هەڵۆ) دەمرێت، ئینجا بچمە پاڵ شۆڕش.

## ڕووداوەکانی کۆمەڵە:

(٢٤) بیست وچوار ئەندام لەکادرە ناسراوەکانیان، ئێران تەسلیمی کردبوونەوە، بابەتەکەیان لەژێر چاودێری کاروباری (شمال) بوو، زۆر بەگرنگی سەیری دۆسییەکەو بیروباوەڕیان و بۆچوونیان دەکردن.

دوو ڕا هەبوون لەناو بەعس دا، یەکێکیان لەناویردنیان و بەشێکیان دژیئەم بۆچوونە بوون.

من لەلایەن خۆمەوە زۆر گرنگیم پێ دا کەزانیم ئەمانە نیشتمان پەروەرن و بیروباوەڕیان ئەبێتە هۆی ئەوەی جەماوەرێکی زۆر لەدەورو پشتیان کۆببێتەوە و سوود بەخشێکی گەورە دەبێت بۆ پاڵپشتی شۆڕش، زۆریانیشم لێئەناسی.

لەسەر داواکردنی (بکر) و (عمری مام رزا) هاتمە سلێمانی باشتر بۆیان ڕوون کردمەوە دەربارەی ڕێکخراوی کۆمەڵەو بۆچوونیان و باروئۆخی ئێستایان و هەڵوێستیان لەهەموو ڕوویەکەوە، ئاگاداریان کردمەوە کە داراۆی شێخ نوری لەئاسایشی سلێمانی بەند کراوە، بڕوا ناکەم ئەمە هیچی لەسەر بێت بەڵکو هەوڵ بدەیت بۆ بەردانی. منیش چوومە ئاسایشی سلێمانی بەو

نیازەی کەهەوڵ بدەم بۆ بەردانی. بەڕێوبەری ئاسایشی سلیمانی (أبو ریم ) پی ی وتم، ئەمە لەبەڕێوەبەری مەکتەبی کاروباری شمال(صدام تکریتی) یەوە داواکراوە، لای ئێمە ناتوانین هیچی بۆ بکەین مادام ناسیاوی تۆیە ئێمە ڕێزی لیٚ دەگرین و بەسەلامەتی ڕەوانەی بەغدادی ئەکەین، هەرچەندە ئەمە یەکەم جارە بەخزمەتی بگەم، بەڵام براکانی شێخ جەناب و شهابم باش ئەناسین.

ڕۆژێك خێزانی (دارۆی شێخ نوری) و (فریدون عبدالقادر) و (پرشنگ)خان خێزانی (ئاوات غەفور) و (نازەنین)خان خێزانی (شەهابی شێخ نوری) و (زێبا) خوشکی (جەعفەر) لەگەڵ چەند ئافرەتێکی دیکە هاتنە لام بۆ ماڵەوە، لەبەغداد.

وتیان چووینە لای وەزیرە کوردەکان ومالی تەها محی‌الدین، کەسیان بەپیرمانەوە نەهاتن و ئێمەشیان نەدی، وا ڕوومان لەتۆ ناوە من خۆم (نازەنین) خان و (زێبا) خانم باش دەناسی وەخۆم بەقەرزداری (زێبا) دەزانم، کەئایا ڕۆژێك دیٚت منیش بەخزمەتەکەی هەستم. لەساڵی ١٩٦٣ پێشمەرگە بووم، گیرابووم لەبەندیخانەی کەرکوك (زێبا) خان ٧ دینار یارمەتی بۆ هێنابووم، ئەمەم هەر لەبەرچاو بوو، هەرچەندە پارەکە هی پارتی بوو و خۆشی ڕێکخراوی کەرکوك فەرمانیان دابوویٚ کەئەم ئیشە جیٚبەجیٚ بکات.

وتیان وامان بیستووە کەئەو ٢٤ کەسەی گیراوون، لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدا زۆریان نەماوون، وەڵامم دانەوەو ڕێکەوتم بەیانی‌یەکەی لەسەعات (٩)، لەگۆڕەپانی ئەندەلوس (ساحە الاندلس) ڕاوەستن، خۆم دیٚم بەئوتومبیٚلەکەی خۆم هەڵتان دەگرم، چونکە بۆیان نی‌یە بمان پشکنن و ڕێگەی هاتوچۆم لیٚ بگرن. لەسەعاتی دیاری کراودا گەیشتمە لایان، لەگەڵمدا هاتن بۆ بەڕێوەبەری ئاسایشی‌بەغداد پێم ڕاگەیاند بەئاگاداری (سید نائب) ئەمانە چاویان بەهەموو کەس وکاریان بکەویٚت، چونکە پروپاگەندەی وا هەیە کەنەماوون.

خواردنەکانیان لیٚ وەرگرتن و یەکێکیان دی ئیتر دڵنیابوون کەماوون، ئەم پروپاگەندەیە ڕاست نی‌یە، بەڵام بەنهێنی بەمنیان وت ئەوانە پرسیاریان لیٚ دەکریٚت.

چووینە سەردانی حەمەی مەلا شریف بەگەرمەوە بەپیرمانەوە هاتن، خۆش حاڵی خۆی دەربڕی کەئێستاکە لەو هەل ومەرجە دا ئەژێت کەناویان دەهێنا بارەگای (کوێخا حەمەی مەلا شریف)، دوای هەرەسەکە ئەمە یەکەم بارەگای پێشمەرگە بوو بەئاشکرا خەڵك دەستی بۆ درێژ بکات لەناوچەی قەلادزێو رانیە. بارەگاکەی بریتی بوو لە ڕەشماڵێکی گەورە وسێ خێمە و کەپرێك، ئافرەتەکان لەژێر دوو خێمەکەدا بوون، لەوانە ماڵی علی عەسکەری تێدا دەژیان، (صبیحە خان)ی هاوسەرەکەی (عەلی عەسکەری) سەرپەرشتی خواردنی ئەکرد، و حەمید باتاسیش ئاگاداریان بوو.

ڕووم کردە (صبیحە خان)ی بەرێزو پێم ڕاگەیاند، بارە قورسەکان هەمووی کەوتونەتە سەر تۆ ئاسان نیە کەلەناو ئەو شاخ ویەردە بەدار خواردنی ئەم هەموو خەڵکە دروست بکەیت.

(صبیحە خان) وتی: من ئێستاکە ئازادم بەسەربەستی ئەژیم لەو دووردم لەحوکمی بەعس، ئەمە خۆشترین ڕۆژمە کەشۆڕش هەڵگیرسایەوە و منیش وا خزمەتی ئەو برا پێشمەرگانە دەکەم و شانازیان پێوە دەکەم کەلەم خەباتە نوێیەدا تێدەکۆشن.

(عمر) وتی: کاتێك کەگەیشتینە لای کوێخا حەمەی مەلا شریف دەست بەجێ عەلی عەسکەری هەموو ئەو پیلانەی کەداتان ڕشتبوو لەنێوانی (ڕەفیق وحەمە) کەئێوە بەکارتان هێناوە وەکو خۆی ئاگادارمان کردەوە. زۆری لا سەیر بوو کەئێمە بەم شێوەیە ئاگادارین و دەقی شتەکان (علی وعمر وخالد) ئەزانین هۆی ئەوەیە بەسەربەستی ڕوومان کردۆتە لای تۆ (حەمەی مەلا شریف) کوێخا حەمە.

دوو بەدوو لەگەڵ عمر دەبابە لە پەنا بەردێك دەستمان کرد بەو گفتوگۆکردنە:

١- بەعس تووشی هستریا و سەرسوڕمان بووە، باوەڕیان بەوە نەدەکرد کەجارێکی دیکە شۆڕش هەڵگیرسێتەوە.

ئەوان چوونە دەرەوە ئینجا مـن چوومـە لای بەڕێوەبـەری ئاسایشـی بەغداد، وتم (ابو علا) و (كنبت عليك) درۆم لەگەڵ کردیـت، ئەمانـە ناچاریـان کردم کەبەم ئیشە هەڵسم.

وەڵامی دامەوە ئەمانە لای ئێمـەن وەکو میـوان، کێشـەکەیان پـەیوەندی بەبەڕێوەبـەری (مەکتـەبی شمالـە)وە هەیـە ناچار بوو بەتەلـەفۆن ئاگـاداری (مەکتـەبی شمـال) بکـات کـەڕەفیق پشـدەری ئـەم کـارەی ئـەنجام داوە بەبێئەوەی ئێمە لەڕاستییەکەی ئاگادار بکاتەوە.

وەڵامیان دابۆوە ئەوە ڕەفیق پشدەری یە بۆچوونی هەمووی مخابراتی‌یە، ویستوویەتی گاڵتەت لەگەڵ بکات ئاگاداری کردبووینەوە.

● بەڕاپۆرت و بەقسە، ئاگـاداری بەعسم کـرد بـەو شـێوەیە مقۆمقـۆ و دەنـگ وبـاس بـووەو بەئاشـکرا بـاس دەکرێت کەلەبەشـی زۆری کوردسـتان بەتایبەتی سنوورەکان کەشاخاوین و سەختن چەکداریان دیوە، ناوی هەندێك خەڵکی ناسراویان هێناوە، وەکو (عمر دەبابە) و (عەلی عەسکەری) و (دکتـۆر خالید حمە سعید) و خەڵکی دیکەش. بەزەقی لەهەموو شـارو شـارۆچکەکانی کوردستان باس باسی ئەوەیە.

ڕۆژ بـەڕۆژ ئـەم دەنـگ و باسـە تازەیـە کەشـۆڕش هەڵگیرسـایەوە بەسەرۆکی‌ایەتی (مام جەلال) دەم خستە بەرچاوتان، ئایا فەرمانتان لەسەرە کـەبچم چـاوم بـەوەکیلی ئاسـایش (حەمـەی مـەلا شریف) بکـەویٚ کـە چـۆن گفتوگۆی لەگەڵ بکەم و پرۆگرامی تازەی بۆ داڕێژین؟

لەسـەر ڕای و فـەرمانی بـەعس لـە ١٩٧٦/٨/٢٠ چوومـە قـەڵادزێ لەگـەڵ (شەفیق وحەسەن) ی برام و لەوێشەوە چـووم بـۆ قـەندیل و ناوچـەی هـۆزی مەنگوڕ، گەیشتمە هاوینەهەواری (خوارو کوێتـرەڵ)کە یەکێکە لـە خۆشـترین هاوینەهەواری ئـەم ناوچەیـەو دەکەوێتـە سـنووری بەدەسـت دروسـت کـراوی هۆزی (مەنگوڕی کوردستانی) عێراق و کوردستانی ئێران. ڕوومان کردە ماڵی (کوێخا خدر) بەنیازی پشوودان ئینجا پرسیاری (حەمەی مـلا شـریف)م کـرد وتـی: لەئێمـەوە دوورە، مـاوەی نیوسـەعات دەسـت بـەجێ نووسـراوێکم ئاراستەی (عمر دەبابە)و (دکتـۆر خـالید حمـە سەعید)م کـرد کـەچاوەڕوانی هاتنتان دەکەم بەپەلە بگەنە لام بێ دواکەوتن ئەوانیش حەوت سـەعات دوور بوون لەئێمەوە.

٢- بۆ لەناوبردن و تێك چوونی، ئاشبەتاڵی پێبکەن، بەدەستێکی ئاسن، چی لەتوانایان بێت بەکاری ئەهێنن، لەکوشتن و بڕین و تیرۆرکردن و گرتن و ماڵ وێران کردن و پڕوپاگەندە و بایەخ پێ نەدان هەر لەناوەوە باس بکرێت.

٣- بەشی [illegible] سیخوڕ بەکرێ گیراوەکانیان بەکاریدەهێنن بۆ تیرۆرکردن [illegible] یەکێك لە پیلانە گرنگەکانیانە [illegible] لەلایەن خۆمەوە ئەم خاڵە زۆریە گرنگ دەزانم و زەحمەتە پاکسازی بکەن دەست بخەنە سەر ئەو جۆرە مرۆڤانە، چونکە دەزگاکانی بەعس هەریەکە لای خۆیەوە بۆ مەبەستی تیرۆرکردن ئەم فەرمانەیان پێ سپاردوون لەبەرئەوە من، یا برایەکی کە بتوانێت ئەم جۆرە مرۆڤانە دەست نیشان بکات لە ١٠٠٪ چونکە بەشی زۆری ئەو مرۆڤانە لەناوتان دا دەژین.

٤-کاتێك گەیشتمە ئێرە دەست بەجێ نووسراوێکم ئاراستە کردن ئەوەبوو لەنیوەی ڕێگا یەکترمان بینی و ئوا دوو ڕۆژە دانیشتووین زانیت هۆی چی بوو کەمن بەم جۆرە پەلەم دەکرد بۆ چاوپێکەوتنتان، هەربۆیەش بەبست لێت دوور ناکەومەوە.

بەعس ئاگاداری کردمەوە کەلەگەڵ علی حسن اغا پیلانیان داناوە بۆ کوشتنی (عمر دەبابە) و (دکتۆر خالدو عەلی عەسکەری) وتیان تۆش لەو ناوچەیە دەبیت لەگەڵ (عەلی حسن ئاغا) بۆ ئەم مەبەستە گفتوگۆ دەکەن بۆ جێبەجێ کردنی بەزووترین کات (کوێخا حەمە)ش بێ گومان هاوکاریت دەکات لەم کارەدا، وام بە کاربەدەستانی بەعس وتبوو کەکوێخا حەمە جێ باوەڕی ئێمەیە، (عەلی حسن ئاغا)ش قسەکانی وەکو دەقی خۆی بۆ گێڕامەوە و ئاگاداری کردمەوە کەکوشتنی (عمر) و (خالد) زۆر ئاسانە، بەردەوام بوون لەقسەکانی کاتێ سەری لەئێوە داوە هەمووی شەش کەس بوون، جا کەی دەست بکەین بە لەناوبردنیان؟ ئایا لەماڵی خۆمان دەعوەتیان کەم بۆ نان خواردن ئەو کاتە کارەکە ئەنجام بدەین، باشترین ڕێگایە، وتم: (عەلی ئاغا) بەڕاستی پیلانەکان زۆر بەڕێك وپێکی داتان ڕشتووە، بەڵام (دکتۆر خالد) ئەبێت ڕاکێشین بۆ لای (عمر) بزانین وا بکەین (عەلی عەسکەر)یش بێتە ئێرە ئینجا بە(عەلی حسن ئاغا)م وت خۆت گوێت لێ بوو کە(عمر دەبابە) وتی: دکتۆر خالد زۆری پێخۆش بوو چاوی پێت بکەوێ من ڕێگەم نەدا. تۆ پێویستە لەبنکەکە بیت لەبارودۆخی ئێستا،

بە(حسن عەلی ئاغا)م وت: ڕاوەستە تاوەکو داوا لە(عمر) بکەین کەوا بکات (دکتۆر خالید) بەزووترین کات بگاتە ئێرە.

٥-عمر دەبابە وتی ئەمە ڕاست نی‌یە لەیەکەم ڕۆژەوە دەست بکەین بەکوشتنی کورد، بەتایبەتی یەکێکی وەکو (عەلی حسن ئاغا) سەرۆکی هۆزی مەنگوڕ. باشە (دکتۆر خالد) لەگەڵمان نی‌یە ئەگینا دەست بەجێ ئەیکوشت ئێستاش کەلەڕێگای خۆمەوە ئاگاداری ئەکەمەوە هەموو ئەو باسانەی لەگەڵ دەکەم.

٦-علی حسن اغا دەعوەتی نان خواردنی بۆکردبووین دوور لە( خواروو‌کۆترەڵ)، بەچوار سەعات چووینەئەوێ دوای پشوودان ونان خواردن عمر دەبابە وەکو دەقی خۆی هەموو قسەکانی بۆ باس کردبوو کەشتێکی واهەیە، (عەلی ئاغا) ووتبووی کاك (عمر) ویستوومە (ڕەفیق) تاقی بکەمەوە. کاتێ (عەلی ئاغا) گەڕایەوە ناومان سوور هەڵگەڕابوو، لەتەنیشت من دانیشتبو وتی خۆم زۆر بەشەرمەزار دەزانم، ئەمە قسە بووە، بەقەبری بابم بەکردەوە نیازی شتی وەهام نەبووە، منیش بەتوندی لەبەرچاوی کوێخاکان قسەم پێ وت.

لەدوایدا صەدام لەتەنیشت دێیەکەی خۆی (شەروەت) خزمی و کوڕو براو نازانم چەند کەسانێك بوون، کوشتیانن و لەسێدارەیان دان بەتەواوی نازانم چونکە ئەوکاتە من لە(مخابرات) بەند کرابووم.

<u>لەدانیشتنی من وعمر دەبابە:</u> کاك (عمر) هەر بە دووقۆڵی وتی: کەهاتمە دەرێ ئوتومبیلێکم هەبوو فرۆشتم، پارەکەیم صرف کرد بۆ شۆڕش، چاوەڕوانی هاتنی (مام جەلال) دەکەین کەپارە لەگەڵ خۆی بهێنێت. بارمان قورسە، بەسەر (کوێخا حەمە)وە و قەرەباڵغێکی گەورەمان دروست کردووە، هەروا لەزیادی‌دایە بتوانین مقداری ١٠٠٠ دینار بۆ کوێخا حەمە پەیدا بکەین باشە.

*　　　*　　　*

## <u>بروسکەیەك:</u>

لە(ڕەفیق پشدەری) یەوە بۆ مەکتەبی کارویاری شمال:

(چەند ڕۆژێکە لەناوچەی پشدەر دەسووڕێمەوە ئێستا کەلەماڵی کوێخا حەمەی مەلا شریفین وا پەسەندی ئەکەم کەژمارەی چەکدارەکانی بگاتە ٥٠- ١٠٠ کەس هەتاکو بتوانیت بەرامبەر چەتەکانی (جەلال تاڵەبانی) و (خالد محمد سعید) کەناسراوە (بەدکتۆر خالد) و (عەلی عەسکەری) و (عمر مصطفى) کەناسراوە بە (عمر بابە) لە ناوچەیە پێپێگەنە دەکەن بۆی بەعس و دەوڵەتکی (تخریب)تێکدانیان هەیە، تکام وایە دەست بەجێ دوو هەزار دینارم بۆ بنێرن تاوەکو تەسلیم بەحەمەی مەلا شریفی بکەم)).

ئەم بروسکەیەم تەسلیم بەحەسەنی برام کرد لەڕێگای ئاسایشی قەلادزێوە ڕەوانەی بکات، لەدوای ٢٤ سەعات حەسەنی برام گەڕایەوە کەبەیانی کات ژمێر ٩ نۆ دەگەنە دێی (مارەدوو) بۆئەم مەبەستە من وکوێخا خدرو کوێخا قادرو کوێخا حەمەی مەلا شریف لەگەڵ شەفیق وحەسەنی برام هاتینە شوێنی دیاری کراو لەپڕدا دوو ئۆتومبێلی جۆری (جێب) ی مەدەنی گەیشتنە لامان، لەوانەی هاتبوون (عبدالقادر الراوی، مدیری شعبەی ثالثة) بەڕێوەبەری بەشی سێ و کەماڵی برام ئەوکاتە (مفوض) بوو لەئاسایشی گشتی لەگەڵ چەند چەکدارێك دلێەرێن ملوەی دوو کات ژمێرێك دانیشتین باسمان لەبارودۆخی ئێستاکرد وتی (عبدالقادر): جێگەی سەرسوڕمانە کە(عمر) و (عەلی ) و (خالید) بەو ئێشە هەڵستاون، چونکە، لەئێمە ئاشکرایە جەلال بەفەرمانی سوریاو دەوڵەتە دلگیرکەرەکان ئاژاوە دروست دەکات، ئەویش لەدوایی دا دواڕۆژیان وەکو هی بارزانییە، ئەوانە هەمووی دامەزرابوونەوە شاخیان بۆچییە؟!

دوو هەزار دینارەکە تەسلیم بەکوێخا حەمە کرا و بەڵێنی پێدرا لە چەك و پارەو یارمەتی و پشتگیری بەعس بەشدار بێت.

## تێبینی:

١-داواکارییەکەی (عمر)م جێبەجێ کرد وەهەروەها پێی ڕاگەیاندبووم کەچاوم بەشێخ جەنگی (تاڵەبانی) بکەوێت ئەم دەنگوباسەی پێ ڕاگەیاندم کەئێستاکە ڕووئەدات وەهەروەها ئاگاداری برازێم (فاتمەخان) بکەمەوە بەو

ناونیشانە کەپێنج دینـارم دابویـێ و کەجانتایـەکم بـۆ بکرِێ بـاقی پارەکـەی بۆهێنابوومەوە هەندێ شتی ئاگادار بکەمەوە.

٢-هـەمووومان گەڕاینـەوە قـەڵادزە، شـەوەکەی لـەوێ بوویـن، لـەماڵی جەسەنی برام بەیانی‌یەکەی قەڵادزێمان بەجێ هێشت هاتینەوە بۆ سلێمانی.

● سـەردانی شێخ جـەنگی (تاڵـەبانی) کرد لەکۆیسـنجق هـەموو ئـەو ڕاسـپاردانەی کـەعمر دەبابـە پـێی وتبـووم وەکـو خـۆی گێڕامـەوە، ئـەویش لەلایەن خۆیەوە زۆر خۆشحاڵ بوو وتی سوپاس بـۆ یـەزدان کەشۆڕشـەکەمان هەڵگیرسایەوە.

● سەردانی ماڵی تاهیر ئەفەندی برای عمر دەبابـەم کـرد چـاوم کـەوت بەفاتمەخانی هاوسەری و وتم: کاك عمر لەکوێیە بۆچی دیارنی‌یە.

وتـی: کاکــە (ڕەفیـق)، ڕۆژ نی‌یـە خــەڵکێکی زۆر نەیـەت پرسـیارمان لێ‌نەکات، بەڕێوەبەری ئاسایشی گشـتی نـاردی بەشـوێن (تـاهر ئەفـەندی) دا پـێی وتبـوو ئـەبێ بچیت عمــر مصـطفـی بهێنیتـەوە، ئـەویش لـەوەڵامدا گوتبووی بروا بکە نازانم ڕووی کردۆتە چ شوێنێك.

ئینجا کە ناونیشانەکەم پێ وت دەسـتی‌کرد بەپێکـەنی.ن ڕاسـپاردەکانی عمر دەبابەم هەمووی پێ وت بەخۆشحاڵی‌یەوە وەری گرت.

● عبدالقادر الراوی: ((دەرچووی کۆلێجـی پۆلیسـە وکـادرێکی بەعسـی کۆنە، بۆچوونی شۆڤێنی‌یەکی عەرەب بوو لـەگروپی (زەعیـم صدیـق و غـانم مصباح و تەها شکرچی) بوو نـاوبراو بۆتـە بەڕێوەبـەری ئاسایشـی سـلێمانی بەدەسـتی خـۆی لـەم شـارە خــەڵکی کوشـتووە بـەجۆرێکی سـەیر ئـازارو ئەشکەنجەی کوردی داوە. دانیشتووی بەغدابوو، خۆی ئەوەندە بەدڵسـۆز و دۆستی کورد ئەزانێت پێشانگای کڕین و فرۆشتنی ئۆتومبێلی هەیە، ئێستاکە وابزانم ناوی ناوە نەورۆز چونکە ڕاست دەکات لەبۆنەکانی نەورۆز خەڵکی کەم کوشتووە))!

## تێبینی

هەرچەندە خۆی بەدۆستێکی نزیکی من دەزانێـت، لـەزۆر شـوێندا باسـی من دەکات. ڕاست دەکات دۆستین، بەلام من ئەم زانی ئەمە هەڵوێسـتێتی بـۆ

بارودۆخی بەرژەوەندی کورد ئەبوو شان بەشانی بڕۆم و یارمەتی بدەم، تاوەکو دەوڵەمەند بێت. لەڕۆژی گیرانم کە ١٩٧٦/٩/١٤ ە یەکترمان نەدیوە لەگەڵ ئەو پیاو کوژە.

## *چاوپێکەوتنم لەگەڵ شهاب و جەعفەرو ئەنوەر:

ڕۆژی چاوپێکەوتنی گشتی (المواجهه العامه) چوومە بەندیخانەی (ابوغریب) بەشی لەسێدارەدان، شهاب وئەنوەر، لەژوورێکدا بوون و جەعفەر عبدالواحد دەستی لەکەلەبچەدا بوو بەتەنها لەژوورێك دابوو.

لەڕابردوودا شهاب وجەعفەرم باش دەناسی لەهەموو ڕوویەکەوە جێی متمانە بووم لایان، بەڵام (ئەنوەر)، ئەمە یەکەم جارە ڕوویەڕووی یەك بینەوە. دیاریەکانم پێش کەش کردن، وتیان خۆت هەموو شتێکی خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی و بەیانی ڕەزامەندی خۆیان پێتیشان دام کەچیم کردووە بۆیان و بەچ جۆرێك پێشوازیم لەماڵیان کردووە و ڕێزم لێناوون.

وەڵامم دانەوە من هیچم نەکردووە بۆ ئێوە، هاتووم بۆتان باس بکەم کەچیم بەدەستەوەیە و نیازم چیە؟ تاکو بەندە لەخزمەتتاندا بێت ئینجا باسی هەموو دەنگ وباس و ڕووداو بارودۆخی ئیمڕۆ ئەوەی کە هەیە، لەگەڵ ئەوەی کەبەسەرۆکایەتی (مام جەلال) (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) هاتە کایەوە دەقی ئەو قسانەم بۆ گێڕانەوە کەلەگەڵ (مام جەلال) باسم کردووە وەچەند ڕۆژێکە لەقەندیل گەڕاومەتەوە. ئەمەشم هەموو بۆ باس کردن، بەبێ ئەوەی ڕای ئێوە وەربگرم، هەوڵێکی زۆرم دا لەگەڵ سەرکردەکانی بەعس، ئەگەر بێتو بەخۆتاندا بچنەوە حزبێکی سیاسی لەشارەکانی سلێمانی وهەولێر و دهۆك بەئاشکرا بارەگایان هەبێت و ڕۆژنامەو گۆڤاریان دەربچێت سوود بەخش دەبێت بۆ ئێوە واتە پاڵپشتێکی جەماوەری دەبێت.

لەگەڵ ئەو هەموو بۆچوونەی خۆم کەچیم بەمێشکدا هاتووە چ بەقسە، یان بەڕاپۆرت خستوومەتە بەرچاویان، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستیەکەتان پێ بڵێم کەئەویش وشەیەکی زۆر ناشیرینە بەگەورەیی خۆتان بم بەخشن ناچارم بۆتان ڕوون بکەمەوە بەعس بڕیاری داوە کەئێوە لەسێدارە بدات من خۆم گەیشتمە ئەو باوەڕە چونکە وایان وەڵامی من دایەوە.

تاکە یەك ڕێگا ماوە کەئەیخەمە بەرچاوتان کەڕزگارتان بکات ئەویش فڕاندنی کوڕێکی (صدام تکریتی) یە بازیانی کوڕم لەگەڵ یەکێکیان بەیەکەوە لەمەکتەب دەخوێنن، یەکتر باش ئەناسن دۆستایەتیان زۆر بەهێزە من ئامادەم لەپێناوی ئێوە هەرچەندە باش دەزانن بیروباوەڕم کۆمەڵە نییە و من کوردێکی نەتەوەییم، هەرچی ڕاست بێتەوە کورد ڕزگار بکات من خزمەتکاری ئەکەم. وەڵڵاهی باوەڕیشم بەئێوە هەیە کەئامادەن بۆ ئەم نیشتمانە گیانی خۆتان بەخت بکەن. من ئامادەم لەپێناوی جێبەجێکردنی ئەم کارە، دوور لەبرادەرانی ئێوە، لەدەرەوە پەیوەندیم پێوە بکەن بەو ناونیشانەی کەخۆتان بۆم ڕوون بکەنەوە لەناو ئەو گفتوگۆیانەی کەکردمان.
ئەمە تاکە ڕێگەی دوارۆژتانە کەڕزگارتان بێت چونکی فڕاندنی کوڕەکەی ئەبێتە مایەی ئەوەی کەدەست لەسەر ئێوە هەڵگرێت وە ئازادتان بکات منیش خۆم وکمال و منداڵەکانم بەئاسانی ئەگەینە لای برادەران لە شاخ. ئەم قسانە وەکو دەقی خۆی بەتەنها بە(جەعفەر عبدالواحد)یشی وت.

## تێبینی:

١- خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی، سوپاسیان کردم، وتیان پەیوەندیت پێوە ئەکەین.

٢-لەکاتی تەواوبوونی چاوپێکەوتن، ئەوانەی کەبەند کراون دەگەڕێنەوە جێگەو شوێنی خۆیان یەکە یەکە ژمارە دەکرێن کەژمارەیان تەواو بوو، ئینجا ڕێگە ئەدەن بەوانەی کەلەدەرەوە هاتوون بۆ چاوپێکەوتن و دەرگاکانیان بۆ دەکەنەوە، ڕێگایان ئەدەن بڕۆنە دەرێ لەبەندیخانە.
ئەو ڕۆژە یەك سەعات مامەوە لایان بەتەنها، چونکە یەك ژمارە لەبەندکراوەکان دیارنەبوو. دوایی دۆزیانەوە لەتوالێت بووە.

٣-هەرچەندە ژیان ئەوەندە خۆشە کەبەراوورد ناکرێت لەگەڵ مردن دا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك بۆم ڕوون کردنەوە کەئێوە لەسێدارە دەدرێن، وەڵڵاهی ڕەنگیان تێك نەچوو، لایان شتێکی تازەو سەرسوڕهێنەر نەبوو، وتیان لای ئێمە ڕوونە کەئەمانە واتە (بەعس) گەڕانەوەیان نییە لەجێبەجێکردنی هەر بڕیارێك.

٤–شهاب و جەعفەر بەمنیان وت ئەمە رۆژێکە مێژوو باسی دەکات ئەمە جێبەجێبکرێت ڕووداوێکی گرنگە ئیمڕۆ لەهەموو ڕۆژانی پێشوو فکرمان لەسەر خۆترە. کەبڕیاری بەعسیشمان بەتەواوەتی زانی یەکلا بووینەوە.

٦–کاتێك من حوکم درام هاتمە بەندیخانە (ئاڵەنین) هاوسەری (شهاب) پێی وتم: کاتێك (شهاب) و (جەعفەر) و (ئەنوەر) بیستیان کە تۆ گیراویت باسی هەڵوێستی تۆیان کرد کەچۆن بوویت لەگەڵیان زۆر زۆریان ناخۆش بوو وەدڵتەنگ بوون ئەو کاتەی کەمن گیرابووم ئەوان لەسێدارە نەدرابوون.

● سەعات ١٠ی سەر لەبەیانی ١٩٧٦/٩/١١ چوومە لای (صدام تکریتی) بەگەرمیەوە بەخێرهاتنی کردم، بەپیرمەوە هات، ئەحواڵی پرسیم وتی: (بقی بالی یمك هوایه) واتە فکرم زۆر لات بوو، چونکە زۆرت پێ چوو ماندوو بوویت).

وتم: سوپاست دەکەم، ئەوەی کردوومەو پێی هەستاوم ئیش وکاری خۆمە پێی هەستاوم لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانە دەبێت ئەنجامی بدەم.

وتی: لەکاتێکدا کورد کەوتۆتە پشوودان خەریکی ژیانی ڕۆژانەیەتی ئاشتی لەسەرانسەری وڵات بەردەوامە، ئینجا گرژ بوو هێرشی بردە سەر قادەکانی کورد کەبەفەرمانی دەرەوە ئەجووڵێنەوە دژی عێراق وتی: وتی: نازانم (نوری) ( نوری فیصل الحدیثی) لەگەڵتا قسەی کرد.

وتم: سید نوری چەند پرسیارێکی لێکردم ئایا (جەلال تاڵەبانی) ئێستاکە لەچ وڵاتێکە؟ (لەدڵی خۆمدا وامەستم کرد کە )(ان شاء الله) نیازی گفتوگۆیان هەیە

ئینجا وتی: ئەو بارودۆخەی ئێستا واخەریکە ڕوویدات لەشمال ئەوەی پێی هەڵدەستێت بەکرێگیراوی دوژمنانی عێراقن ئەویش (جەلال تاڵەبانی) یە وام بەباش زانی قسەت لەگەڵبکەم تاوەکو دڵنیا بم ئەم کارە ئەنجام ئەدەیت تۆو (نوری) مامۆستای (مخابرات) پیلان دابنێن بۆ تیرۆر کردنی (جەلال تاڵەبانی).

وتم: بۆچی منتان هەڵبژاردووە بۆ کووشتنی (جەلال تاڵەبانی) بۆچی یەکێکی کە دەستنیشان ناکەن بەداخەوە ئەوە هەڵوێست وئیشی‌من نییە.

بەڕێزتانم ئاگادار کرد لەیەکەم ڕۆژەوە کەدلوات لەمن کرد لای خۆم وەلامم دایتەوە ڕوو بەڕوو بۆم ڕوون کردیتەوە کەدەوری تیرۆریست وسیخوڕی نابینم وەپێی هەڵناستم.

(صدام) گرژ بوو بەدەست ئیشارەتی دامێ کەکۆبوونەوەکە کۆتایی هـات. داوای لێبووردنم لێکردو هاتمە دەرێ.

● سـەعات ١١ر٤٠ دەقیقـەی سـەر لەبـەیانی لەبـەرواری ١٩٧٦/٩/١٤ عبدالقادر الراوی تەلـەفۆنی بـۆ کـردم کەبەڕێوەبـەری ئاسایشـی گشـتی داوام ئەکات.

وتم: نـاتوانم بێـم چونکـە (ابـو صـابر) خەیاتەکـەمان لەئەمـەریکا دەگەڕێتەوە وا خۆم ئامادە کردووە کەبچم بۆ فڕۆکەخانە.

وتی: پێنج دەقیقە زیاترت پێناچێت.

وتم: کەگەڕامەوە لەفڕۆکەخانە دەست بەجێ دێم بۆ لاتان.

وتـی: بـڕوا ناکـەم پێنـج دەقیقـە دوات بخـا لـەچوونت بـۆ فڕۆکەخانـەی بەغداد.

وتم: واهاتم کاتێك گەیشتم لەئوتومبێلەکە هاتمە خوارێ ئەفسەرێك بـۆ لام هات بەیەکەوە چووینە لای (عبدالقادر الراوی) دەست بەجێ ڕووی کردە من و وتـی فـەرمانی بـەندکردنت دراوە، منیـان بـردە بەشـی ئاسایشـی دەرەوەی وولات (شعبە امن الخارجی) بەتەنها لەژوورێك دلیان نام.

**تێبینی:**

شەو ماڵی (ابوصابر) خەیاتەکە، تەلـەفۆن لەگـەڵ دایکی بازیـان دەکـەن ئەڵێن کوانێ ابو بازیان بۆ بەهاوارمان نایەن ئایـا ئـەزانن چیمـان لێقـەوماوە، کـاتێك (ابـو صـابر) لەگـەڵ دایکـی لەفڕۆکـە دادەبـەزێت لـەژووری ترانزێـت لەسەعات یەك گیانی دەردەچێت، کەدایکی چاوی پێدەکـەوێت وا کوڕەکـەی مردووە ئەویش گیان لەدەست ئەدات، دایکـی بازیـان ئـەڵێت بەداخـەوە ابـۆ بازیانیش لەکاتی سەعات یەك گیراوە.

بەیانی‌یەکەی سەعات ٩ لە ١٩٧٦/٩/١٥ بردیانم بۆ لای بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بەڕاستی هەڵسا هات بەپیرمەوە لەتەنیشتم دانیشت، وتی: کێشەکەت چی‌یە؟

وتم: (ابو مازن) من ئەمەوێ پرسیارت لێبکەم کەکێشەکەم چی‌یە و هۆی چی‌یە گیراووم؟

وتی: تەلەفۆنەکەم هەڵگرت چۆنی عبد بەڵێ (سید نائب) فەرموو، گوتی ئێستاکە ئەنێریت بەشوێن (ڕەفیق پشدەری)، بەندی بکە لای خۆتان، ڕێ نەدەن بەسەرکردنەوەو چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکرێت، تەنها براکەی (کەمال) بۆی هەیە ڕادیۆو ڕۆژنامەو خواردنی بۆ بەرێت .

وتم: (ابو مازن) ئەگەر نووسراوێك ئاراستەی (سید نائب) بکەم کەی دەگاتە دەستی.

وتی: (ابو بازیان) نووسراوەکە بنووسە دوای نیوسەعات ئەگاتە دەستی دەیخوێنێتەوە، بەڵام وەڵامەکەی لای ئەوە من ئەزانم کە(سید نائب) تۆی خۆش دەوێت. لەڵەم وکاغەزی دامێ، بە(ابو مازن)م وت خۆت من باش ئەناسی کەمن پیاو کوژ نیم پێشمەرگە بووم، شەڕم کردووە، ئەمە ئاشکرایە بەڵام پیاوێکی تیروریست نیم ئەمە تۆو (ناظم) و (صدام) باش دەزانن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەدەبوو، وەڵامی (صدام) بەو گرژی‌یە بدەمەوە.

## نووسراوێکم ئاراستەی (سید نائب) کرد.

گەورەم جەنابی سید نائب (صدام تکریتی):

ماوەیەکە مێشکم هیلاکەو ماندووم لەبەر هاتووچۆکردن و باروئۆخی ئێستاکە شەوی ١٠١٩وە ١٠١١١ /١٩٧٦ خەریکی خواردنەوەو یاری‌کردن بووم، بەجۆرێك مەعیدەم تێك چوو، کەوتمە ڕشانەوەو تەندروستیم باش نەبوو کاتێك بەڕێزتان داواتان کردبووم ئەوکاتە ئامادەگیرم نەبوو، بەناچاری هاتمە خزمەتت خۆم بەشەرمەزار دەزانم بەگەورەیی خۆت بم بەخشە، کەڕوویەڕووی بەڕێزتان زمانم هەڵەی کرد، وەڵامم دایەوە بەم شێوەیە (کلا -نەخێر)..

گەورەم سید نائب:-

من ئامادەم هەموو فەرمانێکی بەڕێزتان بخەمە سەرچاوو ئەنجامی بدەم، تکایە ڕێگام پێبدەیت بۆ پێنج دەقیقە لەبەرامبەر بەڕێزتان ڕاوەستم جێی شانازییە.

ئیتر هەر بژیت هەتاهەتایە بۆ خزمەتی وولات

**برای پچووکتان / ڕەفیق پشدەری**

**١٩٧٦/٩/١٥**

## تێبینی:

١-(عبدالخالق عبدالعزيز) دەست بەجێ نووسراوەكەی منی خستە ناو كاغەزی نامەو داوام لێكرد بیخوێنێتەوە وەڵامی دامەوە ئەمەبۆ (سيد نائبە) بۆم نییە بەهیچ جۆرێك تەماشای ئەوەڕێكەكەی بكەم، بەڵام باش ئەیزانی ئەوەڕێكەكەی چییە.

٢-كاتێك ڕووبەڕووی صدام بوومەوە و داوای ئەوەی لێ كردم دوو ڕێگام لەبەردەمدا بوو، یا ڕازی بوومایە بەوەڵامی بەڵێ و بەسەرچاو، ئینجا دوای ئەوە چیم ئەكرد ئەوە شتێكی كەیە، یا وەكو بەم جۆرە كەگرژ بووم وەڵامم دایەوە نەخێر كەكاتێك هاتمە دەرێ لەژوورەكەی.یەكسەر ڕام كردایە، ئەو كاتە ئەوو نوری دەستی خۆیان دەشكاندەوە كەهۆی چی بوو دەست بەجێ فەرمانی گرتنیان بۆ دەرنەكردم. كاتێك لەژووری بەندیخانە بووم خۆم بەخۆم ئەووت ئەم هەموو پشوودان و دواكەوتنە بۆچی؟ یەكجار زۆر بوو بەو ناوەی كەخۆم كۆبكەمەوە، من نزیكەی ٥٠ سەعاتم هەبوو، ئەوەم بیرئەكەوتەوە لەكودەتاكەی (ناظم گزار) كەڕووی دا لەبەغداوە ڕام كرد سەعات ٤ یا ٥ بوو لەگەڵ (مام جەلال) بەتەلەفۆن قسەم كرد لە(شام) موە.

٣-نووسراوەكەم زیاد بوو ئەم زانی ڕۆژێك ئەم فرتوفێڵە سەرتاگرێ كەگیراشم پەتەكەم حەڵاڵ كردووە دەمێكە فێڵیان لێدەكەم، زۆرم بۆچۆتە سەر، لەپەنا ئەوەدا دۆستایەتی و برایەتیو هاوكارییەكی زۆری خەڵكم كرد بەبێ بەرامبەر، ئەوەی كردووشمە بۆ كوردو وڵاتەكەم، ئەوە كوردێكم و فەرمانی سەرشانی خۆم بووە.

٤-بەهۆی ئەم نووسراوەوە ئەوەندە توند نابن لەگەڵمدا، كەمرۆڤ بێ دەسەڵات بوو، پاڕانەوەی باشترە لەسنگ دەرپەڕاندن، ئەمە پێنجەمین جارە ئەگیرێم، ئەم جارە زمانی پاڕانەوە بەكاردێنم و ئەمە بڕیارمە.

(نوری فیصل شاهر): خەڵكی ڕاوەیە دەرچووی كۆلێجی پۆلیسە (شرطة) یە، بیروباوەڕی شۆڤێنییەكی عەرەبە، لەگرووپی (زەعیم صدیق) و (غانم مصباح) و (تەها شكرچی) یە ئەتوانم بڵێم كەس بەقەدەر ئەم زاتە خراپەی لەگەڵ كوردی دا بەكردەوە نەكردووە، لەهەموو كوشتن و ماڵوێران كردن و گواستنەوەو ئەنفال كردن بەشدار بووە جێی داخە كوردێكی زۆر

دەناسیٚ، پروپاگەندەیەکی باشی بۆ دەکەن ئێستاش پەنیرو ماست و هەنگوین و دیاری دیکەی بۆ دەبەن. ئەم جۆرە خەڵکانە پێویستە ناویان لەناو هەموو خێزانێکی کورد بڵاوبکرێتەوە و بیناسن. بەتایبەتی ئەمە یەکێکە لەگۆچانی دەستی (صدام). لەهەمووی سەیرتر ئەوە بوو لەو مەسئولیاتانەی کەوەری گرتووە جارێکیان کرابوو بەوەزیری ئەوقاف، کەئەم جێگایە لەو ناوەشێتەوە.

- لەبەرواری ١٩٧٦/٩/١٥ تاوەکو بەرواری ١٩٧٧/١/٣ لەئاسایشی گشتی بووم.
- لە١٩٧٦/٩/١٧ وە لەژوورێکیان دانام ئامێری کامێرای شارلوەیان داناو هەموو گفتوگۆو هەڵسان و دانیشتن و نان خواردنم زۆر باش ئاگادار بوون، پێیان ڕاگەیاندبووم ئەوەی کەدەیزانێت نابێت بەهیچ جۆرێك قسەو باسی تێدا بکەیت، چونکە ئەو نهێنیانە موڵکی حکومەتە (زانیم مەبەستیان چی‌یە کەئەو دەنگ وباسە نەگاتەوە (مام جەلال) کەنیازیانە تیرۆری بکەن ).

ڕۆژانە کمالی برام دوو، یان سیٚجار ئەهاتە لام، خواردن و ڕۆژنامەی بۆ دەهێنام، بەهیچ جۆرێك باسی هیچ ڕووداوێکی سیاسی مان نەدەکرد، بەڵکو قسەشمان لەگەڵ یەکتری دا نەدەکرد، تەنها ماڵەوەچۆنن، چونکە لەو باوەڕەدا بووین مەترسییان بەجۆرێك بوو دەمگوت کەئێستاکە کمال و شفیق و حەسەنی برام و وە دایکم و (حەمەی مام وەل)ی و (کاکە ئەمی)ن و (حبیب محمد کریم) و (نکیة اسماعیل حقی) دەگرن.

ڕۆژگارم بەوشێوەیە بردە سەر، خەریکی نوێژو قورئان خوێندن بووم، بەهۆی کاریەدەستانی ئاسایشەوە کتێبی گرنگ و نایابم دەست کەوت، کەلەبازاڕ قەدەغەیە، یان هەر نی‌یە سوودێکی گەورەم لیٚ کرد.

لەگەڵ ئەوەشدا؛ ڕۆژانە ڕاپۆرتیان لەسەر دەنووسیم، لەسەر هەموو جووڵانەوەیەکم، ئایا مێشك و بەدەنم لەسەر خۆیەتی و خواردنم چۆنە؟ سەعات چەند نووستووم؟ لەو ماوەیەدا چوار جار بازیان و ڕەوەزم دی.

## تێبینی:

لە١٩٧٧/١/٢ لەگەڵ عەریفێکی ئاسایشی گشتی شیعە کە خەڵکی عەمارە بوو، دۆستایەتیمان زۆر بەهێز بوو ڕێک کەوتین کەیارمەتیم بدات، بەشەو کاتێک مەسئولی من دەبێت بەیەکەوە هەڵبێین و مقداری (١٣)هەزار دیناری بدەمێ بەرامبەر بەو کارە، کەدوای ڕاکردنی خێزانی ژنیان ئاسوودە بێت.

● لەشەوی ٣/٤ی ١٩٧٧/١ گواسترامەوە بۆ (دائرەیەکی مخـابرات) لەناوچەی بتاوین خانووەکە بریتی بوو لەسێ نهۆم، من لەنهۆمی یەکەم بـووم کەبریتی بوو لەشانزدە ژوور. هەمووی لەسەر یەك شێوە دروست کرابوو، هەر هەشت ژوور بەرامبەر بەیەك بـوون و داڵانەکـەی بریتـی بـوو لەمـەترو نیوێـك، کەس کەسی نەدەدی، تەنها گوێت لەدەنگی ئافرەت ومنداڵ بوو کەدەگریان، هەر شانزدە ژوورەکەش تەنهایەك دەرگـای سـەرەکی هـەبوو، لە هەشـت و نیوەوە نەدەکرایەوە تاوەکو کـاتژمێر چـواری ئێـوارە، ئەوانـەی لـەوێ بـوون بەفەرمانی جیەدام لەوێ پەیدبوون و هەر بەندکراوێکیش لەسەر دۆسیەکەی نووسراوە: (هکذا تعـامل) واتـە بـەم جـۆرە ڕەفتـار کـەن لەگـەڵیدا، هـەموو ژوورەکان لەژێر کۆنترۆڵی سەرەکی دابوون بـەهۆی ئـامێری کـامێرا چـاودێری هەموو ژوورەکانیان دەکرد.

هەریەکـە جـۆرە خواردنێکـی دەدرایـێ و ڕەفتـاری لەگـەڵدا دەکـرا،لـە ١٩٧٧/١/٥ بردیانمە لای کاربەدەستێکی مخابرات، پێشتر یەکترمان دەناسـی وتی: تۆ لەشوێنێکی ئەمینی چونکی بەفەرمانی (سید نائب) گـیراوی نـەچاك نەخراپە ناتوانم لەخۆمـەوە هیچیـانت لەگـەڵ بکـەم، ئێمـە بـەکورتی بـەپێی فەرمانی (سید نائب) ئەجووڵێینـەوە لەگـەڵتا. ئیـتر بـەهیچ جۆرێك هـەرچی پـەیوەندی یـەکم هەیـە بـەدەرەوە نـەما و ئاگـام لـەهیچ دەنـگ وباسـێك و ڕووداوێك نەما، بەهۆی بانگی هەینی(جمعـە) ڕۆژانـی هەفتـەم دیاریدەکرد و پێش ئـەوە بەخـەت لـەدیواری بەندیخانەکـە، هەفتـەم دیـاری دەکـرد زسـتان وهاوین، بەگەرماو سەرما ئاشکرا بوو لام (نۆزدە مانگ و دە ڕۆژ )لەیـەك ژوور بەند بووم تەنها دوانزە ڕۆژیان لە ژوورێکی تایبـەتی بـووم ئـازارو ئەشکەنجە درام لەدواییدا دێینە سەر ئەو باسەش.

بیست وچوار سەعات لەو دوانزە ڕۆژە لەگەڵ شێتێك ژیام. بەرزایی ژوورەکە یەك مەتر بوو، چوار کاتژمێر لەگەڵ دوو کەس بووم، لەژوورێکی دی کە دوولاوی ڕێك وپێکی لێ بوو قسەمان لەگەل یەکتر نەکرد، بۆ من زۆر خۆش بوو، چونکە وا دەمەتەقێ یان لەگەڵ ئەکەم من بەمخابراتم دائەنان، یەکێکیان منی ناسی وتی تۆ ابو بازیانی ئایا تۆ ئیعترافت نەکردووە؟ جوابم دایەوە وتم: من هیچم لەسەر نییە و ئیعتراف لەسەر چیبکەم؟ ئەوەی دیکەیان جێ برینی دیاربوو، بەلام ئیعترافی کردبوو لەناچاری بەجۆرێکی وەها ئازارو ئەشکەنجەیان دابوو، هەرچەندە دانی بەوەدانا کەئەم تاوانەی نەکردووە لەدوایی دا وەکو بیستم لەسێدارە دراوە.

**لەماوەی نۆزدە مانگ و دە ڕۆژ تەنها دوانزدە ڕۆژیان نەبێت خواردنم بەم جۆرە بوو:**

*بەیانیان ماست و پەنیرو قەیماغ و شیرو چایان ئەدامێ.

*سەعات ١٠ی بەیانی سەمونێکی عەسکەری لەگەڵ میوەی وەرزی ئەو کاتە.

*سەعات یەك، کاتی نان خواردنی نیوەڕۆ برنج و شلە و مقداری نیوکیلۆ گۆشت.

*سەعات چواری ئێوارە شەربەتی نادر، پاکەتێك سیگارەی ڕۆسمەن.

*سەعات هەشتی شەو خواردنیان بۆ ئەهێنام (تواشف) یان لەنادی صید، یان کەبابی اربیل.

کەهاتمە (مخابرات) بەمیوانی کێشم ١٠٣ کغم بوو، لەگەڵ ئەو هەموو خواردنە خۆش و ڕێك پێکەی بۆیان ئەهێنام، وەکو گیسکەکەی هەیاس کەهاتمە بەندیخانەی (ابو غریب) کێشم بوو بوو بە پەنجاو دوو کیلۆ، کەس و کارم نەیاندەناسیمەوە، بردیانمە ئەو قاعەیەی کەبەشی زۆریان کۆمەڵەو پارتی و برا یەزیدییەکان بوون. ڕووم کردە برا کۆمەڵەکان وتم: من ڕەفیق پشدەریم کەمیان لەسەر ئێوە لێدراوم بۆ نایەن بەپیرمەوە، حەمیدی کریم شانەیی خزمم بوو بەجۆرێك گۆڕابووم نەیناسیمەوە.

هەفتەی یەك جار ژوورەكەیان پاك دەكردەوە، جارێكیان ئەوەی‌هات پاكی بكاتەوە ئەفسەرێك بوو بەپلەی عقید، زۆرم لا گرنگ بوو.
سێ جار ڕوویاری كچم تەلەفۆنی لەگەڵ (سید نائب) كردووە بۆ ئەوەی چاویان بەمن بكەوێت. لەیەكەم چاوپێكەوتنندا لەبەرواری ١٩٧٧/٤/٧ (دایكم) و(هاوسەرەكەم) و (كەمال) و (بەزیان) و (ڕەوەن) و (خەرمان) و (شلێر) هاتنە لام، ماوەی دوو كاتژمێر لەگەڵیان دانیشتم لەدائرەیەكی ئاسایش پیاوەكانی مخابرات لەگەڵمان دانیشتبوون. دایكم باوەشی پیا كردم ئەم لاو ئەولای ماچ كردم بەدەنگێكی نزم وتی كۆنەكەیە یان تازەكەیە ئەم لاو ئەو لام ماچ كردەوە وتم: هەردووكیانە.
(واتە لەسەر پارتی دیموكراتی كوردستان -بارزانی یان یەكێتی نیشتمانی كوردستان -جەلال تاڵەبانی) جاری دووەم ماچی كردمەوە بەبیانووی صدام كەئەمەباوكمانە، گەورەمانە، ئیعترافت (دانت) بەتاوانەكانی خۆتدا ناوە، وتم نەخێر.

● لە ١٩٧٧/١/١٢ بردیانم بۆ ژووری لێكۆڵینەوە هەرچەندە چاوم بەستراوەتەوە، بەڵام بەهۆی دەنگەكانیان وام هەست كرد كەسێ‌كەسن، نزیكەی شەش سەعات پرسیاریان لێكردم، شتی هەرە گرنگ ئەو كاتە ئەمەبوو، ئایا تۆ جاسووسی چ دەوڵەتێكی دەرەوەی؟ لەكاتێكدا دانیشتگات تەواو نەكردووە، خەڵكی ناوچەیەكی شاخاویت، ئەگەر تۆ سەر بەوڵاتێك نەبی چۆن گەیشتوویتە ئەو پلەیە كەبەم شێوەیە ڕاپۆرت بنووسی، بەم ژیانە ڕۆژگار ئەبەیتە سەر، ئەم هەموو هاتوچۆیە دەكەیت بۆ دەرەوە.
ئێمە هەموومان گەیشتووینەتە ئەو باوەڕە كەتۆ جاسووسی، هی ئەڵمانیت، یان ئینگلیزی یان هەر وڵاتێكی تر بیت. دوای ئەو هەموو گفتوگۆیە بڕیاریان لەسەر ئەوەدا كەسێ پرسیارم لێبكەن بەنووسین، منیش وەڵامیان بدەمەوە بەنووسین:

١-لەسەر كێشەی كورد چۆن جێبەجێ دەبێت.
٢-لەسەرباری ئابووری (كێشەی نەوت).
٣-لەسەر حكومەتی شاهەنشای ئێران.

## تێبینی:

داوایان لێکردم لەئێستاوە تاکو یەك مانگی دیکە، بۆم هەیە لەسەر ئەم سێ باسە چی ئەزانم ڕای خۆم بنووسم.

وتیان: ئەمە وەکو مجەکی ئاڵتوونە.

● ڕۆژانە دەستم کرد بەنووسین ڕۆژی سێجار دەهاتن ڕاپۆرتەکانیان لێ وەردەگرتم لە ١٩٧٧/٢/٢٠ بانگیان کردم، هەموویان بەیەك دەنگ شهادەتیان دا کەگەیشتینە ئەو باوەڕە کەئەوەی دەینووسی ڕاو فکری خۆتە، خوا ئەو زیرەکی‌یەی پێ بەخشیوویت.

لێکۆڵینەوەو پرسیارو وەڵام و قسەو گفتوگۆکردن هەر بەردەوام بوو لەگەڵمدا (شەفیقی برام شانزدە مانگ لەهەمان خانوودا بووسێجار یەکترمان دی جارێکیان من چاوم کرابۆوە ئەویان هێنایە ژوورێ چاویان بەستبۆوە، کاسێتێکیان لێدا بەشێوەی دەنگی من کەمن، ئیعترافم کردووە، ئایا شفیق تۆ بۆچی ئیعتراف ناکەیت. دەمی کردەوە قسە بکات نەم دەزانی ئەڵێ چی یەکسەر پێم وت: ڕاست نی‌یە ئیعترافم نەکردووەو نایکەم ئەویان بردە دەرێ منیش دوو شەپازلە یان لێدام.

جارێکیان منیان بردە سەریان تاوەکو هەتاوم لێبدات، دیتم شفیقی برام فەرش دەشوات، بەچاو یەکترمان دواند، پێم نیشان دا دوور بەدوور کەمن تەندروستیم زۆر باشە وامن وەرزش دەکەم. سێ‌هەم جار بردیانین ئەشیعەی سنگمان وەربگرن.

● دووەم لێکۆڵینەوە لەسەر پارتی دیموکراتی کوردستان – بارزانی کەمن پەیوەندیم هەبووە، ڕۆژانە هەموو دەنگ وباسێکی حکومەتم بۆ ناردوون و بەڕاستەوخۆ پەیوەندیم بە مسعود بارزانی یەوە هەبووە نامەکانم لەڕێگەی شەفیقی برام ناردووە.

● بەهیچ جۆرێك دانم پی‌دا نەنا کەمن لەگەڵ (پارتی)، یان (مسعود بارزانی) هیچ پەیوەندی‌یەکم هەیە ئەمە ڕاست نی‌یە.

● ڕۆژێك بانگیان کردم وتیان هەتاوەکو کەی دان بەخۆتا ئەگریت ئەڵێیت پەیوەندیم بە(مەسعود بارزانی)یەوە نی‌یە؟ ئەی کەناونیشانەکەمان هێنایت (کلمه السر) (بەیروت– مارتینس) هەرچەندە چاووم بەستراوەتەوە

بەڵام ڕوویەڕوویان بەزەردەخەنەیەکەوە وەڵامم دانەوە برایانی مەسئول ئەم شتە سەیرانە چییە باسی دەکەن؟ (ئەم وتانە کەپێیان وتم لەناوەڕۆکدا زۆر ترسام ئەوەندەی نەمابوو تووشی نەخۆشی دڵ ببم).

ڕاستە من ئەو ئوتێلەم زۆر دیوە، چونکە خاوەن ئوتێل (حەسەن توحنە)یە و کاکەی (حاجی محمود) بەشدارە لەو ئوتێلە بەهۆی ئەوەوە سەردانی شەخسی کاکەم دەکرد.

● مرۆڤ لەتەنیشتپەیوەندی لەگەڵ سەرکردە بێت نهێنییەکەی دەرچێت زۆرم لا سەیرهات کەئەمە تەنها خۆم و کاک مسعود بارزانی ئەیزانین. چۆن ئەمە لەمەکتەبی ئەوەوە چووە شوێنێکی دیکەو ئینجا دەست مخابرات کەوت؟!

● لێپرسراوی مەکتەبەکە وتی: تکات لێ دەکەم باڵەگەڵ بەڕێزتان تووشی ئازارو ئەشکەنجە نەبین، ڕاستە باوەڕمان کرد کەتۆ جاسووسی دەولی نیت، بەڵام کارت کردووە بۆ شەخسی (جەلال و مسعود). ئێمە ئەتوانین (جیق وفلیقت) بکەینەوە، بەڵام دەمانەوێت خۆت دانی پێدا بنێیت لەبەرئەوەی لەمەکتەبی کاروباری شمال و لە ناو (مجلسی قیادەی ثورة) وە لەناو مەکتەبی (سید نائب) دەنگوباسە نهێنییەکان بڵاوبۆتەوە. ئێمە گەیشتینە ئەو باوەڕە کەئەمە هەمووی تۆیت دان پیانانت (ڕەفیق) ئەبێتە هۆی ئەوەی ئەم شکە لەسەر ئەو شوێنە گرنگانە لابچێت. جەنابی (سید نائب) زۆر لای گرنگە ڕاستییەکەی بزانێت، ئەوەش ڕاستییەکەی لای تۆیە فەرموو قسە بکە.

● من لەیەکەم ڕۆژەوە هیچ پلەیەکی ئاشکرام نەبووە، وەکیلی ئەمن بووم لەناو کورد بەسیخوڕ ناویراوم، نازانم هۆی چییە ئەو هەموو بایەخەتان داوە بەمن، کابرایەکی بەستەزمانی نەخاوەن شەهادەیەکی بەرز، بۆچی هەموو ئەوەی کەڕووی داوە لەناو (قیادە) تیشك بخرێتە سەر من جار نییە باسی ئازارو ئەشکەنجەم لەگەڵ نەکەن، من لەبەردەستانم، ئەتوانن هەموو شتێك بکەن لەگەڵم.

● ڕۆژێکی دیکە بانگیان کردم کەسەرانسەر پەیوەندیت هەبوو بەجەلال تاڵەبانییەوە یەوە هەموو دەنگوباسێکی قیادەت داوە بە(جەلال)، ئەویش لەڕێگەی خۆیەوە داویەتی بە(بارزانی)، لەو دواییانەدا بەسوریا.

● وتم من لەساڵی پەنجاكانەوە كاتێك لەشەریكەی نەوتی كەركوك كاتب بووم، تەمەنم شانزدە ساڵان دەبوو لەوكاتەوە (جەلال) ئەناسم و (سید نائب) باش ئەزانێت و ئاگادارە، پێش گرتنم بە ١٠ یان ١٥ ڕۆژ لەناوچەی شاخی قەندیل بووم زۆر نزیك بووم لەبارەگای (عمر مصطفی) ئەگەر شتێكم لەخۆم شك ببردایە ئەچوومە پاڵیان، (جەلال) پێویستی بەوە نییە من دەنگوباسی بدەمێ.

ووتیان لەكەیەوە (مسعود بارزانی) و (ئیدریس بارزانیت) نەدیوە؟ وتم: لەساڵی ١٩٦٤ وە ساڵی ١٩٦٥ ئامر بەتالیۆنی تۆ بووم لەهێزی قەرەداغ ڕام كرد، بەناخێری گیانم هاتومەتە پاڵ حكومەت چەند جار وویستوویانە تیرۆرم بكەن، جارێكیان قونبلەیان لەناو ئۆتومبێلەكەدا بۆدانام شانسی خۆم نەتەقیەوە، وەجارێكیان كە(نوری فیصل شاهر) بەڕێوەبەری ئاسایشی سلێمانی بوو، لەڕێگەی (ابو مازن)ەوە ئاگادار كرامەوە كەمەفرەزەیەك هاتوون بۆ كوشتنت بەسەر پەرشتی (حەسەن) ناوێك.

● جارێكی دیكە بانگیان كردم لەسەرئەوەی كەمن ئاگاداربووم لەكودەتاكەی (ناظم كزار) و ڕام كردووە بۆ دەرەوەی ووڵات.

وتیان: پەیوەندیت چیبوو بە(ناظم كزار)ەوە.

وتم لەپێش كودەتاكە بە ٢٤ سەعات من چوومە دەرەوەی ووڵات بەشێوەیەكی ڕەسمی من ماڵ و منداڵەكانم لەگەڵدا بوون. گەڕامەوە (سید نائب) و وەزیری ناوخۆ بەدووررو درێژی ئەم گیروگرفتەیان بۆ ڕوون بۆوە كەمن هیچ پەیوەندییەكم نییە بەو كودەتایەوە لەكۆتاییدا (سید نائب) پیێ وتم: باشت كرد كەڕات كردووە.

● دوای مانگێكی تر دەربارەی حەمەی مەلا شریف پرسیاریان كرد ئەم كابرایە پیاوكوژە تۆ بۆچی ئەو بایەخەت پیێداو كردت بەشۆڕشگێڕ، ئینجا ڕاپۆرتێكی شێولوت ئاراستەی مەكتەبی كارویاری شمال كرد بۆ چارەسەركردنی ئەو كێشەیە؟ باش ڕوون بۆوە بۆمان حەمەی مەلا شریف بنكەی بارەگایەك بوو دروستت كرد پێش ئەوەی جەلال تاڵەبانی بێتەوە بۆ كوردستان (شمال).

● وەلامم دانەوە گرتنی من بوو بەهۆی ئەوەی خەڵك شك لەحكومەت بكات. ئەو كابرایە كردمانە وەكیل بەمانگانەی ٢٠٠ دینار، زۆر خۆشحاڵبوو

بەو شێوەیە حکومەت باوەڕی پێیەتی، بەڵام لەکاتێکدا لەیەکەم ڕۆژەوە کەهەستی کرد ڕەفیق نەماوە، بۆتە هۆی ئەوەی لەخۆی بترسێ.

● چەند جار بەدووورو درێژی باسی ئەو شەڕانەیان لەگەڵ دەکردم کە کاتێك من ئامر بەتالیۆنی تر بووم، وەڵامم دەدانەوە کاتێك کەهاتمەوە، خۆم تەسلیم بەحکومەت کرد، ئینجا گرتەیدوو عنین ناردە بەغداد (عبدالرحمن عارف) کەسەرۆکی ئەرکانی سوپا بوو پرسیاری لێکردم چەند کەس لەنێوە کوژرا لەو شەڕانەدا، کەژمارەیەکم پێ وت ئەوەندە کەس بوو، زۆری لا سەیر بوو، ئەو ژمارەیەی، کەمن پێم وت لەگەڵ بڵاوکراوەی فرقەی دوو جیاوازییەکەی یەك وپەنجا بوو هەر بەو شێوەیەش ئاگاداری (عبدالسلام عارف)م کردەوە ئەو شەڕەو کوژراوی تێدا ئەبێت و برینداریشی تێدا ئەبێت، بەڵام ئێمە ژمارەی بەتالیۆنەکەم ٤١٧ کەس بوون، هێزێکی نیزامی نییە بڵێم هەستن یان دانیشن بەقسەی من دەکەن. ئەوانە لەبیروباوەڕێکەوە دەجووڵێنەوە تەنها دەسەڵاتت بەسەر خۆتا هەیە بۆ بڕیاردان.

● وتیان: وویستوویتە (سید نائب) تیرۆر بکەیت منیش گوتم تکام وایە ئەم وشەیە جارێکی تر مەیخەنە بەرچاوم و گوێم لێ نەبێ، چونکە (سید نائب) لای من ڕێزێکی تایبەتی هەیە، من قەرزاری ئەم زاتەم لەهەموو ڕوویەکەوە. لەژیانمدا کەسم تیرۆر نەکردووە وەبیرم لەوە نەکردۆتەوە بەتیرۆر کردنی خەڵك ببمە خاوەن کۆشك و ئوتومبێل وپارە.

● چەند جارێك خەڵکیان دەهێنا منیان ڕادەوەستان لەشوێنێك لەتەنیشتم دوو کەسی کە ڕادەوستان بەرامبەرەکەم دور لەمن بەپێنج مەتر سەری پێچابۆوە عەینەکی لەچاودا بوو ڕایان دەگرتم ماوەی نیو سەعات منیان ئەهێنایەوە شوێنی خۆی.

● ڕوویەڕوو پێیان وتم ئیتر ئەمە دوا لێکۆڵینەوەیە، دانی پێدا دەنێیت بەتاوانەکانی خۆت یان نا؟

● کێ‌هەیە قینی لێت بێ؟ دوژمنت کێیە؟

وەڵامم دانەوە، بەو جۆرەی کەئێوە لەگەڵ من ئەم هەموو پرسیارو وەڵامەتان لێکردم، گومانم نییە کەنیوەی گەلی عێراق بەعەرەب وکوردەوە دوژمنی منن.

● ڕۆژی نزیکەی بیست وپێنج(٢٥) تاسی و (٣٠) نوێژم دەکرد ڕۆژی دەهەزار جار ئەمووت (الله -سبحانه الله -والحمد لله) ڕۆژانە هەشت سەعات قورئانم ئەخوێند.

وام لێهات دوای نزیکەی ١٠ مانگ، هەموو شتێکم ئەدی و راستەوخۆ ئەهاتە بەرچاوم، بۆ نموونە:

● کەس وکارم هاتبوونە لام وتم: خۆ کمالی برام لەکاتی کەئۆتومبێلەکەی وەرگەڕاوە تووشی ئازار نەهاتووە سەلامەتە (سەریان سوڕما).

● جارێکی دیکە کەس وکارم هاتنە لام پێم وتن نەخۆشی‌یەکەی ڕەوەزی کوڕم خۆ (ان شاء الله) خراپ نی‌یە، دڵم زۆر لایەتی (وایان زانی بوو کەئاگام لەدەنگ وباسیانە).

● جارێك زکیه اسماعیل حقی یان هێنایە مخابرات وابزانم زیاد لە١٠ ڕۆژی پێ‌چوو بەجۆرێك وەڕس و بێتاقەت بووم، چونکە ئەمووت ئێستاکە ئیعترافم لەسەر ئەکات گەیشتمە حاڵەتێك نوێژی نیوەڕۆم نەکرد، وشەی ناشیرینم بەکارئەهێنا، لەکاتێ کەبردیانم بۆ دەست شۆردن گوێم لەدەنگی زکیه بوو کەدەیووت ماڵی باوکم لێرەوە زۆر نزیکە، پێویست ناکات ئێوە بەئۆتومبێل بمگەیەنن، ئینجا دەستم کرد بەپاڕانەوە لەخودای گەورەو تێر تێر گریام، داوام کرد لەیەزدانی مەزن کەلەم گوناحەم خۆش بێ.

● مانگی ڕەمەزان بوو دوای چوارەمین ڕۆژ ئێوارەکەی پێش بەربانگ، تەماشای سنی‌یەکەی خۆم کرد، بریتی بوو لەسەمونێکی عەسکەری و لەقاپێ ماستی ترشاو و شەش دەنك خورما. لەدڵی خۆمدا لەگەڵ خۆم قسەم دەکرد وتم: خوایە من باوك وباپیری خۆمم دیتووە بەدەوڵەمەندی، خۆشم دەوڵەمەند بووم، بەقوربانت بم ڕۆژو واناگیرێت، زەحمەتە، ئاورێکم لێبدەوە. هەر لەگەڵ خۆم ئەو قسانەم دەکرد. لەپڕدا دەرگا کرایەوە کاریەدەستێکی مخابرات هاتە ژوورێ پرسیاری کرد ئایا بەڕۆژوویت؟ خواردنەکانت چی‌یە؟

وتم: نانی بەیانی تەنها ماستەکەی هەڵدەگرم، نانی نیوەڕۆ کەبۆم دێت وەکو خۆی دەگەڕێتەوە چونکە ساردەبێتەوە و ڕۆنەکەی دەمەیێت، ژەمی سێیەم کەنانی شەوە دوای بەربانگ کردنەوە بەسەعات ونیوێك دێت ئەویش بۆ پارشێو ئەو سوودەی نابێت.

وتی: کەبانگی دا ڕۆژووەکەت بشکێنە نوێژ بکە، بەڵام ئەوان مەخۆ دوایی نیو سەعات هاتەوە ژوورێ کیسێکی ڕەشی دانا و ڕۆیی، کەکردمەوە مریشکێکی مەحشی تێدا بوو، دەستم کرد بەخواردنی لەسنگەکەو برنجەکەی نیازم وابوو ڕانەکانی هەڵگرم بۆ پارشێو، کاربەدەستەکە هاتەوە ژوورێ وتی: بۆ تۆ چۆن باشە لەمانگی ڕەمەزان بەدوو جۆر خواردنت بۆ دێ ژەمێکیان (مشوی مشكل) واتە گۆشت وکەباب و ژەمەکەی تریان مریشك.

وتم: سوپاسی هەستی برایانەت دەکەم، لوتفتان زیاد بێ، خودای مەزن ڕەحم بەهەموو هەژارێك و لێ قەوماوێك بکات، بۆ ئێوارەکانی (مشوی مشكل) باشە بۆ پارشێویش مریشکەکە.

● لەوکاتەی ئازارو ئەشکەنجەیان ئەدام بەجۆرێك ئەو دینە ئیمان و باوەڕی وا بەهێز کردبووم کەوا دەهاتە بەرچاوم کەئەمە شانۆیە.

● دوای چاکردنەوەم هەواڵیان دا(مسح دماغ)کەمێشکم پووچەڵ بکەنەوەو دەست لەئیشی خودا بدەن، بەگەورەیی خۆی شتێکی پێنیشان دام کەچارەسەری ئەم هەڵوێستەی بەعس بکەم. ڕۆژانە (دوای ١٠مانگ) هەستم وای لێهات کەلەسەیرانم، من بەند نیم. پرسیارم ئەکرد ئایا من لەسێدارە دەدرێم؟ پێیان ئەوتم لەسێدارە نادرێیت و ئەو شوێنەیان ئەخستە بەرچاوم کەڕووی تێدەکەم، ڕاستیەکەی کەحوکم درام چوومە ئەو ژوورەی کەهاتبووە بەرچاوم. کاتێك کەحوکم درام و هاتمە بەندیخانە ناو خەڵك، تووشی قسەوگفتوگۆ ڕوویەڕوو لەگەڵ خەڵك، ژن وپیاو، ئەوەی کەئەمدی پێشووتر هیچی نەما.

کاتێك کەلەئاسایشی گشتی گواسترامەوە بۆ مخابرات ئەمە دووەم جارە لەگەڵ کەس وکارم یەکتر ببینین، ئەویش لەمانگی تەمموز /١٩٧٧ بوو.

(( چونکە پێشتر ڕوویاری کچم تەلەفۆنی لەگەڵ صدام کردبوو داوای لێئەکات و دەپاڕێتەوە کەلووتفی بفەرموێت بۆ بڕیاری بەردانی من.

صدام ئەڵێت: (سید رفیق) خیانەتی لێکردووم ئەبێت لە(باب شرقی) هەڵیواسین، پارچە پارچەی بکەین، بەڵام لەهەمان کات من مامتانم چیتان ئەوێت و پێویستتانە، مانگانەو شتی تر بۆتان جێبەجێ بکەم، تۆ منداڵیت نازانیت سیاسەت چییە.

ڕووبار ئەڵێت: سوپاستان ئەکەین یارمەتی ماندی مان ناوێت. ئەگەر ئەمز بفەرمووێت چاوێکمان بەباوکم بکەوێت.
صدام ئەڵێت: بەیانی سەعات ١٠ لەئاسایشی گشتی چاوتان پێ ئەکەوێت))
پێم گوتن ئەمە دووەم جارە بەدیتنتان شاد ئەبم )دایکم و کەمال ودایکی بازیان ڕووبار ویازیان و ڕەوەز وخەرمان وشلێر و حەسەن ونادر).

## • ئازارو ئەشکە نجە :

چاویان بەستمەوە، بردمیانە ژێر خانێك ١٠م x ٧م بوو، چۆن ماکینەی ئوتومبێل هەڵدەواسن بەهەمان شێوە دووی لەم جۆرە لێبوو، دەستیان کرد بەلێدانم بەکێبڵ، لەهەمان کاتدا وا هەست دەکەی کەلەناو دارستانێکن ڕاوی مامز دەکەن، دوانزە ڕۆژ بەم شێوەیە ئازارو ئەشکەنجەیان دام بەقاچ هەڵواسین، بەدەست هەڵواسین، بەکارەبا، نینۆکەکانیان هەڵکەندم، ناوە ناوە لەپشتم بەقەدەر دەنکە نۆکێك گۆشتیان لێدەکردمەوە، بیست وچوار سەعات میوانی کورنێك بووم لەژوورەوە بەیەکەوە لەژێر دیواری بەرزایی ١ م بووین، پانایی ژوورەکەش ١ م بوو، زمانیان وا لێ کردبوو بەقەدەر زمانی گوێرەکەیەکی لێ هاتبوو، خۆی نەدەناسییەوە، بەجۆرێك وا ترسا بوو چۆن کەچوومە ژوورێ بەچیچکانەوە دانیشتبوو هەروا دانیشت، هەتا هاتمە دەرێ، وام لێهات وەکو منداڵێکی شەش مانگان بجووڵێمەوە، کەگەیشتمە ئەوەی واگیان ئەدەم بەپێی ڕای دکتۆر کەبەئنگلیزی قسەیان لەگەڵ دا ئەکات ئەڵێ ئەمە واگیان ئەدات. خۆشم ئەوە ئاواتمە ڕزگارم بێت، خۆ ئەگەر شتێك هەبێت ئینتیحار ئەکەم، لەپاڵ ئازارو ئەشکەنجەدا، هەوڵیان دەدا کەنەخەوم، هەرچەندە ئازارو ئەشکەنجە وای لێکردم کەبەم جۆرە چاووم بەخۆم دەکەوت لەوتەمەنەدا میز بەخۆمدا بکەم، بەناچاری هاوار هاوارم دەکرد، جارجاریش دەگریام، ئەوەندە وەڕس بووم تەمەننای مردنم ئەکرد.
کەڵکی ئەوەم نەما کەبەپێوە ڕاوەستم، لەسەرکورسییەك دایان نابووم، قاچەکانی دوو مەتر لەسەر زەوییەوە دوور بووە، لەملمەوە تاسەرم دەستیان بۆ درێژ ئەکردبوو، لەئەژنۆم و بەرەوخوار تاوەکو کۆتایی قاچم

بەجۆرێك ئاوسا بوون لەگەڵ ڕانم لەیەكتری ئەكەوتن. هەردووك دەستم لەنێش كەوتن میزو خوێن وپیسایی تێكەڵببوو، دوای ئەم هەموو تۆپ تۆپێنەی پێیان كردم. ئینجا دەستیان كرد بەپاڕانەوە، ئەیان وت: تكات لێئەكەین پێش ئەوەی بمریت، چی ئەزانیت پێمان بڵێ، ئەمە بۆخۆشت باشە و بۆ ئێمەش، ئایا ئێمە ئەتناسین؟ دوژمنایەتیمان هەیە لەگەڵ تۆ؟ دوانزدە ڕۆژە ژیانت لەئێمە حەرام كردووە؟!

لەكاتێ ئازارو ئەشكەنجە ئەدرام تەمەنای مردنم ئەكرد، زۆر هیلاك و ماندوو بووم لەپڕێكدا وێنەی ئەو پیاوەی تەمەنی ٦٠ ساڵ بوو، چەند ساڵێك پێش ئێستا هاتە بەرماڵمان و داوای خواردنی كرد، پارەم دایە و وتی برسیمانەو ژنەكەم كۆچی دوایی كردووە و هەشت منداڵم هەیە، هاتە بەرچاوم.

كاتێك خواردنەكەی وەرگرت، دایكم بانگی كرد، لەبەیانی‌یەوە هەموو ڕۆژێك وەرە خواردن بەرە بۆ خۆتان، برادەرێتیمان پەیدا كرد، ڕۆژانی هەینی لەگەڵ هەشت منالەكەی ئەهاتن و مانگی مقداری حەوت دینارم ئەدایە.

بەخۆیی و منداڵەكانی قسەیان لەگەڵ ئەكردم، دڵییان ئەدامەوە ئەیان ووت مەترسی ی هیچت بەسەر نایە ڕزگارت ئەبێت خۆم ومنداڵەكانم لەخودای مەزن ئەپاڕێینەوە دوعای خێرت بۆ ئەكەین (انشاء الله) سەلامەت ئەبیت منیش ئیمانم بەهێز دەبوو زەردەخەنەم ئەهاتێ، قەسابەكانی بەعس وایان ئەزانی خەریكە شێت بم، ئەوكاتە هەستم كرد بەوەی كەڕاستیەكەی دڵم كرایەوە ئەوەندە هەست بەئازار ناكەم وا لەبەرچاوم هەر هەشتیان دانیشتوون (خێر كردن بەهەژارو لێقەوماوان لای خوای مەزن هەرگیز گووم نابێت).

لەدڵی خۆمدا لەگەڵ خۆم قسەم ئەكرد ئەمگوت: چیم لەگەڵ بكەن تۆڵەی خۆتان ناكەنەوە، ئێستاكە شانازی پێوە دەكەم كەدوژمن (صدام) بەم شێوە دڕندانەیە لەگەڵ من دەجووڵێتەوە. بەداخەوە ئەوەی منی پێ‌دڵتەنگ بكات، منیان هێنایە خوارێ لەسەر كورسی‌یەكە بەچاو بەستراوی خستمیانە ناو بەتانی‌یەك، لەجێگایەكیان دانام، لەناو ژوورەكە پاڵ كەوتم. دوای ماوەیەك هەڵیان گرتم و بەدوو دەست لەسەر قەنەفەیەك دایاننام، پەڕۆكەیان لەسەر چاووم لابرد، كەچاوم كردەوە دیم بارزان تكریتی‌یە (مدیری مخابراتی عامە) وتی: رفیق وا تۆ گیان لەدەست ئەدەیت، خۆت دیوە بەو شێوەیە خوێن بەو

شێوەیە لێت دێتە خوارێ ئیعتراف بکە، چاکت دەکەینەوە، بەشەرەف ئەتنێرمەوە لای (حاجی)یە واتە دایکم، بیری منداڵەکان ناکەیت؟

دەمگوت پێشینان ڕاستیان وتووە پەشیمانی سەرە مەرگ بێ سوودە.

لەکاتێکدا کەگەیشتمە ئەو باوەڕە نەمانی صەدام ئەبێتە هۆی گۆڕانێکی یەجگار سوودبەخش بۆ هەموو دانیشتوانی عێراق بەتایبەتی کورد، خۆم بەخۆمم ئەوگوت دوو جار بۆم هەڵکەوت کە(صەدام تکریتی) تیرۆر بکەم، ئاخم هەڵئەکێشا کەهۆی چی بووە تیرۆرم نەکرد بەقسەی ئەم برامەزنەم نەکرد کەوتی رفیق ئەتوانی صدام بکوژێت، بۆچی بەقسەم نەکرد، ڕاستە لە سێدارەیان ئەدام، بەڵام لەئێستای کەمن تێیدا ئەژیم بەم شێوەیە کەخۆم بەم جۆرە ئەبینم گەلێك باشتر بوو.

دەگوت نەمان وتیرۆرکردنی ئەبێتە هۆی گۆڕانێکی یەجگار سوود بەخش بۆ هەموو دانیشتوانی عێراق، بە تایبەتی کوردو شیعەو عەرەب.

وتم: گرنگ ئەوەیە تۆ بم بینیت کاتی خۆی منت دیوە هیچ جارێك بەم شێوەیە هاتوومە لات کەخوێن لەگەڵ مێز تێکەڵ بوویێت، پێخواس، هەردوو دەستەکانم لەئیش کەوتووە، قاچم بەشێوەیەك ئاوساوە لەگەڵ ڕانم جیاناکرێتەوە؟ بێدەنگ بووم.

هەڵسا چووە دەرەوە ڕووی کردە (قەصابێك) ئەوەی سەرپەرشتی لێکۆڵینەوەو ئازارو ئەشکەنجە ئەکات و پێی گوت بەکەیفی خۆتان بکەن.

بارزان پێی گوت: ئیشی خۆتان تەواو بکەن لەگەڵی من دوو سەعات زیاتر مامەوە لەسەر قەنەفەکە ئینجا کەبارزان ڕۆیشتە دەرێ دوای ماوەیەك قەصابەکەش چووە دەرەوە.

لەدوایی دا فریشتەیەك (قەصابەکە) هاتە ژوورێ (بين المغرب والعشاء يفعل الله مايشاء) دەست بەجێ وردە وردە لەسەر خۆ، سێ دۆڵکە ئاویان بەدەمدا کردم، پێنج کوپ چایان بەدەم دا کردم، ئینجا بردمیانەوە ژووری تەدلوی تایبەتی خۆیان، لەهەمان خانوو لەنهۆمی دووهەمدا، بەپەلە چەند دکتۆرێك هاتنە سەرم فەحصی هەموو گیانیان کردم، وتیان، نەخۆشی دڵت نییەو یەکسەر عەمەلیاتیان کرد بۆ ئەوەی تووشی نەخۆشی کانگرین نەبم، لەسەر پشتی قاچم لەسەرووی پەنجەکانەوە بەقەدەر شقارتەیەك لەگۆشتیان بڕی. تاکو چاکیان کردمەوە، ڕۆژی چوار جار دکتۆرەکان ئەهاتنە

سەرم، ئەوەندە پێمەوە ماندوو بوو. بوون سەرم سوڕما بوو ئەبێت مەبەستیان چی بێت؟ لایان هەرە گرنگ بوو کەمەرلوو دەستەکانم ئیش بکات، وەکو منداڵێکی پینج مانگ نەبوو یەکێك بێت لەگەڵم بۆ تەوالێت پاکم بکاتەوە.

ڕۆژێك دکتۆرێك هاتە سەرم، کە ئەمە یەکەم جاربوو ببینم ڕێگەی پێ نیشان دام، ئەویش وەرزشە بوو بۆ چاك بوونەوە.

## • لەمانگی نیسانی ١٩٧٨ ( محكمە الپورە ) دادگای شۆڕش

### یەکەم دانیشتن:

سەعات شەشی سەرلەبەیانی دەرگایان کردەوە، تاقمێ ڕیش تاشینیان دامێ، ئینجا بردیانم بۆ حەمام، جلەکانم لەبەرکرد لەسەعات ٨٫٥ سواری ئوتومبێلیان کردم لەگۆڕەپانی دائرەکەوە کاتێك چوومە ناوەوە سەرنجم دایە وا شەفیقی براشم دانیشتووە.

پرسیارم کرد لەچەککدارەکانی مخابرات چیمان لێ‌ئەکەن؟ بۆچی شوێنێك ئەچین ئەمانە وەکو منداڵی ساوا جارێ زمانیان نەگرتووە کاکە شەفیق بۆیە هیچمان پێ نالێن کاتێك کەگەیشتینە (کەڕادە) لەبەردەرگای شۆڕش (محكمة الثورة) ڕاوەستابووین.

لەداڵانێکی گەورە دایان نابن، کورسی‌یەکیان بۆ من هێنا لەسەری دانیشتم، چەند کەسانێکی لێ بوو سەرنجی ڕاکێشان؟ ئەمە کێیە کورسی بۆ دێنن؟ ڕەنگە شاهد بێت یان ئەفسەرێکی مخابراتە. ئێمە یان بردە ژووری سەرۆکی‌ی دادگای شۆڕش.

سەرۆکی ودوو یاوەرەکەی لەگەڵ (مدعی عام) و دوو کاتب لەم سەرو ئەوسەری ژوورەکە دانیشتبوون. من و شەفیقیان ڕاگرت بەرامبەریان.

سەرۆکی دادگا چەند پرسیارێکی کرد؛ ناوتان چی‌یە؟ دوایئەمە هاتینە دەرێ، دولخرا بۆکەی؟ نازانم و پێت نالێن.

**بارزان تكريتي؛ كە ئيستا خۆی بە (بەرزان تكريتی) ناودەبات كابرايەكە:-**

١-باسی ڕەوشت و هەڵسان و دانيشتنی ناكەم، چونكە گەلی عێراق لە ١٠٠٪ ئەمە ئەناسن پێويست بەپروپاگەندە ناكات.

٢-كەدوور خرايەوە لەمخابرات بەفەرمانی (صەدام تكريتی) گوايە دەوڵەتێكی دەرەوە گفتوگۆی لەگەڵ كردووە بۆ ئەوەی بێتە جێنشينی صدام. ئەمەش لەڕاست ئەكا، چونكە صدام باوەڕی پێ نەمابوو لەو ڕۆژەوە، هەرچەندە لەناو خۆياندا وايان بلاّودەكردەوە كەلەسەر ژن هێنانە(ڕازی نەبووە بەوەی كچێكی صدام شوو بكات؟!).

٣-ئێمە بەيەكەوە ناسياوی يەكی باشمان هەبووە هاتوچۆی يەكترمان دەكرد جارجاريش هەنگوين و ماستيشم بۆ دەبرد، ڕۆژێك پاسكيلێكم بۆ برد بۆئەوەی خۆی زەعيف بكات.

*** ( محكمة الثورة ) دادگای شۆڕش لەمانگی مايس /١٩٧٨: جەلسەی دووەم:**

ئامادەيان كردين (ڕيش تاشين و حەمام كردن و جل لەبەركردن) سەعات ٨ ئێمەيان بۆ دادگای شۆڕش برد، لەسەعات ٩ چووينە ژووری سەرۆكی دادگا، كەبريتی بوون لەمانە:

١-سەرۆكی و دوو ياوەر و مدعی عام و دوو كاتب يەك بانگكەر هەشت (انضبيبات).

٢- (مدعی عام) تاوانەكانی يەك لەسەر يەك خوێندەوە وتی: چوار جار هێرشت بردۆتە سەر سوپای عێراقی، بوويتە هۆی كوشتن و بريندار كردنی چەند سەربازێك ڕوون بۆوە كەدەستێكی بالآتان هەبووە لەوەی كەكۆمەكی بارزانی بكەيت، ئەو شتە نهێنيانەی كەشاراوەيە تايبەتە بەحكومەت دلوتە بە(بارزانی) لەڕێگەی ئەوانەوە گەيشتۆتە دەست ئێران وئيسرائيل، پەيوەنديت هەيە بەكۆمەڵە لەگەڵيان بەنهێنی ئيش وكارت بۆ كردوون، سەردانی ئەو تاوانبارانەت كردووە كەحوكم دراوون بەسێدارەو چوويتە

لایان بۆ بەندیخانە، بەشدار بوویت لەکودەتاکەی (ناظم کزاری)، پیاو کوژو تاوانبار (حەمەی مەلا شریف)ت کردۆتە نیشتمان پەروەر، بەهۆیتۆوە توانیویەتی بارەگایەك دابنێ بۆ حەسانەوەی پێشمەرگەو ماڵ و منداڵیان و شەخصی (جەلال تاڵەبانی) لەمە زۆر سوودی وەرگرتووە، لەرێژی هەلگیرسانەوەی شەڕ کەبەسەرۆکایەتی جەلال دەستی پێ کردووە لەهەموو جوولانەوەیەکی چ نزیك، یان دوور بەشدار بوویت، هەوڵت داوە بۆ ئەوەی یارمەتی ئەم بەکرێ گیراوانە بدەیت، توانیوتە لەخەزێنەی دەوڵەت پارەیان بۆ وەرگریت. داوا لەسەرۆکی دادگا دەکەم کەگەورەترین سزا بەسەر ئەم تاوان بارە بدەن کەئەویش لەسێدارەدانە، براکەشی نامەکانی بردووە بۆ (مسعود بارزانی). داوای حوکمی ٢٠ ساڵ دەکەین بەسەری بسەپێنن، ئینجا کەمدعی عام تەواو بوو لەخوێندنەوەی دارشتنی تاوانەکانی من دانیشتەوە.

٣-سەرۆکی دادگا وتی: بانگی شاهید (حبیب محمد کریم) بکەن، بانگ کەر داوای (حبیب محمد کریم)ی کرد.

ناوت: حبیب محمد کریم

ئیشت: فەرمانبەر

سوێند بخۆ کەراست ئەڵێیت و چی ئەزانی بەرامبەر (رەفیق مامە صادق) (دەستی بۆ سەر من درێژ کرد) (حەبیب گوتی): بەهۆی (رەفیق) بەشی زۆری دەنگوباسەکانی حکومەتمان ئەزانی، ئاگاداری دوو نامەم کەبۆ شۆرشی نارد یەکسەر پەیوەندی بەدەزگای پاراستنەوە بوو، کەبەسەرۆکیایەتی (مەسعود بارزانی) بوو، لەرێگای (شەفیقی) برای نووسراوەکانی ئەنارد.

سەرۆکی دادگا لێی پرسیار کرد وشەی مامە بەعەرەبی چییە، حبیب وتی: وشەی مامە کوردییە بەعەرەبییەکەی مانای (العم) ە سەرۆکی دادگا وتی: رەفیق تۆ ئەڵێی چی:

وتم: ئەم مرۆڤە دوژمنایەتی هەیە لەگەڵمدا.

ئەمە لەگەڵ (....) رای ئەبوارد و شەخسی (بارزانی) ئەمەیباش دەزانی جارێکیان رووبەروو (بارزانی) ئاگاداری (حبیب محمدکریم)ی کردبوو،

(حبیب) بەو شەهادەتەی ئەیەوێت ئێوە بڕیار بدەن لەسەر سێدارەدانی من.
حبیب وتی: سەرۆکی تکایە پارێزگاریم لێبکە لەزمانی رەفیق.
وتم: جەنابی سەرۆکی نێوان من و پەتی سێدارە یەك مەترە ئەوە سەرۆکی لەگەڵ هەردوو یاوەرەکانی و مدعی عام، ئەمەش شاهید کەکێشەی من تەواو بووە، بەڵام حبیب ئەزانێ ڕۆژێك زیندوو بوومەوە ئەیخۆم، بڕوانە لەسێبەرەکەم چەند ئەترسێ.
ئنجا حبیب چووە دەرێ.
سەرۆکی داوای لەپارێزەر کرد، ئەویش هەموو ئەو تاوانەی (مدعی عام) خستبوویە پاڵ من دانی پێدا نا.
بەڕاستی ئەمەم نەئەزانی کەشانۆیەکە ئاشکراو ڕوونە و کەئەوەیە دەسەڵاتی مەحکمەی (ثورة).

## تێبینی:

گەڕاینەوە مخابرات هەریەکەمان چووینە ژووری خۆمان بەیانییەکەی دەرگا کرایەوە زۆر زوو بوو (فلان) هاتە ژوورێ وتی: لەسێدارەت ئەدەن، وتم: ڕاکەم، وتی: من ئەڵێم ڕاکە، وتم: خۆم بکوژم، وتی: تۆ مرۆڤێکی زاناو تێگەیشتووی زۆرم لاناخۆشە لەسێدارە بدرێیت، ئەڵێم فکر بکەرەوە خۆت ڕزگار بکە ئەمە دەسەڵاتی منە.

## تێبینی:

١-وەسیتم(وصیة) کردووە بۆبازیان و ڕەوەزی کوڕم ئەگەر ئەم مرۆڤە هاتە لاتان تەنها خێزانەکانتان نەبێت، چی پێویست بوو بۆی جێبەجێ بکەن.
٢-سێ ڕۆژ لەسەر یەك فکرم دەکردەوە، چی بکەم، قورئانم بەرزکردەوە هاوارم ئەکرد بۆ خودای مەزن ڕێگەم پێنیشان بدە، لەئەنجامدا ئەم بڕیارەم پەسەند کرد.

● صدام (نقاط ضعفي) خاڵی لاوازی چی‌یە؛ و چۆن لەو موقفە بەکاری بێنم.

بۆ نموونە:

١-جارێکیان تەلەفۆنم لەگەڵ صدام تکریتی کرد ئەمەوێت چاوم پێت بکەوێت وتی: چیت دەوێت ئەمن.

وتم: تێوە گلاوم.

وتی: کێ تۆی تێوە گلاندووە.

وتم: تۆ...!

وتی: بۆمن خەڵك تێوەگلێنم ؟.

وتم: نیوەی گەلی عێراق تێوە گلاوە بەهۆی‌تۆوە.

وتی: (بیین لاحگ تعال بالعجل) بەغدایی کەباینجان پێ‌دەگات ئەڵێن (لاحگ)، دیارە پێگەیشتووە وەرە بەپەلە.

٢-جارێکیان لەگەڵ صدام گفتوگۆم دەکرد، لەبەرواری ١٩٧٦ باسی بارودۆخی سیاسی ئەم رۆژەم بۆ ئەکرد کەلەبەیروت تازە هاتبوومەوە.

صدام قسەکەی بریم و وتی: ئێستاکە کاتم نی‌یە کەگوێت لێبگرم، چونکە لەگەڵ هاورێیەکی کۆن بەیەکەوە ئەبین و گفتێکی دانیشتنی سیاسیم هەیە دوای رۆژێکی دیکە ئەنێرم بەشوێنتا.

وتم: ماوەیەکە لەبەیروت بووم ئەمەوێت ئەمەت بخەمە بەرچاو کەشتی گرنگ هەیە بەباشی نازانم دوابکەوێت، باتەم باسانە پێکەوە باس بکەین.

وتی: ئەمە دووهەم جارە پێت رائەگەیەنم ئەڵێم ئەنێرم بەشوێنتا.

وتم: (هناك مهم واهم) واتە گرنگ وگرنگتریش هەیە.

وتی: هەڵسە لێرە برۆ دەرەوە.

وتم: ئەتۆ ئەسوپای عێراق ئەبەعس هێز نی‌یە من دوور بخاتەوە لێرە تاکو قسەکانم تەواو نەکەم.

صدام پشتی تێکردم ووردە ووردە رووەکاتەوە من دوو پەرداخ شیری خواردەوە یەك لەدوای یەك.

قسەکانی من دەربارەی کێشەی کورد لەعێراق لەحکومەتی شێخ محمودی ئەمرەوە تاوەکو هەرەسەکەی بارزانی و واجارێکی دیکەش شۆرش دەست

پێدەکاتەوە، ئەمە نزیکەی دووسەعاتی خایاند، کەتەواو بووم ئەوەی ئەم زانی پێم وت بۆ بەرژەوەندی وڵات، هەڵسام بڕۆم.

ووتی: تۆ بۆچی شوێنێك ئەچیت وا کتوپڕ هەستایت.

وتم: ئەچمە مەرکەزی پۆلیسی وەشاش (مرکز شرطة الوشاش) یان مەرکەزی شرطەی منصور (مرکز شرطة المنصور) پێیان ئەڵێم من دەست بەسەرم بەفەرمانی (سید نائب).

وتی: بۆ من ئەڵێم (موقوفی) واتە دەست بەسەری !

وتم: بەرێزتان ئەڵێن بڕۆ دەرەوە.

وتی: دانیشە، پرسیاری کرد( بابەکر ئاغا) چیتە؟

وتم: (بابەکر ئاغا) بەخزمایەتی هیچی من نییە.

وتی: (بابەکر ئاغا محمود )ئەڵێم ئێوە خزمایەتیتان هەیە من وا سەرنجی راکێشاووم.

وتم: من بەرەگەز خەڵکی (کۆیسنجاق)م، بەڵام باپیرم ١٥٠ ساڵە هاتۆتە پشدەرو جێنشین بوویین لەقەڵادزێ و بەلەقبی پشدەری ناسراوم، ئێمە بنەماڵەیەکین نزیکەی ٩٠ خێزان ئەبین سوقاقی نین جێگای خۆمان کردۆتەوە، باوکم دۆستێکی دێرینی (محمود ئاغا)و بەگزادەی (ئاغاواتی پشدەر) بووم و خۆشم دۆستێکی هەموو ئاغەواتی پشدەرم و لەگەڵ (بابەکر ئاغا) لەبرا نێوانمان خۆشترە، من شانازی پێوە دەکەم، باوکم پیاوێکی کاسب بووە، منیش بۆخۆم توانیومە جێی خۆم بکەمەوە، گەیوومەتە ئامر بەتالیۆن لەناو پێشمەرگە، بەرێزتان داواتان لێکردم کەلەگەڵتان بەتایبەتی ئیش بکەم لەنزیکەوە.

((بابکر ئاغای محمود ئاغای پشدەر:

یەکێکە لەبنەماڵەئاغاکانی میراودەلی، سیاسەتمەدارێکی کورد، دڵسۆز و نیشتمان پەروەر، پارێزەر، خوێندەوار، زیرەك، ئازا، سەخی، ناسراو لەناو گەلی عەرەب و کورد، دەیێ هێزۆ جێگای پشوودانی هەموو کوردێکی سیاسەتمەدار بووە، کەپشووی تێدابدات و بحەسێتەوە وە حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و پارتی بحەسێنەوە لەوێ هەندێك جار نووسینەکانی بڵاودەکردەوە، لەحکومەتی بەعس چەند جار پلەی

وەرگرتووە، بەوەزیری، ئێستاکە ئەندامێکە لە (جامعة الدول العربية).))
وە هەروەها ناظم کزاریش کەبەڕێزتان باش دەزانن.

سەدام وتی: سید رفیق هەردووکمان زۆر لێك ئەکەین ئێمەش لەخێزانێکی سوقاقی نین، خۆمان توانیومانە بەدەستی خۆمان پێبگەین، من کوڕە پێنیسم، تۆ مرۆڤێکی ئازاو زیرەك، منیش ئازاو زیرەك، هەڵستا ئەم لاو ئەولای ماچ کردم

## تێبینی:

١-تیشکم خستە سەر ئەم دووخاڵەی کەلەسەرەوە دەقی ڕووداوەکەم نووسیوەتەوە کەڕوویەڕووی صدام ڕاوەستام.

٢-بیست وحەوت ڕۆژ لەسەریەك ڕۆژانە سێجار لەگەڵ خۆم دەرسەکانی خۆم ئەگوتەوە کەئەو ڕۆژەی ڕوویەڕووی سەرۆکی دادگای شۆڕش لەبەردەمیدا ئەم قسانە بکەم لەئەنجامی ئەو ماوەیە بەتەواوەتی دەرخم کرد سەرنجی سەعاتم دایە دوو سەعات و شتێك زیاتر، ئینجا کۆتایی بەقسەکانم ئەهات.

## لەمانگی تەمموزی ١٩٧٨: ( جەلسەی سێهەم )لەدادگا:

بەیانییەکەی سەعات هەشت ونیو لەگەڵ شەفیقی برام بردیانین بۆ دادگای شۆڕش.

لەژێرزەمینی دادگاکە دایاننایین ڕووم کردە کاکە شەفیقم وتم: من دان بەهەموو تاوانەکانی خۆم دا ئەنێم (ئیعتراف ئەکەم).

شفیق وتی: بۆ شێت بووی ئەمشەو خەونم پێوە دیتی لەخەونم دا چاکەتێکی عەسکەریت لەبەربوو ئەستێرەکانی سەرشانت ئاڵتون بوو خەڵکی کەلار بەپیرتەوە هاتبوون، برا ئەم هەموو ئازارو ئەشکەنجە دراین ئیعترافمان نەکرد لەم دواییەدا ئیعتراف دەکەیت؟!!

وتم: خەونەکەت ئەمە جەنازەکەمە بەکەلاردا دەمبەنەوە ئەستێرەکانیش ئەوە جاجمێکی سوورە بەسەر تابوتەکەمدا دەدەن. گوتم کاکە شتێکم

بەدەستەوەیە بیست وحەوت ڕۆژە خۆمم بۆ ئامادە کردووە چیم کردووە، چی دەزانم و چی پێشنیارێکم پێشکەش کردوون بۆ بەرژەوەندی وولاتەکە هەمووی دەخەمە بەرچاو، لەگەڵ هەموو کەموکوڕییەکیان زۆر بەتوندی ئەجوولێمەوە، تاکو قین و کینی صدام ڕووبەڕووی خۆم هەمووی بێنێتە دەرێ ئەوکاتە یا پەتەکەم لەمل لائەدەم یا لەسێدارە دەدرێم.

باش بزانە ئەمەی ئیمڕۆ کەڕوو ئەدات ئەمە دوا تاقیکردنەوەمە لەژیانم دا سەرکەوتوو بم یان تیابچم

بەهەرحاڵ قسەکانی ئیمڕۆم بڵاو دەبێتەوە لەناو دۆست و دووژمن ڕۆژێکیش دێت کتێبێك لەسەر ئەو دادگایەی من بڵاودەبێتەوە.

چووینە ژووری سەرۆکی‌ی دادگا.

سەرۆکی‌ی دادگا، تاوانەکانی منی یەکە یەکە باس کرد کەئەمە بەپێی بڕیاری دادگا وا بڕیارمان دا لەبەرئەوەی تاوانبارە، دەست بەجێ من بۆخۆم پەنجەم هەڵبڕی داوام لەسەرۆکی‌ی دادگا کرد کەڕێگەم پێ بدا دوو دەقیقە قسە بکەم.

سەرۆکی‌ی دادگا وتی: کورسی بۆ بێنن دیارە توانای نەماوە و پەکی کەوتووە و ڕووخاوە کورسی بۆ بێنن بالەسەری دانیشێ پەرداخێك ئاویشی بۆ بێنن بابێتەوە سەرخۆی.

وتم: سەرۆکی دەمەوێت ئیعتراف بکەم، کەوام گوت سەرۆکی‌ی دادگا لەجێگەی خۆی لەسەر کورسی‌یەکە تەکانێکی دا.

وتی: هۆی چی‌یە کەتۆ دەتەوێت ئێستا ئیعتراف بکەیت؟!

پێم گوت: جەنابی سەرۆکی من باش ئەزانم کەحوکمی لەسێدارەدانم بەسەردا ئەچەسپێنی، بەڵام ئەندامانی (مجلسی قیادەی ثورة) بەتایبەتی (سەرۆکی بکرو سید نائب) ڕازی نابن بەوەی کەمن لەسێدارە بدرێم، بەڵام من ئەوەبڕیارمە بەریشم بدەن ئەوەی کردوومە و تاوانەکانم نووسراوەلای ئێوە جارێکی کە بەهەمان ڕێگادا بڕۆم بنەماڵەی ئێمە تەنها من سیاسیم نامەوێت بەهۆی منەوە کەس وکارم هیچی تر تووشی ئازارو ئەشکەنجەو دەربەدەری بن، ئەوەتابراکەم کاسبە بەهیچ جۆرێك پەیوەندی بەمنەوە نیە لەبارەی سیاسەتەوە ئەوە شانزە مانگە دوورە لەماڵ و منداڵی.

جەنابی سەرۆکی من دەمەوێت چیم کردووە دژی حکومـەت ڕاستی‌یەکانی هەمووی بخەمە بەرچاو لەدانیشتنێکی زۆر نهێنی بێت بەڕێزتان خۆتـان ئـەو خەڵکانە دەمێڵنەوە لەژووری دادگا چونکە باسەکانی من پەیوەندی بەقادەی شۆڕشەوە هەیە بەشی زۆری هەمووی خەتەرناکە.

پرسی: عەرجەکانت چی‌یە ؟

وتم: بەتەلـەفۆن ڕازی بوونـی (مجلسـی قیــادەی ثـورة) وەردەگـری کەلەدوای ٤٨سـەعاتی دیکـە لەسێدارە بدرێم نامـەوێت کـەس وکـاری خـۆم چاوپێکەوتنیان لەگەڵبکەم ئەوە شەفیقی برامە شاهیدەو ئاگـادارە لەهـەموو ئەو قسانەی کەمن کردوومە.

ئێمە گەڕاینەوە بۆئەو شـوێنەی کـەلێی بووین دوای مـاوەی نیـو سـەعات بۆجـاری دووەم هاتینـەوە سـەرۆکی دادگـا دەرگاکانیـان داخسـت هیـچ ئینزیاتێکی لێنەمابوو، کورسی‌یەکیان بۆ دانام و پەرداخێك ئاویـان بـۆ هێنـام پەرداخەکـەم گـرت لەدەسـتم کەوتـە خـوارێ شـکا، ئینجـا وا کەوتمـە بەقسەکردن.

بەڕێز جەنابی سـەرۆکی تکایەکی کـەم هەیـە کەقسـەکانم نەکـەم ڕێگـەم پێبدەیـت هـەتاکو کۆتـایی پـێ دێنـم دوایـی ئامـادەم وەڵامـی هـەموو پرسیارێکتان بدەمەوە:

# بسم الله الرحمن الرحيم

## حب الوطن من الايمان

گەورەم جەنابی سەرۆکی بم بەخشە کاتێکی زۆرت لێ وەردەگرم بەڵام دڵنیام قسەکانم بۆ ئێوە سوودێکی گەورەی لێوەردەگیرێت بۆ منیش ڕزگارم دەبێت و ئەچمە دنیایەکی دیکە.

پێشەکی سوپاسی ئەو خوا گەورەیە دەکەم کەکوردم و ئایینم ئیسلامە دانیشتووی ئەم وڵاتەم کەعێراقە کەچاووم کردۆتەوەدایك وباوکی خۆمم دیوە لەوانەی کەناتوانم قەرزەکانیان بدەمەوە ئەویش دایکمە ئەگینا ئەوانەی ئیشم لەگەڵ کردوون قەرزاری کەسێکیان نیم.

شانازی بەعێراقەوە دەکەم بەتایبەتی کوردستانی عێراق، کەوڵاتێکی بەپیت و بەرەکەتە درێژایی ۱۰۰۰کم وە پانایی ۱۵کم هەر لەخانەقینەوە تاوەکو زاخۆ جوانترین و باشترین وخۆشترین شوێنە لەهەموو ڕوویەکەوە (چی میوە یان ئاووهەوا) خەڵکێکی سنووری کاسب وسەخی شانازیان پێوە دەکرێت هەرچەندە لەهەندێك شوێن بەشی زۆری ساڵەکە ساردە لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژگاریان بەخۆشی و شادی بردۆتە سەر، بەڵام بەداخەوە ئێستاکە ؟! دانیشتوانی عێراق کە بریتییە لە کوردو عەرەب جیاوازییەکی گرنگ هەیە لەگەڵ هەموو ئەو شوێنانەی کەهەردوو نەتەوەکە لێی دەژی.

جارێك لەبەیروت بووم کەتەلەفۆنەکەم هەڵگرت عمر هزاع بوو قسەی لەگەڵ کردم، پرسیارم لێکرد (ابو فاروق) چۆن زانیت من لەو ئوتێلەم.

وتی: چوومە باڵوێزخانە ناوی ئەو عێراقیانەیان دامێ کەلەبەیروتن، یەکەم جار ئەوە تەلەفۆنم بۆ تۆ کرد.

وتم: لەشارێکی ناسراوی وەکو بەیروت کەدانیشتوانی عەرەبن بەشوێن کوردا دەگەڕێیت؟ سەیرە لام.

وتی: ابو بازیان من بەشوێن عەرەبدا ناگەڕێم من دەگەڕێم بەشوێن مرۆڤێکی عێراقی گفتوگۆی لەگەڵ بکەم.

لەخودای مەزن بەزیاد بێت بیست وپێنج ساڵە ماڵم لەبەغدادە شعورم بریندار نەکراوە، لەلایەن برایەکی عەرەب کەبڵێ ئەمە کوردە.

لەگەڵ هەموو ئەو ڕووداوانەی کەلەسەرەتاوە ڕووی دا تاکو ئێستاکە دوویەرەکی ڕووی نەداوە لەنێوان کوردو عەرەب. جێی دڵخەئەو کاربەدەستانی حکومەت لەسەرەتای دامەزراندنیەوە کێشەی کوردیان جێبەجێ نەکردووە.

لەدوای شۆڕشی ١٤ی تەمموز گۆڕانێک بەسەر وڵاتدا هات، لەهەموو ڕوویەکەوە تاکە گۆڕانکاری بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست (شرق الاوسط) لەدوای گۆڕانکارییەکەی کەلەمیسر کرا بەسەرۆکایەتی جمال عبدول ناصر، کەلەیەکەم بەیاننامە بڵاوکرایەوە کوردو عەرەب شەریکن لەم نیشتمانە خۆشی و شادی وئازادی کەوتە وڵاتەکەمانەوە کەعێراقە، هەموو دانیشتوانی وڵاتەکەمان بەتایبەتی چینی چەوساوە و جوتیارو کرێکارو کاسب و خوێندەوار ئەوەی نیشتمان پەروەر بوون لەوپەڕی خۆشحاڵی دا بوو بەلاَم کۆنەپەرست و شۆڤێنی کوردو عەرەب و دەوڵەتە دراوسێکان بۆچوونیان جۆرێکی تر بوو.

لەساڵی ١٩٦٩ لەڤیەننا لە گازینۆیەک دانیشتبووین، من و ووریا ڕەواندوزی و رشید عارف لەدوورەوە عێراقییەکمان دی بەتەنها دانیشتووە، ئاسیاوی رشید عارف بوو، کەئەویش ناویراو (خليل كنه) بوو لەپیاوەکانی ئاسراوی عەهدی مەلەکی بوو، خزمایەتی هەبوو لەگەڵ نوری سعید. بەخۆشحاڵییەوە بانگمان کرد لەگەڵمان دانیشت و ڕێزمان لێگرت، ئینجا خۆمان پێ ناساند و باسی بارودۆخی ئێستامان کرد کەتێیدا ئەژین.

خليل كنه گوتی: ئەوەی دوویەرەکی خستە ناو وڵات و بوو بەهۆی ئاژاوە نانەوە لەناو خاکی عێراق، تاوانباری یەکە هەمووی ئەخرێتە ئەستۆی عبدالكريم قاسم، نەک لەبەر ئەوەی کەدەستی بەسەر عێراقدا گرت، بەلاَم مێژوو لەسەری ئەنووسێ ساڵ بەساڵ کەگەورەترین تاوانی کردووە بەرامبەر بەهەموو عەرەب بەتایبەتی عێراق، ڕووی کردە ئێمە کەهەرسێکمان کوردین وتی: ئایا ئەزانن چی کردووە؟ ئەمە وتوویەتی (العرب والاكراد شركاء في هذا الوطن) واتە (کوردو عەرەب بەشدارە لەم خاکەدا).

وتم: ئێمەش تاوانبارین کەلەگەڵ تۆ دادەنیشین، من ناوم رفيق پشدەرییە لەبەغداد جێنشینم، یەکێکم لەو کوردانەی کەبەئاشکرا چەکم هەڵگرتووە شان بەشانی بەعس وەستاوم لەخزمەتیاندا، بەڵێن بەخۆم ئەدەم

کەلەم کاتەوە پاسەوانی و دڵسۆزی وفیداکاری بۆ بەعس بەزیادەوە بکەم، چونکە عەرەبی شۆڤێنی وەکو تۆ هەیە. جوان نییە، ئەگینا لێرە خراپم پێتەکردبیت، بەلام دەشکێتەوە بەسەر عێراقدا و دەڵێن دوو عێراقی شەڕیان کردووە.

گەڕانەوەی بارزانی بۆ وولات لەیەکەم چاوپێکەوتنی بە(زەعیم قاسم بارزانی) وتی: من سەربازێکم، من یەکێك بووم لەوانەی کەئەم وشەیەم لاپەسەند نەبوو لەیەکەم ئاهەنگی قوتابیانی کورد کەبەم بۆنەیەوە ئامادەیان کردبوو لەهۆڵی (قاعە)مەلیك فیصل لە(باب المعظم) هەزاری شاعیر و جەلال تاڵەبانی بەهۆی هەلوێستیان، ئینجا بارزانی هاتە سەر شانۆ وتی: من سەرۆکی نیم من سەربازێکی قاسمم ناڵێم کامیان لێپرسراوی یەکەمن قاسم یا بارزانی.

ئێمە بۆچوونمان دەربارەی بارزانی لەوکاتەی لەڕوسیا بوو، بەسەرۆکیمان دادەنا ئەوکاتە ناوی عبدالکریم قاسم مان نەبیستبوو هەرچەندە خوالێخۆش بوو (قاسم)م دووجار بەهۆی بارزانییەوە دیوە، وشەی زەعیمم بەکارمێنا بەلام زەعیم لای ئێمە بارزانییە.

لەڕێگەی مامۆستا ابراهیم احمدەوە جارێك لەنزیکەوە (عبدالسلام عارفم) دیبوو،کەشۆڕشی کورد هەلگیرسایەوە بەسەرۆکایەتی بارزانی پەیوەندیم پێوەکردن چوومە ڕیزی پێشمەرگە ئەوەبوو لەدواییدا خۆم تەسلیم بەحکومەت کردەوە لەکاتێکدا کە(عبدالسلام عارف) سەرۆکی کۆمار بوو.

یەکەم جار کەچوومە خزمەتی وام ئەزانی ڕێزم لێ دەگرێت چونکە من (امر فوج) ئامر بەتالیۆن بووم، ئەوکاتە پێیان دەگوتم شۆڕشگێڕ، پێشمەرگە، بەلام ئێستاکە کورد پێم دەڵێن خۆفرۆش وجاش بەم شێوەیە قسەی لەگەڵ کردم و وەلامی دامەوە.

وتی: تۆ جێت پێلەق بوو ئەتروشی ویستوویەتی لەناوت بەرێت ناچار بوویت خۆت تەسلیم بکەیتەوە، بۆئەوەی گیانی خۆت ڕزگار بکەیت، ئەی کاتێك ئامر بەتالیۆن بوویت، ئەو کاتە ئەگەر ڕاستت ئەکرد خۆت و پێشمەرگەکانت هاتبانایە خۆتت تەسلیم بکردایەتەوە ئەو شەڕانەی بەلێپرسراوی تۆ کراوە زیاد لە ٤٠٠ سەرباز کوژراون تۆ تاوانباری.

پێم گوت: سەرۆکی بەتالیۆنەکەم ٤١٧ کەس بوو هەمووی خاوەن بیرو باوەڕو هەستی نەتەوایەتی هەبوو، وەکێشەکەیان بەڕاست ئەزانی کەهاتمەوە بەتەنها بەسەلامەتی گەیشتم، ئەگەر یەکێك لەم ٤١٧ پێشمەرگەیە بیزانیبایە، بەزیندوویی منت نەئەدی، وەکو ئێستا قسەم لەگەڵ نەئەکردی و خەبەری کوشتنم ئەهات.

هەموو پێشمەرگەیەك کەلەشاخدایە وا هەست دەکات کەکێشەکەی ڕاست وڕەوایە، کاتێك بەچاوی خۆی کەم وکوڕیەکان ئەبینێ و یان ئەبیستێ ئاگادار ئەبێت کەچی بەکورد ئەکەن، وەکو گرتن، کوشتن، دوورخستنەوە، تالان، ماڵ وێران کردن.

بەڕێز جەنابی سەرۆکی (عبدالسلام) ئەو ڕاستیانە ئەخەمە بەرچاوت تاوەکو بەووردی لێی بکۆڵنەوە هۆی چیە کەپێشمەرگە بەچەکێکی ئاسایی دەچێتە شاخ ڕووبەڕووی تانك وچەکی قورس و زرێپۆشەکانتان ئەبێتەوە، لەپاڵ ئەوەشدا فڕۆکەکان وای کردووە کەبەڕۆژ کەس لەماڵەوە نەبێت شەوان دێنەوە هێزی سەربازیش هەموو شەقامە سەرەکیەکانیان و دەوروپشتی شارە گەورەکانیان تەنیوە، ئایا ئەگەر بەووردی تەماشای بکەی بەدوو جۆر حوکمیان بەسەردا دەدەیت یەکێکیان ئەوەیە دەڵێیت ئەوانە شێتن، دووەم هەموو ئەو شێتانەی کەلەشێتخانەن شێت سەرپەرشتیان ناکات ! پێم وایە لێکۆڵینەوەیەکی ڕاستەوخۆ بۆ ئەو کێشەیە بکەیت سوودێکی گەورەی ئەبێت بۆ وولات.

بەگرژیەوە وەڵامی دامەوە گوتی: ئایا تۆ هاتوویت گفتوگۆ (مفاوضة) مان لەگەڵ بکەیت، کۆتایم پێ هێنا خۆ ئەگەر شەخصی (عبدالرحمن عارف) نەبوایە، ئەوکاتە پلەی (رئیس ارکان الجیش) بوو، تووشی گرتن یان شەرئێشە دەبووم.

(عبدالرحمن عارف): کە سەرۆك کۆمار بوو

(جەلال تاڵەبانی) و (حلمی علی شریف) لەساڵی ١٩٦٦ هاتنە بەغداد کەئەمانە باڵێکن لەبزووتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد، باڵی م.س جماعەتی (جەلال تاڵەبانی)بوون لەڕێگەی منەوە کەوتنە گفتوگۆکردن ئەوەی من ئاگادار بووم دەست بخەمە سەری و کەدەڵێم (عبدالرحمن عارف) گەیشتبووە ئەو باوەڕەی کەکێشەی کورد جێبەجێ بکات و لایەك بەسەر لایەکدا بەهێز

نەکات هەولّی زۆری دلبۆ ئەو مەبەستە، بەلاّم دەورو پشتەکەی زالّ بوون بەسەریدا نەیان دەهێشت ئەو کێشەیە لەڕێگەی (عبدالرحمن عارف ) ەوە تەواو بێت، هەروەها قائد فرقەکان و ئەفسەرەکان وکاربەدەستان کەلەکوردستان بوون (شمال) بەشی زۆریان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان ئاواتە خواز نەبوون کەئەم کێشەیە چارەسەر بکرێت، لەلایەکی دیکەشەوە یەکەم چاوپێکەوتنم لەگەلّ (جەلال تالّەبانی) ئەو شەوە لەمالّی علی مام رزا بوو لەگەڕەکی (تل محمد) پرسیاری لێکردم ئایا ئەمانە واتە (حکومەتی عبدالرحمن عارف )چۆن چۆنی دەبێت بەرامبەر دان پیانان مافەکانی کورد،لەناوەڕۆکەکەی هەردوولا شەخصی عبدالرحمن عارف و بالّی م.س جماعەتی (جەلال تالّەبانی) و پ.د.ك -بارزانی گومانم نییە هەرچەندە دووریووم لێیانەوە واتە لە (پ.د.ك)، بەلاّم ئەوانیش بۆ کێشەی جێبەجێکردنی مافەکانی کورد ڕازی دەبوون. چونکە لەنزیکەوە خەلّکێکم ئەدی سەر بەبارزانی بوون. ئەوەبوو بەداخەوە ئەم هەلە بەخۆڕایی لەدەست دەرچوو.

جەنابی سەرۆکی دادگا، بەڕاستی خۆشم سەرم سوڕماوە لەوەیمن هاتمە ناوەوە بەو شێوەیەی کەقسەت بۆ دەکەم وا هەست دەکەی کەمن لەعێراقدا دەورێکی سەرەکیم هەبووە، بارم ئەوەندە قورس بووە باش هەستم پێ دەکرد لەهەندێك خەلّکم دەپرسی، وەکو مامۆستا تەها محیالدین دەیگوت ئەمە ئیشی تۆیە، ڕاستییەکەی ڕوون بۆوە بۆخۆم کەڕاستم کردووە ئەوەندە چوومەتە پێشێ بەپلەو پایە، وەکیل بووم لەئاسایش کەهیچ پلەیەك و دەسەلاّتێکیشم نەبووە، بەلاّم خۆشم نازانم کەچۆن گەیشتوومەتە ئەو پلەیە دەست وەردەمە کاروباری سەرکردایەتی و پێشنیار یان لەدەدەمێ.

لە ١٨ تەمموزی ١٩٦٨ چوومە کۆشکی کۆماری (قصر الجمهوری) ویستم چاووم بەسەرۆکی کۆمار (احمد حسن بکر) بکەوێت، (احمد حسن بکر) پێم گوتن: ئێوە هاتوون (تستعملون لغه حديد والنار) او( تستعملون العقل والحكمه والادراك لحل القضية الكرديه).

وتیان: ئەو شتانەی کەئێمە باسی دەکەین لەو کۆبوونەوەیەدا ئەویش کێشەی کوردە زۆر باوەڕم بەقسەکان بوو، چونکە (شفیق دراجی) وای پێی گوتم.

- مـن ڕۆژگــار وای لێکـردم هــەتاکو ئــەهات نزیــك تــر دەبوومــەوە سەرکردەکانی بەعس، بەڵام بۆ زانیاریت مـن لـەهیچ بـارودۆخێك عەریزەیـەکم ئاراسـتەی کاریەدەسـتانی بـەعس نـەکردووە کەبپاڕێمـەوە و داوایـان لێبکـەم کەنزیکم بکەنەوە لەخۆیان و دامەزرێنن.

بۆ نموونە:

لەیەکەم ڕۆژەوە کـە(نـاظم کـزار)م دی دوای دامـەزراندنی بـەدوو سـەعات لەبەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی وا ڕێکەوت کە سـەردانی بکـەم بـۆ ئیشـی لێقەوماوێك.

لەبەرچاوی (حامد العانی) و (عبدالخالق عزیز) پێی وتم: بابەیەکەوە ئیش بکەین، وەڵامم دایەوە (یقال ویشاع لقد تم تعین ناظم جزار (قصـاب) مدیـرا لامن العامە اهالی بغداد یقولون دم راح توصل للرکبە ).(عنـدك ١٢ مدیـر کلهم جالسین وراو المیز حایرین شلون یرفعون التقرین).

بەم شێوەیە هەتا ڕۆژی لێك جیابووینەوە من ڕووم کـردە دەرەوەی وڵات ئەویش ڕووی کردە دونیای ئاخیرەت، بەیەکەوە کارمان کرد ماوەیەکی دوورو درێژ دۆستایەتی و برایەتیمان بەجۆرێك بەهێز بوو وای لێهات باوکی بێتــە لام و بڵێت ناظم نام بینێت، (حامد العـانی) بڵـێ رفیـق پشـدەری هـەموو شـتێك ئەزانێ بەڵام وەزیری ناوخۆ سعدون غیدان ئاگای لەئاسایشـی گشـتی نیـیە بەڕێوەبەرەکـەی هیـچ بایـەخێکی پێنــادات، ئــەو شـوێنانەی کەتایبەتـیـیە تەنهاناظم وچەند کەسانێك هـەن کەلەگەڵیاندا ئیش دەکـەن بۆیــان هەیــە سـەردان بکـەن.مـن زۆر بەئاسـانی ڕووم لـەو شـوێنانە نـەکرد تەنــها (قصــر النهایة) نەبێت ئەویش بەهۆی هەڵوێست وئارەزووی بینینی کاری ئەشکەنجەو ئازاردانی مرۆڤم نییە بۆیە ڕێم نەکەوتۆتە ئەو شوێنە.

جـەنابی سـەرۆکی دادگـا کـاتێك چوومـە دەرەوەی وڵات ڕام کـرد لەسـەر نامــەی دەستیکاریەدەســتێکی قیــادەی بــەعس هاتمــەوە هیــچ پرسـیارو وەڵامێکیان لێ نەکردم جەنابی (سید نائب) دوای گەڕانـەوەم بـەدوورو درێـژی گفتوگۆی لەگەڵ کردم.

دەربارەی (ناظم کزار)، دانـی پـێدا نـا کەباشـم کـردووە ڕام کـرد ئـەگینا بەجۆرێك نزیك بووم لـەناظم کـزار حـەقی کوشـتنم هـەبوو، هـەروەها لەگـەڵ

(سعدون غيدان) ئەو باسانەی لەگەڵ (سید نائب)م باس کردبوو ئەویش دەقی خۆی بۆم گێڕایەوە پشتگیری ئەوەی لێکردم باشت کردووە کە ڕات کردووە.

جەنابی سەرۆکی دادگا، زۆرم لا سەیر بوو کەئەو مامۆستا ئایینیانە بەشداربوون لە هەوڵی کوشتنی (مەلا مصطفی بارزانی)، سوپاس بۆیەزدانی مەزن کەنەکوژرا، چونکە زیانێکی گەورەی دەهێنا بۆ هەردوو نەتەوەی عەرەب وکورد، ئەمە خاڵێك بوو کۆتایی پێ نەدەهات هەر باس دەکرا.

پرسیارم کرد لەچەند سەرکردەیەکی بەعس ئەو قسەیەی بۆتان باس دەکەم گومانم نییە کەباشتان لەبیرە لەدوای ١١ی ئازار، کەبارزانی ویستی هەموو کورد کۆبکاتەوە لەچوارچێوەی (پ.د.ك) واتە لەژێر یەك خێمە وە دوویەرەکی نەهێڵێت. ئێوەی بەعس پشتگیریتان کرد، لەبارزانی بەماددیو مەعنەوی بەکۆمەکی پارەو یارمەتی دانی هێز، چونکە هەمووتان یەك قسەتان کرد ئەویش ئەوەبوو (كذب اذا احنا نگول عندنا صديق). (عندنا صديق واحد هو بارزاني روحوا كلكم التحقوا بالبارزاني ).(قوه بارزانی قوه البعث).

پرسیارم کرد لە (ناظم کزار) چەند جارێك دەربارەی ئەم ڕووداوە ئەوەتان بۆ چی و بەفەرمانی کێ ئەو پیلان و تاکتیکەتان ئەنجام دا؟ کەچی گوتی: بەلام ئەم جۆرە ئیشانە زیانی گەورە بەولاتەکەمان دەبەخشێت.

لەو ڕۆژەوە کەحکومەتی عێراق دامەزراوە، کێشەی سەرسنوور لەگەڵ ئێران و تورکیا وکوێت هەیەو بەردەوامە و هەریەکە بۆچوونی تایبەتی خۆی هەیە، شای ئێران دەڵێت (شط العرب) و کەنداوی عەرەبی مولکی ئێرانە، کوێت بەو سنوورەی ئێستا ڕازی نییە بەلام بۆچوونی حکومەتی عێراق لەیەکەم ڕۆژەوە هەتا ئێستا کوێت بەشێکە لەعێراق (قائمقامیتیعێراق)، تورکیا دەڵێن موصل وکەرکوك بەشێکە لەتورکیا.

## ئاشکراو ڕوونە کەگەلی عەرەبی سێکێشەی گەورەی هەیە:

١- یەکەم کێشەی نێوان فلسطین و ئیسرائیل (جوولەکەو عەرەب) ئەم کێشەیە ئەمەندە ئاڵۆزە چارەسەرکردنی زۆر زەحمەتە لەبەر زۆر هۆ جامن لێرەوە بەجێی ئەهێڵم.

٢- كێشەی ئەسكەندەرونە كەدانیشتوانی شارەكە بەشی زۆریان عەرەبن وەخۆی بەشێكە لەوڵاتی عەرەبی هیچ مرۆڤێكی عەرەب لەئەسكەندەرونە بۆی‌نی‌یە بڵێ من عەرەبم، لەكاتێكدا لەماڵەوە بەعەرەبی قسە دەكەن و لەماڵەوە، لەگەڵ عەرەب بەعەرەبی قسە دەكات، بەڵام كەقسەی لەگەڵ دەكەیت دەڵێت من پێناسەكەم توركە ئەوەیان فێركردوون و بەسەریان چەسپاندوون (من عاشر قوما اربعين يوما فاصبح منهم)، لەتوركیا بەچاوێكی زۆر سووك تەماشای مرۆڤی عەرەب ئەكەن پێی ئەڵێن كۆپەك(سەگ).

٣- ئەهواز ٩٠٪ ی دانیشتوانی ناوچەكە عەرەبن وەخۆشیان بەعەرەب ئەزانن نەتەوەی فارس وای لێكردوون ئەڵێن ئێمە فارسین.

ئێران: - دانیشتوانی پێك هاتووە لەم نەتەوانە:

ئازەر، كورد، فارس، عەرەب، بلوچ.

توركیا:-دانیشتوانی پێك هاتووە لەم نەتەوانە:

تورك، كورد، ئازەر، عەرەب، ئەرمەنی.

## • ئەو كەمایەتیانەی كەلەخاكی عەرەبدا ئەژین: (الاقليات القومية في ارض العرب)

الاقليات القوميه: كەمایەتی یە نەتەوەیی‌یەكان كەلەگەڵ عەرەب دەژین كەگەلی عەرەب دەڵێن واناویان دەبا ئەمانە لەخاكی عەرەب دەژین.

جنوبی سودان، بەربەر، دورز، مارۆنی، كورد (لەسەر خاكی خۆی دا دەژێیت كەپێی دەڵێن كوردستان).

لەبەر چەند هۆیەك. لەهەموویان نزیكتر. لەگەڵی عەرەب ئەویش كوردە لەكاتێكدا كەزانراوە بەشی زۆری دانیشتوانی كوردستانی عێراق وسوریا ئیسلامە، وە دەوری (صلاح الدين ئەیوبی) مێژوو سەرانسەر باسی دەكات لێرەوە هەتاكو ئەكاتە كۆتایی سنووری عەرەب كوردستان نی‌یە تەرمی كوردی لێنەبێت كەشان بەشانی عەرەب جەنگاوە خۆی بەخت كردووە ئەم ڕاستی‌یە هەموو مرۆڤێكی عەرەبی ڕۆشنبیر ئەمە ئەزانێت، لەنێوان گەلی

کوردو عەرەب هیچ ناکۆکی‌یەك ڕووی نەداوە سەرانسەری هەموو مێژوو دیسان ئەمە دەڵێتەوە دیارە لای هەموو نیشتمان پەروەرێکی کوردو عەرەب.
ئەگەر بێتو بیربکەینەوە وەپیلانی بۆ دابنێین کەچۆن عەرەبی ئەهوازو عەرەبی ئەسکەندەرونە ڕزگار بکەیت، باشترین بۆچوون ئەوەیە، لەهەمان کات ئەگەر بتەوێت ئەو کورسی‌یەی کەشای ئێران لەسەری دانیشتووە بیهەژێنیت، ئایا دەتەوێت ئەو مقۆمقۆیەی کەتورکیا دەڵێت لەکاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانلی ئاینی ئیسلام زۆر بەدەسەڵات بوو، هەموو کات ئەبێت عەرەبی نیشتمان پەروەر بیر لەوە بکاتەوەو باش بزانێت خەتەری گەورە ئیسرائیل و تورکیایە وەئەگەر بێتوو بیر لەوە بکەیتەوە کەسنووری عەرەب بەهێز بکەیت وەکێشەکانی کەباسمان کرد جێبەجێ بکەیت، تەنها یەك ڕێگا هەیە ئەویش کێشەی کورد لەعێراق داجێبەجێ بکەیت بڕیاری ئەوە بدەیت کەئەویش (استقلال الذاتي) واتە لەفیدراڵی فراوانتر بدەیت بەپارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکی‌ایەتی بارزانی.
سەرۆکی دادگا قسەی بڕیم:
وتی: ئەتەوێت حکومەتی کوردی دابمەزرێنیت.
وتم: جەنابی سەرۆکی لەسەرەتا بەڵێنت پیێداوم کەڕێگام پێ بدەیت تاکو قسەکانم تەواو دەکەم، ئینجا ئامادەم بۆ هەموو پرسیارو وەڵامێکت و مل کەچیشم بۆ هەموو بڕیارێکت.
- چوومەوە سەر باسەکەی خۆم کە(استقلال الذاتي ) بوو.

لەڕێگەی کوردی عێراقەوە کەبەتەواوەتی بەهێزت کردن مەبەست لەبەهێزکردنی دلن پیانان بە(استقلال الذاتي ) یە ئینجا یارمەتی هێزی بەشەریت پێویست ناکات تەنها یارمەتی چەك و پارە لەڕێگەی ئەوانەوە (بارزانی) ئەتوانیت کوردستانی ئێران ڕزگار بکەیت، ئەو کاتە ئێران پارچە پارچە دەبێت. ئەوکاتە سنووری عێراق دەگاتە نزیك سنووری ئازەر لەئێران واتە (تەورێز)، هەروەها کاتێك کوردستانی عێراق و کوردستانی ئێران بوو بەیەك هێز، ئەوکاتە کوردستانی تورکیاش ڕزگار بکەن، دەگاتە سنووری تورك واتە نزیك ئەنقەرە سنووری عەرەب لەگەڵ سنووری کورد لێك داتەوە، ئەو کاتە سنووری عەرەب بەکوردەوە پاڵ دەدات بەتورك و فارس نامێنێت، بوونی هێلمز کەکاتی خۆی مدیری مخابراتی مەرکەزی ئەمریکی بوو ئێستاکە

بالوێزی ئەمریکایە لەتەهران، شك نییە کەپیلانێکی گەورەی بەدەستەوەیە لەو ناوچەیە ئەگەر بتەوێت ئەو پیلانەی دای ڕشتووە کەئەویش دژی عێراق و کوردە ئەو بۆچوونەی من وەکو خۆی صەدا صەد هەموو پیلانەکانی هێلمز و(ئەمەریکا) تێکو پێك ئەدات.

## وەلامیان ئایا ئەبێ چی بێت دەربارەی ئەو هەموو ڕاپۆرت و قسەکردنەی من:-

جەنابی سەرۆك دادگا:کاتێك کوردستانی عێراق و کوردستانی ئێران بوو بەیەك هێز ئەوکاتە کوردستانی تورکیاش ڕزگار بکەن، دەگاتە سنوری تورك واتە نزیك ئەنقەرە، ئەو کاتە سنوری عەرەب سنوری کورد لێك دەدرێت.

## ڕێکەوتننامەی الجزائر:

١- دەست هەلگرتن لەبەشێکی خاکی عێراق ئەویش نیوەی کەنداوی عەرەب (شط العرب) بوو.

٢- هەرەس هێنان بەشۆڕشی کورد.

کاربەدەستانی حکومەت بەئاشکرا ئەم قسانەیان ئەکوت تازە شۆڕشی کورد هەلناداتەوە هەتا سەد سالی دیکە کوردێك لەعێراق چەکی پێنابێت.

منیش دەنگم خستە پال ئەو کاربەدەستانەی بەعس بەمەرجێك ئەگەر هاتبنایە ئەو لافیتانەی (شعار) بەرزیان کردۆتەوە کەقیادەتی پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی بارزانی ئەجەنگێ لەپێناوی دا کەشۆڕشێکی مەزن پەیدا بوو، هەموو ئەو مافانە بەعس دانی پێدا بنێت، کێشەی کورد جێبەجێ بکات ئەو کاتە گومان نییە بەعس جێگەی (پارتی دیموکراتی کوردستان و بارزانی) ئەگرێتەوەو ڕەنگە زیاتریش لە ٩٠٪ جەماوەری کورد ئەچووە پال بەعس، ئەو لافیتانەی کەبەعس هەلی گرتبوو بۆ نموونە: (وحدە -حریە- اشتراکیە) کورد هەمووی قبوول دەکرد، هەرچەندە مرۆڤێکی نیشتمان پەروەر و کوردێکی دلسۆز ئەمە قبول ناکات

چونکە ناگونجێ لەگەڵ ئایدیۆلۆجیەتی کورد، بەڵام ئەمەی دەخستە پشت گوێ چونکە کێشەی سەرەکی جێبەجێ کردووە بۆ کورد.
من لەسەرەتای گەڕانەوەی خەڵك بەپێر زۆر لەکادرەکانی پارتی، لەوانەی کەبەشداری شۆڕشیان کردبوو نەچووم، لەفرۆکەخانە یان لەسنووری (منذریة - خانقین) و هەریەکە لای خۆیەوە بەگوێرەی بۆچوونی خۆی ڕاپۆرتێکی پێش کەش ئەکرد بۆ جێبەجێکردنی ئەم کێشەیە.
جارێك چەند رۆشنبیرێك لەرێگەی منەوە چاویان بەبەرێوەبەری ئاسایشی گشتی کەوت ڕای خۆیان دەربڕی کەچۆن کێشەی کورد جێبەجێ بکەن.
لەدانیشتنێکی دوو قۆڵی بەرێوەبەری ئاسایشی گشتی پێی گوتم: ئەمە چی بوو بۆمنت هێنا تازە شۆڕشی کورد تەواو هەموو ئەو ڕاپۆرتانەش خرانە پشت گوێ، بڕوا ناکەم هیچ کادرێکی بەعس چاوی پیاخشاندبێ.
جەنابی سەرۆکی دانگا: ئەوەی ڕاپۆرتەکەی لەسەرمن نووسیوە کەگوایا لەگەڵ جەلال تاڵەبانی کۆبوومەتەوە من خۆم دان بەوەدا دەنێم کەلەوە گەلێك زیاترە. کەگەڕامەوە لەبەیروت بەخزمەت جەنابی سید نائب گەیشتم باسیباروبۆخی ئێستای کوردم بۆ کرد، کەناوی (جەلال)م هێنا ڕوویەڕووم گرژ بوو بەجۆرێك نارەحەت بوو، کەمێشکی لەسەر خۆی نەماو گوتی: بڕۆ دەرەوە، گوتم: نەتۆ، نەبەعس نەسوپای عێراقی لەم ژوورەم دەرناکات، تاکو قسەکانی خۆم تەواو نەکەم، زیاد لەدوو سەعات قسەم بۆ کرد پێش هەستانم.
وتم: ئەگەر رێگەم پێ بدەیت و بەگەورەیی خۆت بم بەخشیت ئەو قسانەی خوارەوە بەکورتی بۆت ئەکەم هەتاکو کەی ئاژاوەو کوشتن وماڵ وێران کردن هەر بەردەوام دەبێت، بیرێك ناکەیتەوە لەوەی کە ئەو پیلان و سیاسەتەی ئێوە بەرێوەی دەبەن هیچ سوودێك نابەخشێ وە وڵات لەدواکەوتندا دەبێت زیاتر لەناوەوەی وڵاتەوە گەورەترین کێشەت کوردە، لەیەکەم ڕۆژەوە کەئێوەم ناسی لە ١٨ ی تەمموزی ١٩٦٨ دا پێم گوتن (لغە الحديد والنار) بەکارئەهێنن یان (عقل والحكمه والادراك)بەکارئەهێنن.
جەنابی سەرۆکی دانگا: بۆ ئاگاداریت (سید نائب)٠ خۆی ئەو ڕێگایەی پێ دابووم کە چ بەقسە یان بەنووسین دەربارەی بەرژەوەندی عێراق بەتایبەتی کورد چی بەباش دەزانم ڕاستەوخۆ بیخەمە بەرچاوی. ئەگینا من نەپیاوێکی

سەرۆکی هۆزم نەڕۆشنبیرێکی ناسراو، نە ملیۆنەرم، وەکو پێشتر گوتوومە خۆی داوای لیّ کردووم کەلەگەڵی ئیش بکەم، نەك بۆ شۆفێری و یا پاسەوانی سوپاس بۆ خودای گەورە ئەو ماهیەتەی‌داومەتیّ.

ئینجا کاتێك لەقسەکانم لەگەڵ (سید نائب) تەواو بووم داوام لیّ کرد کە ئێستاش کات ماوە بۆئەوەی کێشەی کورد بەئاسانی جیّبەجیّ بکرێت ئەمەش داخوازی‌یەکەم بوو.

## عمر دەبابە:

{ لەڕێگەی بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی‌یەوە بەئاگاداری مەکتەبی کاروباری شمال (صدام تکریتی)، عمر دەبابە چوو بۆ لەندەن وسوریا، کەگەڕایەوە بۆ جیّبەجیّکردنی کێشەی کورد لەڕێگەی بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی گشتی نێردرا بۆ مەکتەبی کاروباری شمال (صدام تکریتی) سیّجار لەڕێگەی بەدالەی ئاسایشی گشتی یەوە تەلەفۆن لەگەڵ بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی ئەکات،وەڵامی هیچ دیار نی‌یە. کاتێك عمر دەبابە هاتە لام ئەیویست بەپەلە وەڵامەکەی وەرگرێتەوە، تەلەفۆنی تایبەتی بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتم دایەو خۆم تەلەفۆنم لەگەڵ کرد گوتم: (ابو مازن) ئەو ژمارە تایبەتی‌یەی تۆم داوەتە عمر دەبابە ئێستاش لام دانیشتووە بەتەنها قسەت لەگەڵ بکات، یان تۆ خۆت چۆن بەباشی ئەزانیت.

گوتی: ئەمە وەڵامەکەیە.

(اخي كل ماهناك رفعنا التقرير الى الفوق غير ماكو شي بيدي).

گوتم: خۆشت ئەم چوار کەلیمەیە بەکاك عمر ڕابگەیەنە}.

هەروەها گروپێکی سیاسی کورد کەپیّی دەڵێن (کۆمەڵە) ناسیاویم لەگەڵ چەند کەسانێکیان هەیە، ئێران ژمارەیەك لەوانەی تەسلیم بەعێراق کردەوە، چەند ڕاپۆرتێکم ئاراستەی قیادە کرد کەئەمانە ڕۆشنبیرن، دڵسۆزی وڵاتەکەن نیشتمان پەروەرو خاوەن بیروباوەڕن، لەگەڵ ئەو حزبانەی کەدروست کراون جیاوازی‌یەکی زۆریان هەیە، ڕێگابدەن بەمانە لەکوردستان لەپارێزگای سلێمانی و هەولێر ودهۆك ئیش بکەن، ڕۆژنامەو گۆڤاریان هەبێت جەماوەرێکی زۆر لەدەورەوپشتمان کۆدەبێتەوە، وەڵامی بەعس

(قیادەکانیان) ئەوەبوو ڕزگارمان بوو لەپارتی، ئینجا نۆرەی کۆمەڵەیە، لە مخابراتیش، یەکێك لەتاوانەکانم کەمن ئەندامێکی کۆمەڵەم من (ڕفیق پشدەری) ناسراوم بەسیخوڕ، بەداخەوە جێگام ناکەنەوە ئەگینا سەرمایەیەکی گەورەیە.

ڕاستە چوومەتە لایان، کاتێك لەژووری لەسێدارەدان بوون بەزەردەخەنەوە کەلەپچەکانی دەستیان پێ نیشان دام جێبەجێ کردنی لە سێدارەدانمان سوود بەخشێکی گەورە دەبێت بۆ کورد بەتایبەتی بۆ حزبەکەمان کەکۆمەڵەیە من کەپێم گوتن ئێوە لەسێدارە دەدرێن، دەستیان کرد بەپێکەنین، بەڵام منیان هێنایە گریان.

بەڕێز جەنابی سەرۆکی دادگا: من هەموو سەرانسەری ئەو ماوەیەی کەلەخزمەت بەعس دا بووم سوپاستان دەکەم بەتایبەتی هی سەرۆکی و (سید نائب) و (ناظم کزار)، کەتوانیم لەڕێگەی ئەوانەوە یارمەتی زۆر خەڵکی هەژار و لێقەوماوو زوڵم لێکراو بدەم، هەروەها ئەو جۆرە یارمەتییەیان دام منیان لەکابرایەکی وەکیلی ئاسایش (امن) گەیاندە ئەو پلەو پایەیە. بەڵام منیش لەلایەن خۆمەوە هەموو هەوڵدانێکم، بۆچوونم تەرخان کردووە لەڕێگەی بەعسەوە بتوانم خزمەتی وڵاتەکەم بکەم کەعێراقە، بەتایبەتی کورد.

یەکەم چاوپێکەوتنم بەصدام ئەمەم پێ گوت: کەمن لەدایك وباوکێکی کورد بووم خیانەت ناکەم وەپیاو کوژیش نیم، بەڵام هەموو هەوڵدانێکم، گیانفیداکردنێکم ئەنجامەکەی ئەوە بوو کەوا من ۲۰ مانگە میوانی مخابراتم بەفەرمانی (صدام تکریتی).

یەکەم لێکۆڵینەوە پێیان گوتم: تۆ جاسوسێکی دەوڵەتێکی غەربی ئەمە عەقڵی خۆت نییە کەڕاپۆرتەکانت پێش کەش بەقیادە کردووە. پاشان ئیسپات بوو بۆ مخابرات خوا ئەو زانیارییەی داومەتێ کە ڕوونم کردەوە بۆیان ئێوەش وویستان جێی خودا بگرنەوە (استغفر الله) خوا لەهەموومان گەورەترە قەسرەکەی (هاروونە ڕەشید) کەلەسەرو نوورزدییە لەشارع ڕەشید ئێستاکە گەراجی سەیارەیە هەمووومان دەزانین ئەمەش بەسەر دەچێت.

ئینجا لەمێژووی مخابرات یەکەم کەس بووم کەتوانای هەموو ئازارو ئەشکەنجەیەکم گرت. کەشەرم دەم گرێت وام لێهات وەکو منداڵێکی (٤)مانگ

ڕەفتار بکەم، پێم نیشان دان کەمێز هەموو شتێك نی‌یە نێوان بەشەرو ئاژەڵ عەقڵە ئەوەی بەمنیان کرد، پشیلە بەمشکی دەکات، سەگ بەپشیلەی دەکات، شێریش لەگەڵ هەموو ئاژەڵێکی تردا دەیکات ئاوا لەگەڵم جووڵانەوە.

ئینجا ویستیان (مسح الدماغ) سڕانەوەی مێشکم بۆبکەن، ئەوە ئێستا بۆیان ڕوون بۆوە کەوا خەریکە دوو سەعات زیاتر بەبێ ئەوەی قەڵەم وکاغەزێکم پێ بێت، بابەت لەدوای‌بابەت بۆتان دەدوێم، بەجۆرێك نارەحەتیان کردم سێ‌جار ویستم خۆم لەناوبەرم (انتحار) بکەم، سەرنەکەوتم.

جەنابی سەرۆکی دادگا:

وا بزانم هەموو ئەو تاوانانەی کەمن کردوومە چ (مدعی العام) چ خۆم خستمانە بەرچاوی بەڕێزتان، هەروەها هەڵوێستی خۆم باش ڕوون کردەوە لەخزمەتی عێراقێکی سەربەخۆ، گەلی کوردو عەرەب ڕۆژگار بباتە سەر. چەندم لا سەیرە ٢٠ مانگ لەژوورێکی تەنهایی بژیم، دوای ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەیە لەدادگای شۆڕش ڕاوەستم، لەکاتێکدا زۆر بەدوورو درێژی بۆتان ڕوون بۆوە. ئێستاکە تاوانباری گەورە ئاشکرایە ئەگەر دیموکراتیەت هەبایە لەعێراق لەجیاتی من ئەویش (بکر و صدامە).

کاتێك گەیشتمە ئەو باوەڕەی کەلەدۆسیەی صدام شتێك نی‌یە پێی بڵێن کێشەی کورد، بەپێی توانای خۆم هەموو شتێکم بەکارهێنا.

کاتی خۆی بەڕاپۆرت ئاگاداری مسعود بارزانیم کرد کەدەمەوێت (التحاق) پەیوەندی بەشۆڕشەوە بکەم چونکە لەپەنا بەعس ناتوانم خزمەتی کورد بکەم.

لەمانگی ئەیلولی ١٩٧٦ کەلەگەڵ عمر دەبابە چاومان بەیەك کەوت، وتم: نامەوێت بگەڕێمەوە دەمەوێت بەیەکجاری پەیوەندیتان پێوە بکەم، چونکە لەپەنا بەعس بەهیچ جۆرێك خزمەتم پێ‌ناکرێت وکێشەی (حمەی مەلا شریف) بەم جۆرە وەها بەئاشکرا بۆم ناچێتە سەر.

بۆ ئاگادارێت حەز دەکەم بزانیت جەنابی سەرۆکی لە ١٩٧٦/٩/١١ چوومە (مجلس الوطني) السید نائب نیشتمانی بەپیرمەوە هاتن پێیان گوتم: (بقی بالي يمك هواية) بەم شێوەیە بەخێرهاتنیان کردم، بەڵام لەبەرئەوەی

لەدانیشتنەکە وەکو ئەو گوتی، وەلامەکەم سلبی بوو لای ئەویش کوفرە چۆن ئەبێت مرۆڤ بۆی هەبێت ووشەی نەخێر (کلا) بەکاربهێنێت.
لەبەرواری ١٩٧٦/٩/١٤ گیرام وەکو پرسیار لـەمن دەکـەیت پرسـیارێکیش لەو زاتە مەزنـە(صـدام) بکـە ئـەم گۆڕانکاریـیە ١٨٠ پلەیە بایدایەوە، ئـەو پەلەیە چیبوو من بۆم نییە قسە بکەم چونکی من گفتم داوە چونکە مـن لای خۆمەوە ئەم وشەیە دەبەمە ناو گۆڕەکەم (کوشتنی مام جەلال).
سەرۆکی دادگـا گوتـی: مووچـەت لـەوەزیرێك زۆرتـر بـوو هەرچـەندە پلـەو پایەی ئاشکرات نەبووە، بەلام لەوەزیر زیاتر دەستت ڕۆیشتووە، تۆ بەجۆرێك ڕەفتارت لەگەڵدا کراوە (مدلل) وەکو منداڵی ساوا کە لـەباوەش هـەڵدەگیرێت ئایا ئـەزانی ئەمـە تاوانەکـەی چیـیە مرۆڤێکـی ڕۆشـنبیری زیرەکـی وەکـو تۆخاوەن ماڵ ومنداڵ، جێگەی سەرسوڕمانە، بۆ ئەمەت کرد؟
گوتم: هەرچەندە زۆر نزیـك بوومـەوە لەسـەرکردەکانی بـەعس، بـەلام بـۆم ڕوون و ئاشکرا بوو کەڕۆژێك لەڕۆژان کێشـەی کوردیـان پێنیـیە واتـە لـەبیرو باوەڕو هەڵوێستی ئەوان دا نییە.
ئەگەر کورد بەو مێشکە بیربکاتەوە بڵێ ڕۆژێ لەڕۆژان صدام کێشەی کورد جێبەجێ دەکات ئەمە نەبووە و نابێت.
کورد لەهەموو کـون و قوژبنێکـی کوردسـتانی عێراق خـاوەن هیـچ شـتێك نییـە، ەمن ئـەڵێم ئەمـە هەڵوێسـتی منـە و ئـەوەی کردوومـە لەبەرئـەوەی هەموویم ئاشکرا کرد داوای ئەوە ناکـەم وە ناپاڕێمـەوە بڵێـم بـەرەڵلام بکـەن چونکە ئەگەر جارێکی تریش زیندوو ببمەوە پەیمان بێت ئەمە ڕەفتارمە.
سەرۆکی دادگا گوتی: کەوابێت هەموو ئەو تاوانانەی کەمدعی عام خستیە پاڵ تۆ ڕاستە کەتۆ پەیوەندیت ڕاستەوخۆ هەبووە لەگەڵ (جەلال و مسعود).
وتم: مـن کـادرێکی (جـەلال و مسـعود)م ئەمـە شـەرەفە بۆمـن دەسـتم بۆچاوەکانم برد، ئەمە مسعودە، ئەوی تریان جەلالە.
سەرۆکی دادگا: ئیشارەتی بەوەدا کەکاتی پشوودانە. مـن وشـەفیقی بـرام هاتینـە هۆڵـی دادگـا مـاوەی دوو سـەعات دانیشـتین هـەردووکمان بێدەنـگ بووین، چونکە نەمان دەزانی خوا چیلەچارەی نووسیووین.

کەس نەما لەوانەی کەلەدادگا ئیش دەکەن گەورەو پچووك نەیەن تەماشامان نەکەن، ڕەنگە بەشی زۆریان وایان تەماشا دەکردم کەئەو پیاوە شێتە کێیە ؟.

ئەو هەموو قسەیەت لەکوێوە هێنا ! دانی بەتاوانەکانی خۆی نا سەرو دوو پەرداخ ئاویان بۆ هێنایین من دوای پەرداخێکی تریشم کرد.

ئێمەیان بانگ کردەوە بۆ ژوورەوە، سەرۆکی دادگا تاوانەکانی یەك لەدوای یەك خوێندەوە و ئینجا گوتی: (اشغال شاقە المؤبدە)، واتە ٢٠ ساڵ وە شەفیقی برام حوکم درا بە پێنج ساڵ.

کەکۆتایی بە خوێندنەوەی حوکمەکە هێنا، ئەوەندەی نەمابوو لەخۆشی دا بکەوم، ئەمەم ئەوەندە لاخۆش بوو چونکە لەلایەکەوە پەتەکەم لەملی خۆم کردەوە لەلایەکی ترەوە چیم کردبوو خراپ وچاك هەموویم خستە بەردەمیان.

ڕوویەڕوویان سەرم (ڕەنگە ٢ سم) هێنایە خوارێ، بەسەری زمان گوتم (شکرا لسید الرئیس واعضاء المحکمة وللسید المدعي العام و للحاضرين ).

ئیتر ئێمەیان هێنایەوە بۆ مخابرات، هەریەکەمان خراینەوە شوێنی خۆمان ئێوارەکەی بانگیان کردم، کاریەدەستەکە گوتی: تۆ نهێنی یەکانی سەرکردەکانی بەعست لایە لەبەرئەوە تۆ لەم ژوورە تەنهایی یە بیست ساڵەکە تەواو دەکەیت، بەڵام ئەگەر بەدەست وخەتی خۆت بۆمان بنووسیت و پەیمان بدەیت کەئەم نهێنیانە ناسرکێنی، ئەوا بەیانی یەکەی بەڕێت دەکەین بۆ بەندیخانەی (ابوغريب).

چیان ویست بەدەستی خۆم بۆم نووسین.

## تێبینی:

شەو دەرگا کرایەوە ئەو پیاوە باشە (....) هاتە ژوورێ ویستم دەستی ماچ بکەم، گوتم: تۆ منت ڕزگار کرد ئەگینا ئەم دەتوانی بەو شێوەیەی کەبیستوومە بەرامبەر بەدادگای شۆڕش ئەم هەموو قسانە بکەم سوپاس بۆ یەزدانی مەزن کەمرۆڤێکی وەکو تۆی لێیەو لەناو ئەو دۆزەخە یارمەتی هەژارو لێقەوماو دەدەیت، من هەمووی بەهی تۆ دەزانم، قەد بیرم ناچێتەوە،

حەز دەکەم ناوت بزانم، شوێنت، چیت دەوێت بۆت بکەم، ئایا هۆی چی بوو وای لەتۆ کرد کەیارمەتیم بدەیت؟

وتی: ناوم (....) ئەم نیشانە لەنێوانماندا بێت، من پەیوەندیم بەهیچ گروپێکەوە نییە، ئەوەی وای لێکردم کەیارمەتیت بدەم ئەمەبوو توانیت بەرامبەر ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەیە راوەستیت، جاری یەکەم چاوم بەدایکت و کورەکانت کەوت هەر لەخۆمەوە دڵم بۆیان کرایەوە. لەو رۆژەوە بەبێئاگاداری تۆ زۆر یارمەتیم دلویت خوای گەورەش رەحمی خستە دڵی صدام هەموو ئەو قسانەی کەرووبەرووی دادگا کردت ناوەرۆکەکەی، قسەکانت، بەپەلە ئاگاداری یان کردەوە، وشەو وەڵامی صدام ئەمە بوو: (رجل شجاع مايعدم) ئەوە بوو حوکم درایت بە ٢٠ ساڵ. کاکە رەفیق ئەوە سیاسەتە، دوور نییە مانگ نەروا بەرەڵلاش بیت، ئێمە بەتێکرایی باسی ئەوە دەکەین کەئەم هەموو شتەت لەمێشکدا چۆن هێشتبۆوە تێکرا ئێستاکە بەچاوێکی گرنگ تەماشات دەکەن، ەبەیانییەکەی ئەبەنە بەندیخانە بەماڵ ومنداڵت شاد دەبیتەوە.

وتم: فلان کەهاتم دووچار بەقەدەر ئێستا بووم، راستم کرد لە ١٠٣ کغم وە هاتمە ٥٢کغم.

## هۆیەکانی (صدام تکریتی)و باڵا دەست بوونی:

سەرکەوتن و زاڵ بوونی بەسەر ئەو رووداوانەی کەلەخوارەوە بەکورتی ئیشارەتی پێدراوە بوو بەهۆی ئەوەی کەبگاتە ئەو پلەیەی ئێستاکە بەدیکتاتۆری عێراق ناودەبرێت.

١-٣٠ ئابی ١٩٦٨.

٢-بوونی بەئەندامی (مجلس القيادة الثورة).

٣-بەیانی ١١ی ئازاری ١٩٧٠.

٤-خۆماڵی کردنی نەوت (تاميم النفط) و دابەش کردنی وارداتی بەم شێوە دیموکراتییە لە ٣٣٪ ی بۆ شخصی (صدام حسین) و لە ٣٣٪ ی بۆ

وەزارەتی بەرگری وە لە ٣٤٪ی بۆ هەموو دانیشتوانی گەلی عێراق و دەزگـای ئاسایش (استخبارات، مخابرات، ئاسایشی گشتی).

٥-رێکەوتنی جەزائیر.

٦-هەرەس هێنان بەشۆڕش.

٧-پووچەڵ کردنەوەی کودەتاکەی (ناظم کزار).

٨-بەزیندوویی لەسەر حوکم لادانی (احمد حسن بکر)

٩-دوورخستنەوەی ٢١کادری بەعس و لەرێگای کـەس وکاریـان گوللـە بـاران کران.

بەبێ ئـەوەی کەسێك هـەبێت ڕوویـەڕووی ڕاوەستێت توانـی لەسـەدا سـەد حوکمی عێراق بگرێتە دەست بەهەموو سەروەت وسـامانی یـەوە. وەنزیکـەی زیـاد لـە ٢٠ ملیۆن بەشـەر لـە ژێر فـەرمانی ئـەو، بـەپێی فـەرمانی ئـەو ئەجووڵێنەوە، هەموو فەرمانێکی کەدەیدات بەناوی (مجلس القیادة الثورة) (هیتلرو ستالین وشاوسیسکو) بـەم شـێوەیەی ئـەو دیکتـاتۆر نـەبوون و دەستیان نەڕۆیشتووە، بەتایبەتی لەباری ئابووریەوە.

ئاشـکراو ڕوونـە لەسـەرەتای هاتنیـان لـە ١٧ی تـەمموزی ١٩٦٨ وە کـوردو عـەرەب و شیعەو ئاسـووری بەرهەڵسـتکاری (معارضـة)ی هـەبوو صـدام تیشـکی خسـتە سـەر ئـەو شـەش خاڵـە سـەرەکی یە تـاکو (معارضـة) بەرهەڵستکاران بەهیچ جۆرێك نـەتوانن بەرهەڵستی بکـەن، بەشێوەیەك زاڵ بێت لەدەرەوەو لەناوەوە. ئەوەش (ڕێکخراوی بەعس، مخـابرات، ئاسـایش، اسـتخبارات، سوپای کۆشـکی کۆمـاری، محکمـەی ثـورة) بـوون بـەپێی نووسراوی ئاسایش و استخبارات و مخابرات بەگوێرەی نووسراوەکانیان حوکم دەردەچێت.

بـەپێی فـەرمانی صـدام، ڕۆژانـە کاروبـاری وڵات دەبـەن بـەڕێوە، کـەهیچ یاسایەك نییە بەرامبەر ئەم شەش خاڵانەی سـەرەوە لێپرسینەوەیان لەگـەڵ بکات.

بۆ نموونە:

کوشتن، گرتن، دوورخستنەوە، لەناوبردن، ماڵ وێران کردن، ئازار، ئەشکەنجە، ریسواکردن.

## تێبینی:

١-گرنگ نییە کەئازاو زاناو زیرەك و رۆشنبیر و پرۆفیسۆرو زمان زان بێت، یان شاعیر بێت، یان سەرۆکی هۆز بێت یان لەبنەماڵەیەکی بەرز بێت. گرنگ ئەوەیە یەکێك بێت لەم شەش خاڵانەی سەرەوە، ئەو کاتە تۆ یەکێکی لەبەختەوەرەکانی عێراق و خاوەن هەموو شتێکی.

## صدام و هەڵەکانی:

دژایەتی کورد، دژایەتی شیعە (بنەماڵە محسن حکیم)، هێرش کردنە سەر ئێران، گرتنی کوێت.

## • کورد:

لەکاتێکدا لەچەرخی بیستەم صدام تکریتیبەهەموو توانایەکی یەوە دژی ٦ ملیۆن کورد راوەستاوە هەموو جۆرە چەکێکی قورسی بەکارهێنا کوشندەترین چەك (گازی خردل وگازیڤی ئێکس )هەموو جیهان ئەوەیان خستە پشت گوێ، بۆچی رووبکەنە کوردیارمەتی وپارێزگاریبکەن لەکاتێکدا کەکیانی سیاسی نییە لەهەمان کاتیش صدام تکریتی زوویر دەبێت و کاروباری بازرگانی دەوەستێنێت لەگەڵیاندا بەهۆی سەروەت وسامانی عێراق، هەموو ئەوروپای رۆژهەلات و ئەوروپای رۆژئاوا روویان کردە شەخصی صدام.

لەکاتێکدا ئەو کارەساتەی بەسەر شاری هەڵەبجەدا هێنا لەساڵی ١٩٨٨ یەکەم جار بەداخەوە دەوڵەتێکی وەکو ئەمریکا کەباری ئابووری بەرزە، پێویستی بەو ٢ هەزار ملیۆن دۆلارە نییە کەلەعێراقی چنگ دەکەوێت بەلام

ئەمەریکا پاکانەی بۆ (صدام) کرد، هەرچەندە کوردی بێ پشت ناچارە ئەمە دایم پشت گوێ بخات و لەبیر خۆی بەرێتەوە.

لەسێدارەدان و تیرۆر کردن، وێران کردن، تەعریب، تەبعیس، ئەنفال، ١٨٢ هەزار کورد زیندە بەچاڵ کران هەروەها ٨٢٠٠ بارزانی کە ٣٤ کەسیان لەبنەماڵەی شێخەکانی بارزان بوون.

- هێرش بردنە سەر ئێران ٨ ساڵ شەڕ بەردەوام بوو، لەساڵی ١٩٨٠ بۆ ساڵی ١٩٨٨ ئینجا شەڕ راوەستا وا چەند ساڵە هەر لەوتوێژدان، هەتاکو صدامیش مابێت ئەم رێکەوتنە نابێت.
- دژایەتی ئاینی شیعە، بەتایبەتی بنەماڵەی (محسن حکیم) لەیەکەم رۆژی هاتنیان بۆسەر حوکم تاکو ئەم ساتەی کە ئەم کتێبە بڵاو دەبێتەوە بەعس بەردەوامە لەدژایەتی.
- گرتنی کوێت و تاڵان ووێران کردن و کوشتن و دوورخستنەوە و شاردنەوەیان لەبەندیخانە ئێستاش هەر دیار نییە.

ئەوەبوو ئەم هەموو هەوڵ و کۆششەی جیهان کردی لەرێگای گفتوگۆ لەگەڵ (صدام تکریتی) تاوەکو بگەرێتەوەو لەکوێت دەرچێت، (مغروری) خۆی بوو بەهۆی ئەوەی کەئەورووپای ئەمەریکاو دۆستانی لەگەڵ دەوڵەتانی میسرو سوریاو دەوڵەتانی کەنداوی عەرەب بەگژیدا بچنەوە.

- لەدوای شەڕی جیهانیی یەکەم ونەمانی ئیمپراتۆریەتی تورك، ئەوەبوو گەلی عەرەبی هەوڵ ئەدات هەتاوەکو ئەمڕۆ لەئیستعماری تورك و بێگانە رزگاریان بێت.
- لەهەمان کات گەورەترین تەنگ وچەڵەمەی کەهاتۆتە پێشی لەنێوان جوولەکەو عەرەب (غرب و عرب) کەناودەبرێت بەکێشەی فلسطین وە (القدس) لەسەر زمانی هەموو ئیسلامێکە، بەتایبەتی گشت جەماوەری عەرەبی.

گەلی عەرەبی بەتایبەتی ئەوەی هەستی نەتەوایەتی هەیە دوای نەمانی خوالێخۆش بوو جمال عبدالناصر تیشکێکیان خستە سەر (صدام تکریتی) کەکێشەی (فلسطین و قودس) رزگار ئەکات، بەڵام بەشێکی زۆر کەم لەزاناو سیاسەتمەدارانی جیهان ئەمەیان ئەزانی کەلەشەخسی صدام زۆر دوورەو ناوەشێتەوە.

چونکە سوپای عێراق بەتایبەتی سوپای بەعسە، پڕ چەکە لەهەموو جۆرێك، بەڵام ٩٠٪ ی ئەفسەرو سەربازی بەعسی نییە و خۆی بەکوشت نادات بۆ شەخصی صدام.

زۆر لە جەنەڕاڵەکانی عەسکەری گەیشتوونەتە ئەو پلەیە کە کۆلێجی ئەرکانیان نەخوێندووە، بۆ نموونە بۆ خۆی لەژیانیدا ڕۆژێك عەسکەری نەکردووە پلەی (مشیرە) لەجیاتی ئەوەی ئەفسەرێکی ناسراو (عبدالله سید احمد)کە بەیەکەم دەرچووە لەکۆلێجی ئەرکانی ئینگلیزی لەناو ٦٧ دەوڵەت دا دەبوو ئەو قیادەی جەیشی بکردایە، بەڵام دووریان خستەوە لەبەرئەوەی کوردە.

گرتنی کوێت لەلایەن (صدام تکریتی)یەوە گەورەترین تیری ژەهراوی ڕوویەڕوو لەگەڵی عەرەبی دا ئەوەندە کوشندە بوو، ئەو ژەهرە بەجۆرێك چووە بەدەنی هەموو مرۆڤێکی عەرەبی نەتەوەپەروەر، چاك بوونەوەی نییە، بەتایبەتی کوێت.

ئەوەبوو سوپاکەی بەعس کەمشیر (صدام) سەرپەرشتی دەکات تێك وپێك چوو بەجۆرێك شکا، قائد لەپێش هەموو کەسێکدا ڕایکرد، هەی لەوەی ڕاکا، یابچێت خۆی تەسلیم بەسوپای ئەمەریکی و هاوپەیمانەکان بکات، کەئەو کارەساتە ڕوویدا لەهەموو ڕۆژنامەو ئیستگەو تەلەفزیۆنە جیهانییەکان. بڵاوکرایەوە، لەجیاتی ئەوەی خۆی بکوژێت، یان ئیستقالە بکات بەشی زۆری خەڵك ئەم دوو ڕێگەیەی بۆ دانابوو، بەڵام بێ شەرمانە ئیمزای تەسلیم بوونی کرد.

سەرۆکی لیبیا (معمر القذافي) لەلێدوانێکی دا گوتی: صدام ژەهرت بخواردایە باشتر بوو لەوەی تەسلیم بوویت.

## سەرۆکی کۆمار و ئیش وکاری لەهەموو جیهان بەم شێوەیە سەرۆکی کۆمار تقییم دەکرێت:

ئەبێت هەموو پێداویستیەکانی شەخسی هەبێت، لەسەر هەموو مرۆڤێکی وڵاتەکە جوانترین و باشترین کۆشك و ناو ماڵ و سەیارەو .... لەسەدا سەد ١٠٠٪.

چونکە مەسئولە بەرامبەر خودای مەزن و ڕوویەڕووی گەلەکەی بەجۆرێك ئەوەندە مەزنە لەدوای خواوەندی گەورە ئەو ڕابەرە بەچاوی باوك سەرنج ئەدرێت.

هەموو پێویستیەکانی گەلی عێراقی ئەبێت ١٠٠٪ بۆی ئەنجام بدات، ئەمن و ستقرار، ژیانی ڕۆژانەی، ژیانی ئابووری، ڕێگەدان بەخوێندن بەخۆڕایی، (خدمات طبيه).

فەرمانەکانی سەرشانی گەلیش پێویستە بەپێی یاسا کەبۆی دانراوە لە ١٠٠٪ هەمووی جێبەجێ بکات، بەبێدواکەوتن، مرۆڤ بۆی هەیە ج بەنووسین یان بەقسە هەموو سلبیاتی حکومەت بخاتە بەرچاو ج لەڕێگای ڕۆژنامەو گۆڤارەوە لەسنووری یاسا دارای خۆی دەبڕێت.

دانیشتوانی عێراق لە ٨٠٪ بارودۆخی ئێستاکە وای لێ کردن لەسیاسەت بدوێت و قسە بکات و بۆچوونی خۆی بەزەقی ئاشکرا بکات، لەسەر ڕەوشتو کردەوەو بۆچوونت هەموو سەعاتێك چەند ڕۆژنامەو ئیستگەیەك لەهەموو جیهان دا گوتارێك بلاوئەکەنەوە لەسەرشەخسی (صدام تكريتى) باسی سلبیاتی ئەکەن.

ڕۆژانە هەموو دانیشتوانی گەلی عێراق ئەبێت لەهەموو بۆچوونێکی باسی سلبیاتی صدام بکات، هەموو کەموکورتیەکی تایبەتی هەبێت ئەو بەتاوانبار ئەزانێت، هەموو ئەو بارودۆخەی کەبەسەر عێراق دا هات، گەلی عێراق کەتبە ئازارو ئەشکەنجە ڕۆژگار دەباتە سەر ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ شەخسی صدام.

کەباسی یەکێك لەو کەموکوڕیانەی خوارەوە دەکرێ ئەڵێت (ئاخ صدام تكريتى)

هەر لە (ئاو، کارەبا، بەنزین، نەوت، خواردن، نەبوونی، نەخۆشی، تەندرستی، بێئیشی، خوێندن، گرانی، بێکاسبی، گرتن، تەنگوچەڵەمەی خێزانی) ئەم هەموو گرتن و تالان کردن و دزی و بەرتیل، مشکلەی خانووە ... هتد.

- تاوانباری ئەکەن ئەڵێن جاسوسی ئەمەریکایە.
- بەفەرمانی ئەمەریکا بوو شەڕی ئێرانی کرد.
- ئەمەریکا ئیشارەتی بۆکردیت گرتنی کوێت.

- دەوڵەتەکانی خلیج بەهۆی گرتنی کوێت باری ئابووریان بەجۆرێك قورس بووە، کەوتنە ژێر قەرزداری، بەجۆرێکی ئەوەندە درندانە جوولایەوە لەگەڵیان، ناوێرن ئەگینا هاواریان ئەکرد بەدەنگێکی بەرز لەرۆژنامەو ئیستگەو تەلەفزیۆنەوە بەزەقی بڵاویان ئەکردەوە، رۆژانە ئەیان گوت هەموو ئەو بارودۆخەی رووەدات تەنها صدام تکریتییە، نەمانی مایەی ئاشتیوشادییە لەجیهان دا.
- سەروەت وسامانەکەی دووجار بەرامبەر شای ئێرانە کەلەدوای جێماوە، هەر بەردەوام تاکو زیاتر بێت.
- هەر خەریکی کۆشك دروست کردنە لەکاتێکدا کەسەدەها ملیۆن دۆلار سەرف ئەکات.
- سەربازو ئەفسەر بەکەلوپەلی عەسکەری سواڵ ئەکەن.
- بەشێکی زۆر لەدانیشتوانی عێراق رووی کردۆتە دەرەوەی وڵات، وەکو (رۆشنبیر و دکتۆر، پرۆفیسۆر، ئەندازیار، مامۆستا، قوتابی، ئەفسەر، کاسب، جوتیار، کرێکار) بەردەوام خەڵك لەرۆیشتندایە ئەوانەی لەسنووری تورکیاوە ئەڕۆن باش ئەزانن کوشتن، یان گرتن، ئینجا سنووردراش چاوەڕوانیانە.
- رۆژانە بەردەوامە لەوێنەگرتن و بەناچاری هەموو مرۆڤێك وێنەی ئەوی لە ماڵەوە هەڵواسیوە، (بۆ زانیاری) ژنی دووەمی نیرۆن تەنها یەك رەسمی هەیە ئەویش لەمۆزەخانەیەکی فەرەنسیدا دانراوە، لەهەموو ئیتالیا رەسمی نییە، دوای نەمانی (ان شاء الله) ئەویش وێنەی نامێنێت لەعێراق، بەتایبەتی لەکوردستانی باشوور.

یەکێك قسەکانی دەڵێ (کەهاتم عێراقێکی دواکەوتوو بوو لەهەموو بارێکەوە، کەرۆیشتم ئەبێت بەوێرانی بەجێی بهێڵم). کوردیش دووعایەکی هەیە ئەڵێت خوامان هەیە، کە دەستی نەرۆیشت ئەم دوعایە ئەکات.

**عبدالسلام عارف:**

لەساڵی ١٩٦٥ سەردانی بۆ پارێزگای بەسرە بەفڕۆکە چوویۆ زوییر میلکۆپتەرەکە کەوتە خوارەوە هەموویان سووتان بەهۆی

سەعاتەکەی‌دەستی تەرمەکەیان ناسیەوە(بەدەسیسەی بەعس ئەم کارە تیرۆریستە ئەنجام درا).

ئەفسەرە کوردەکان کەلەکۆلێجی عەسکەری بوون، ئەگێڕنەوە ئێواران کاتی پشوودان هەموومان کۆڕێکمان ئەبەست لەنێوان خۆمان دا گفتوگۆمان ئەکرد، لەگەڵ ئەو دەرەبەگانە قسەی گفتوگۆو هاتوچۆ کردمان یەکجار پێیان خۆش بوو، تەنها (عبدالسلام عارف) نەبێت زۆر خۆی دوور دەخستەوە لەئێمە، هەڵوێستی یەجگار ناڕێک وپێك بوو.

کاتێك لەڕووداوی ١٤ی تەمموز ١٩٥٨ ناوی هات بەم شێوەیەو کەدیمان حوکمی گرتە دەست. ئەگەر ڕۆشنبیرانی کورد بەسەدەها کتێب بنووسن لەسەر ئەوەی کردنویەتی بەرامبەر بە گەلی‌کورد تەواو نابێت لەکوشتن و دێ سووتاندن و ماڵ وێران کردن و لەسێدارەدان و گرتن و زەجر کردن.

هەڵوێستی ڕوون و ئاشکرا بوو، بەزەقی بێ‌شەرمانە ئەیگوت لەعێراق هەرچی هۆزێکی کورد هەیە ڕەسەنی ئەگەڕێتەوە بۆ عەرەب، وشەیان گۆڕاوە چونکی لەشاخ ژیاون بەقسەی کوردی ئەدوێن، ئەیگوت لەعێراق کێشەیەك نی‌یە کەپێی بڵێیت کێشەی کورد.

جارێکیان برایەکی ئەرمەنی خاوەن (صالون حلاقە ئافۆ) بەغداد -منصور گیرا، دوای بەردانی هاتە لام سوپاسی کردم و بەیەکەوە چووینە لای بەڕێوەبەری ئاسایشی کەرخ پرسیارم لی‌کرد ئایا ئەمە تاوانی چی‌یە؟ ئاگاداری بکەن تا خۆی باش بکات. تا جارێکی تر تووشی ئازارو ئەشکەنجە نەیەت، منیش تووشی زەحمەت نەکات، بەڕێوەبەری ئاسایشی کەرخ دوو بەدوو پێی ڕاگەیاندم ئەم کابرا ئەرمەنیە گەورەترین تاوانی کردووە هەقی کوشتنە، (ابو بازیان) چۆن تۆ یارمەتی ئەم جۆرە مرۆڤانە ئەدەیت، ئایا ئەزانیت (ام احمد) خێزانی (عبدالسلام عارف) چۆتە لای چۆن تۆ بەمە ڕازی ئەبیت ژنی سەرۆکی کۆماری کۆن کردەوەی وەهای لەگەڵ بکرێت.

وتم: لەم ڕۆژانە لای (صالح مهدی عماش) بووم (وەزیری ناوخۆ) تەلەفۆنیان بۆ کرد کەڕێگابدات ام احمد سەفەر بکات بۆ قاهیرە، (عماش) وتی: من ڕێگا نادەم ژنی سەرۆکی کۆماری‌کۆن بچێتە قاهیرە ئابڕوومان بەرێت لەوێ بەکەیفی خۆی ڕابوێرێت، ام احمد بۆتە ... دیارە.

کاتێك ئاگاداری ئاڤرەم کرد کەتۆ گیراویت دۆستایەتیت هەیە لەگەڵ (ام احمد) پێکەنی بڕیاری دا ئیتر وازیهێنێت لەئیشەکەی و نەچێتەوە محەلەکەی، بـڕوام پیّ نەکردو دەمزانی کەڕاست ناکات.
ڕەنگە ئەمە بەشێك بن لەو دوعایەی کورد

## دوای ڕێك کەوتنی جەزائیر:

بۆمدین سـەرۆکی کۆمـاری جزائـر بەشـێوەیەك گیـانی لەدەســت دا دووجـار ویستی (انتحار) بکات، ئەوەندە ڕەزیل بوو لەسەر جێگا.
شای ئـێران محەمـەد رەزای پەهلــەوی لەهــەموو جیـهان جێگـای نـەبۆوە پاڵپشـتەکەی کەئەمـەریکا بـوو ڕێگـای پـێنـەدا تـاکو پشـوو بدات. دونیــای لێهاتەوە یەك و بەنەخۆشی زۆر پەنجە گیانی لەدەست دا.
صدام تکریتی: بزانین چی بەسەر دێت.

- ((احمد حسن بکر:

رابردوویەکی تاریك و ڕەشـی هەیـە بەرامبـەر بەگـەلی کـورد، زاڵـم، پیـاوکوژ، درۆزن، لەکاتیّ کەسەرۆکی وەزیر و سەرۆکی کۆمار بـوو، بەشـدارە لەهـەموو بڕیاردان و پیلانێك بۆ لەناوبردنی گەلی کورد، دەستی باڵای هەبوو.
(احمد وصدام)، بڕیاری کوشتنی بارزانی ئەدەن، سیّقۆڵی بوو ئەم مەبەستە، (احمـدو صـدام ونـاظم کـزار) بەشـدارن پیـلان دانـان، بـەلام نـاظم بۆ جێبەجیّکردنیَ لەگەڵ مەلا ئاینـەکان کۆدەبێتـەوە، شـوکر بـۆ خـوای مـەزن (بارزانی) سەلامەت بوو.
احمد وصدام (تعریب وتبعیس و وانفال) یان (کـورد بەعـەرەب کـردن و کـورد کردن بەبەعسی و کوردیان بەکافردانا بـۆ لـەناوبردنی ) هـەرچییان پـیّ کـرا کردیان. (احمد وصدام) ویسـتیان ٤ ملیـۆن کـورد لـەعێراق دوورخەنـەوە بـۆ دەرەوەی وولات، بەلام دڵسۆزو پاڵپشتی هەمیشەی کـورد جـەنابی سـەرۆکی کۆماری لیبیا معمر القزافی و سەرۆکی کۆمـاری سـوریا ڕێگایان پـێنـەدا ئەمـە جێبەجیّ بێت لەخودا بـەزیاد بێـت سـەری نـەگرت، ئەمـە ئـەبووە گرژییـەك لەنێوان هەردوو نەتەوەی کوردو عەرەب هەتاهەتایە.

● برادەرێکی دڵسۆز و شیرینم (...) ناتوانم ناوی بهێنم، چونکە لەژیان دا ماوە و پیاوێکی ناسراوە با تووشی ئازارو ئەشکەنجە نەبێت.

لەساڵی ١٩٩٨ دا پرسیارم لێکرد ئایا دۆستایەتی و هاتوچۆکردنتان هەر وەك خۆی ماوە لەگەڵ (احمدحسن) بکر.

(..) وتی: لەو ڕۆژەی لەسەری سەرەتایی بووم یەکترمان ناسی لە هەموو ژیانمان بە یەکەوە بوو ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دۆستایەتیمان بەهێزتر دەبوو.

وتم: ئایا ئەمە ڕاست بوو یان شانۆگەری بوو (احمد حسن بکر) دەستی کشاندەوە لەسەرۆکی کۆماری.

فلان: وتی (ابو بازیان) ئەمە صدام بەسەری چەسپاند زۆرە ملێبوو دووساڵ بوو لەمخابرات تەنها وێنەی صدام بەدیوارەوە بوو، صدام حوکمی گرتبووە دەست ماوەی دوو ساڵ پێش لابردنی (احمد حسن بکر).

پرسیارم لێکرد ئایا چۆن مرد؟

فلان وتی: لەو خانووەی لێی بوو پاسەوانی عەسکەری هەبوو دوو کیژی جوانی فنلەندی خزمەتیان دەکرد، کەشتیان ئەهێنا لەسەر ئەرزو ئەڕۆیشتن پشتاو پشت نەگەڕانەوە، مانگی ٤-٥ جار ئەچوومە لای. پێش مردنی بە ٢٥ ڕۆژ چوومە لای، پاسەوانەکانی نەما بوون دەرگا لەسەر پشت بوو دەرگای ژوورێشی کرابۆوە دوای سڵاو پێم وت احمد وا ئەمرییت بۆچی بەسەرهاتی خۆت نانووسیت؟ منیش ڕۆژێك نا ڕۆژێك دێم ئەییەم بەم، احمد گوتی ناتوانم، بۆ تۆش باش نییە، پێش مردنی بەچوار ڕۆژ چوومەوە لای پاسەوانەکانی نەمابوون و کیژەکانیش نەمابوون، دوایی لەسەر سەری ڕاوەستام کاتێك سەری هەڵبڕی وتی (فلان) لەکەیەوە لێرەیت.

وتم: ١٦ دەقیقەیە لەسەر سەرت وەستام، ئەوە قورئان ئەخوێنی؟ لاواز بوویت، خەریکە دەمریت، چیتە قسەم بۆ بکە.

احمد گووتی: ماوەی یەك مانگ نانم پێناخورێت، بەهیچ جۆرێك ئیشتیهام نەماوە، وایان لێکردم کەبەم جۆرە بمرم.

دوای چەند ساڵێك هاوڕێکەم و (خیر الله طلفاح) یەکتر دەبینین. فلان گوتی: ڕۆژێك (خیرالله طلفاح) هاتەلام گوتی ئایا ئەزانی خەڵك بەچ جۆرێك بەخراپی باسی برادەرەکەت (احمد حسن بکر) ئەکەن.

فلان، وەڵامی ئەداتەوە ئەڵێن نەعلەت لە(احمد حسن بکر).

(خیر الله طلفاح): ئەڵێت ١٠٠ سەد هەزار جار نەعلەت لە(احمد حسن بکر).
فلان ئەڵێت: تۆ بۆچی وائەڵێیت خۆ ئێوە بەهۆی (احمد)ەوە گەیشتنە ئەم پلەو پایە.
(خیر الله طلفاح) ئەڵێت: دوو بەدوو لەگەڵ (ابو عدی) قسەمان ئەکرد لەجەرەیانی گفتوگۆ کردن باسی باروودۆخی سیاسی ئەم ڕۆژەم کرد کەبنەماڵەی ئێمە بەچ جۆرێك دوژمنمان هەیە لەدەرەوەو ناوەوە بەتایبەتی شەخسی تۆ من وابەباشی ئەزانم کەیەکێك لەخزمە نزیکەکانی خۆت جێنشینی تۆ ئەبێت کەخودا نەخواستە تووشی شتێك هاتیت یەکسەر بێتە سەر حوکم، تاکو ئەم حکومەتەمان هەر بەردەوام بێت.
صدام ئەڵێت: خاڵە بەڕاستی باشت بیرکردۆتەوە منیش لەم بارەوە ئەم پێشنیازەت ئەخەمە بەردەم چ مرۆڤێك پەسەند ئەکەی.
(خیر الله طلفاح): کەس هەیە لەکوڕی خاڵت بەم جۆرە دڵسۆزو نزیکت بێت، لەهەموو ڕوویەکەوە جێباوەڕتە و هی هەموو خێزانەکەیە، دوای سێ ڕۆژ عدنان ی کوشت لە(ساڵی ١٩٨٩ ).
فلان ئەڵێت: تۆ ئەمە ئەزانیت کەصدام لەپیلانێك بەفڕۆکە عدنانی کوشت.

● صدام لەبەرچاوی خۆی بەفرمانی خۆی حسین کاملی زاوای کوشت لەساڵی ١٩٩٧.
● عدی زامدار کرا، نیوە مرۆڤە، هەتاکو ماوە هەر بەشکستی ڕۆژگار ئەباتە سەر.
● پیلان و دەسیسەو نەخشەی سیاسەتی ئیستعماری ئینگلیزی، یەکەم هەنگاویان ئەوەبوو حکومەتی مەلیك محمودیان لەناوبرد.

لەهەمان کات دا سیاسەتە چەوتەکەیان بەزۆر بەسەر گەلی کوردیان چەسپاند کوردستانیان بەستەوە بەعەرەبی عێراق ئەوە بوو حکومەتی عێراقیان دلمەزراند. بەبێ ئەوەی لەگەڵ کورد گفتوگۆ و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم کێشەیە بکەن، لەکاتێکدا گەلی کورد بەتێکڕایی دژ بەم هەڵوێستە بوون ومێژووش شاهیدە. ئەبوو لەچوارچێوەی عێراقێکی سەربەخۆ کێشەی کورد جێبەجێ بکرێت.

ئاشكراو ڕوونە لەیەكەم ڕۆژی دانانی حكومەتی عێراق هەرچی هاتۆتە سەر حوكم هەمووی بەكودەتای سەربازی هاتوون یان وەكو مەلیك فیصل ئیستعماری ئینگلیزی دای مەزراندن بەو پلەیە. هەموو سەرۆكی حكومەتەكان بەهەموو تواناياكيانەوە نەخشەی سیاسی و عەسكەرییان نەبوو كەنەهێڵن ڕۆژێك لەڕۆژان كورد بەخۆشی و ئازادی و سەربەستی وەكو گەلی عەرەبی ڕۆژگار بباتە سەر سەرانسەر هەر بەچاوی دووهەم یان سێهەم تەماشا كراوە و مامەڵەیان لەگەڵ كردووە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەموو پیلان و نەخشەی سیاسی و عەسكەرییان لەزەمانی عەهدی پاشایی تاوەكو ئەم مێژووە لەناوبردنی كورد بووە بەتایبەتی حكومەتی (عبدالسلام عارف) ئینجا (احمد حسن بكر) لەسەرو هەموویانەوە (صدام تكريتي).

● لەساڵی ١٩٥٩ بابەكر اغای گەورە كەسەرۆكی هۆزی پشدەرە ئەمەی گێڕایەوە منیش ئامادەی ئەو دانیشتنە بووم لەكودەتاكەی (رشيد عالی گەیلانی) ساڵی ١٩٤١ دوای ٤٠ ڕۆژ بەسەر حكومەتەكەی ئەوەبوو تێك چوو و هەرەسی هێنا ڕای كرد بۆ ئەڵمانیا.

باڵوێزی ئینگلیزی تازە هاتە عێراق لەوكاتەی باڵیۆزی كۆنی ئینگلیزی لەفڕۆكەخانەی بەغداد پیاوە گەورەكانی عێراق ئامادەبوو، باڵیۆزی كۆن داوا لەباڵیۆزی تازە دەكات كەیەكەیەكە لەگەڵ ئەو خەڵكانەی كەهاتوون خواحافیزیان لێ بخوازێت، لەهەمان كاتیش یەكە یەكە بەباڵیۆزی تازە بناسێت كاتێك كەدەگەنە سەر (جمال بابان) كەناسراوە بەباوكی شوان باڵیۆزی كۆن ڕوو دەكاتە جمال بابان و قسە لەگەڵ باڵیۆزی تازەدەكات، كاتێك كەمن چل وئەوەندە ڕۆژە دەست بەسەربووم ئەوەی كەزوو زوو سەری دەدام وە بەردەوام خواردنی خۆشی كوردی بۆ ئەهێنام ئەم زاتە مەزنە بوو لەبنەماڵەیەكی كوردی ناسراو كەحكومەتی كوردیان هەبووە بەناوی حكومەتی بابان لەسلێمانی، بۆ ئاگاداریت ئەم زاتە مەزنە دۆستێكی تاجی بەریتانییە ڕاسپاردە هەیە كەپشتگیری بكەین.

باڵیۆزی تازە دەڵێت خۆشحاڵم بەناسینت، حەز دەكەم ئەگەر كارێكت هەیە بۆت ئەنجام بدەم.

(جمال بابان) دەست هەڵدەگوشێ و ڕوودەکاتە هەردووکیان بە باڵیۆزی کۆن و تازە ئەڵێت (فیصل) تان هێنا کردتان بەمەلیك بەسەر ئێمەدا دوای ئەم هەموو خزمەتەی عەرەبتان کرد لەعێراق حکومەتێکی عێراقیتان بۆ دامەزراندن ئێمەتان بەزۆر بەستەوە بەعەرەبی عێراق لەکاتێکدا ئێمە کوردین، ئینجا کودەتایان کرد بەسەرتاندا لەکاتێکدا ئێوە لەجەنگدان دژ بە هیتلر، باشە بۆ بیرێك لەکێشەی کورد ناکەنەوە، داوام لەتاجی بەریتانی ئەوەیە کەشتێکیش بۆ ئێمە بکەن، کێشەی کورد جێبەجێبکەن.

باڵیۆزەکان یەك وەڵامیان دەبێت، ئەویش ئەوەیە لەجانتای دبلوماسی ئێمەدا کێشەی سیاسی کوردی تێدا نی‌یە، بەڵام حکومەتی تاجی بەریتانی داوای لەحکومەتی عێراق کردووە، کەڕێگەی خوێندن و کاسبی و پلەیعەسکەری و پلەوپایەی فەرمانبەر بەم جۆرە بێت:

کورد بۆی هەیە لەپلەی عەسکەری بگاتە سەرۆکی ئەرکانی سوپا هەروەها لەخوێندن دا بۆی هەیە بگاتە هەر پلەیەکی کەبیەوێ لەفەرمانبەری دا بگاتە سەرۆکی وەزیران لەڕێگەیەکی کاسبی‌یەوە دەوڵەمەندترین کەس ئەو بێت.

**تێبینی:**

١- لە ٨٥٪ ڕاستیان کرد تەنها کاری سیاسیت نەکردایە بەرامبەر بەحوکمی مەلیکی بۆ نموونە لە (١٤)پارێزگا (محافظ) (١١)یان کورد بوون.

٢- سەرۆکی دادگای کەرکوك و پارێزگاری کەرکوك و (مدیر شرطة)ی کەرکوك و بەڕێوەبەری شارەوانی کەرکوك و پۆلیسەکان و پاسەوانەکان هەموویان کورد بوون. فرقەی (٢)ی سەربازی لە ٩٠٪ سەربازەکان کورد بوون و لە ٤٠٪ ی ئەفسەرەکان کورد بوون، و لەژمارەی٤٨٠٠ کرێکار لە کۆمپانیای نەوت ٣٩٠٠ یان کورد بوون، دانیشتوانی شارەکە (٤)ماڵی عەرەبی لێ‌نەبوو کامێشیان بەخێو دەکرد هەندێك لەکاربەدەستەکان عەرەب بوون، شاری کەرکوك ٨٥٪ ی کورد بوون وە لە ١٥٪ ی تورکمان بوون.

٣- ئەگەر ئێستاکە سەرژمێری شاریکەرکوك بەتێکڕایی یەوە بکەین ئاڵەمەدا بۆت دەردەکەوێت وەدوای کودەتاکەی ١٩٥٨ چیان بەسەر کوردا

هێنا. کوردستانی کەرکوک گەورەترین شاهدە بۆ مێژوو کەناتوانن دەستی لێبدەن و بیگۆڕنەوە ئەویش ١٠٠٪ ی کوردە.

صدام بەم خەیاڵەوە ڕۆژگاری دەبردە سەر،

تێکڕا کورد لەژێر فەرمانی بەعس ئەجوڵێتەوە، ... بێی،

ئەگەر بەهێزو ژمارەیەن ڕێکخراوی بەعس ... کورد ...

وەچەکداری فرسانمان ژمارەیان زیاد لە ٢٠٠ هەزار چەکدارە، کەکورد پێیان دەڵێن جاش هەموو دانیشتوانی حوکمی زاتی ٩٩٪ لەگەڵ ئێمەن، پاڵپشتی هەرە گەورەی بەعس ئیمڕۆ کوردە، ڕۆژنامەو گۆڤارو تەلەفزیۆن وای دەخستە بەرچاو کەکورد هەمووڵەدەورپشتی سەرۆکیەکەیان صدام کۆبوونەتەوە، تەنها دووژمنانی کورد و بەعس کەلەژێر فەرمانی دەرەوە دەجووڵێنەوە، ئەوانیش ژمارەیان ئەوەندە کەمە بەپەنجەی دەست دەژمێرێن. ئا بەم جۆرە بیری دەکردەوە.

## بەرەی کوردستانی و ڕاپەڕینی ١٩٩١

بەناوی (بەرەی کوردستانی)یەوە کەوتنە جمووجۆڵ کردن پەیوەندیان بەزۆربەی زۆری دانیشتوانی کوردستان کرد بەڕاستی دەورێکی گەورەیان بوو بەتایبەتی ئەم دوو هێزە گەورەیەی کورد یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەسەرۆکایەتی (مام جەلال) و پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی بارزانی دەورێکی سەرەکیان هەبوو شان بەشانی ژن وپیاوو پیرو منداڵ ئەوەبوو لە ٩٧٪ ی کورد بەشداری ئەم ڕاپەڕینەی کرد هەموو کورد یەکی گرت و بوو بەیەك هێز بەچەکی سووك و دار و گیانی خۆی هێرشی بردە سەر داگیرکەری کوردستانی باشوور کە ٧٠ ساڵە بەزۆر بەستراوە بەعەرەبی عێراقەوە، ئەو سەربازگایانەی لەیەکەم ڕۆژی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە لەبەر مەترسی کورد دروست کراوە، لەحەفتاکانەوە ڕوسیای ئاشتی خواز تازەترین قەڵای دروست کرد بۆ بەعس.

لەماوەی یەك هەفتەدا، سەد هەزار سەرباز بەهەموو چەكێكی قورس و سووكەوە تەسلیم بوون لەقوتسی كورد كەئەویش كەركوكە، سەرانسەری هەموو كوردستان ٩٥٪ ی پاك كرایەوە و ڕزگار بوو.

هەموو ئەو هێزەی بەعس كەلەژێر فەرمانی صدام ئەجوولایەوە، وەكو بەفری بەهار توایەوە، ئەم ڕووداوە جێی سەرسوڕمان بوو لەهەموو جیهان باس ئەكرا.

گەلی كورد بەتێكرایی بۆی ئاشكرا بوو بەیەكگرتن ئەكرێت زاڵ بێت بەسەر دوژمنانی و كوردستان دەبێتە قەلایەك، بۆ هەموو مرۆڤێكی نیشتمان پەروەری كوردو كەمایەتی‌یەكان دەبێتە بنكەیەك بلێسەی ئازادی لێرەوە پەرە بسێنێت بۆ گەلانی دراوسی‌مان.

كورد هەمیشە گەلێكی ئازاو بەجەرگ بووە دوژمنان لەڕێی هێزەوە نەیانتوانیوە لەناوی بەرن، تەنها زیاتر ڕێگەی سیاسی و پیلان داڕشتن لەڕێگەی دەولەتانی ترەوە هێزی پێشمەرگەو جەماوەری كوردیان كپ كردۆتەوە.

● یەكەم ڕاپەڕین لەدەروازەی ڕانیەی خۆشەویست دەستی پێكرد، سەركەوتنی بەدەست هێنا لە ١٩٩١/٣/٥ دوای تێپەڕبوونی نزیكەی مانگێك بەسەر ڕاپەڕینەكەدا، صدام بەهەموو توانایەكیەوە هێرشێكی دڕندانەی كردە سەر كوردستان لەهەموو لایەكەوە و (مجاهدین خلقی ئێران) شان بەشانی سوپاكەی صدام (حرس الجمهوری) دەجەنگان دژی كورد، خەلكێكی زۆری بێتاوانیان كوشت.

● **كۆڕەو:**

گەورەترین ڕووداو بوو لەمێژووی كورد، بەم شێوەیە لە سەرانسەری جیهان باس دەكرا، نزیكەی سێ ملیۆن و نیو كورد زیاتر سەروەت وسامان ومالیان بەجێ هێشت ڕوویان كردە توركیاو ئێران.

● حزبی دیموكراتی كوردستانی ئێران، بەیانێكی ئاراستەی گەلی كورد كرد لەكوردستانی ڕۆژهەلات بەبۆنەی كۆڕەوی كوردستانی باشوورەوە تیَی دا، ڕایگەیاند هەریەكێك لەڕاست خۆیەوە بەهەموو توانایەوە دەستی

یارمەتی یان بۆ دریژ بکەن، بەپیر براکانتان بچن و خزمەتیان بکەن بەماڵ و بەگیان، ئەوەبوو هەڵوێستیان ئەوەی پیشان دا کوردستان یەك پارچەی دابەش کراوە، بەو چوار بەشە، لەهەمان کات کوردستانی باکوور باوەشیان کردەوە: جۆری شانازییە هەموو کوردێکی باشوور کەگەڕاوەتەوە چ لەکوردستانی باکوور چ لەکوردستانی ڕۆژهەلات، ڕاستی ئەم بەپیرچوونەی ئەو خزمەت کردنە هەتاوەکو ئەم ساتەش باس دەکرێت کەبەپیرەوە چوونێکی وەها هاتن بەپیرمانەوە باوك پارووی دەمی منداڵەکەی دەردەهێناو دەرخواردی ئەو خێزانەی دەدا کەدەیبردەوە بۆ ماڵەوە.

## • ڕووداوەکانی کوردستانی باشوور:

لای هەموو دانیشتوانی کوردستانی باشوور ئاشکراو ڕوونە منیش لەکتێبەکەم ئەو خاڵانەی گرنگە زەقە بەکورتی باسی دەکەم:

بڕیاری ئەورووپاو ڕۆژئاوا (ئەمەریکا بەریتانیا فەرەنسا) کەپارێزگاری کوردستانی باشوور بکەن دانانی هێڵی (٣٦)، وەهەروەها بنکەی ئەنجەرلیك بۆ ئەم مەبەستە، عێراق بۆی نییە بەفڕۆکەو هێزی پیادە هێرش بکاتە سەر هێڵی (٣٦).

- هەڵبژاردن (انتخابات) کرا لەئەنجامی ئەم ئەزموونە هەرێمی کوردستان دامەزرا، لەگەڵ هەموو دەزگاکانی.
- دەوڵەتە ئیقلیمییەکان کەوتنە پیلان و دەسیسەی گڵاو بۆ تێکدانی ئەم ئەزموونە هەر سێمانگ جارێك (ئێران و تورکیاو سوریا) بەئاشکرا کۆدەبوونەوە بەنهێنی عێراق دەوری سەرەکی هەبوو.
- کاتێك شەڕ هەڵگیرسا لەنێوان پ.د.ك و ی.ن.ك ئەم سێ دەوڵەتە ئیقلیمییە وازیان لەکۆبوونەوەکانیان هێنا، گەیشتنە ئەو باوەڕە بەپێی ئاگاداری خۆیان کەلەقووڵایی دەستیان دەڕوات جارێکی کە محاڵە لەژێر یەك یاساو هەرێم کۆببنەوە و بەیەکەوە ئیش وکاری کوردستان بەڕێوەبەرن.

- گەلی کورد لەکوردستانی باشوور لەژێر ئیدارەی سێ حکومەت، ڕۆژگار دەباتە سەر بەم شێوەیە:

- ٢/٥ی کوردستان لەژێر سێبەری صدام (خانەقین، کەرکوك، سنجار) دەژین.
- بەشێکی کوردستانی باشوور بەناوی هەرێمی کوردستان پایتەختی هەولێرە ئیدارەو حوکمی لەژێر پارتی دیموکراتی کوردستان دایە بەسەرۆکایەتی بارزانی.
- بەشێکی کوردستانی باشوور بەناوی هەرێمی کوردستان پایتەختی سلێمانییە ئیدارەو حوکمی لەژێر یەکێتی نیشتمانی کوردستان دایە، بەسەرۆکایەتی (مام جەلال).

__تێبینی:__

لەنێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستان و جمهوری ئیسلامی ئەوپەڕی دۆستایەتی بەردەوامە بەناوی بەرژەوەندی گشتی، تاکو ئەم مێژووە نزیکتر دەبنەوە لەیەکتر.

- لەنێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و تورکیا ئەوپەڕی دۆستایەتی بەردەوامە تاوەکو ئەم مێژووە وە ڕۆژانە نزیکتر دەبنەوە لەیەکتری بەناوی بەرژەوەندی گشتی.

- ڕێکەوتن نامەی واشەنتۆن:

جەماوەرە بەتێکڕایی ئەم پرسیارانە دەکات و ئەڵێت: ................................ لەکاتێکدا ئەمە گەورەترین ڕوودلو بوو لەمێژووی کوردستانی باشوور، لەدوا شەڕی براکوژی کەهەردووك ڕابەر شان بەشانی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا ڕاوەستان ڕێکەوتنەکەیان ئیمزا کرد.

- لەمانگی ئازاری ١٩٩٩ نوێنەری هەردوو حزبەکە چوونە ئەمەریکا کەگەڕانەوە بەزەقی بڵاویان کردەوە کەنوێنەری ڕوسیاو چین وفەرەنسا

ئێمەی نەدی، بەڵام نوێنەری ئەمەریکان بەریتانیا گفتوگۆیان لەگەڵ دا کردین، پێیان ڕاگەیاندین بڕۆنەوە ڕێکەوین، ئەوکاتە ئێمە هەموو شتێکتان بۆ دەکەین (کیانی سیاسی) یش.

تەنها لەو ڕۆژەوە کەئیمزایان کرد لەواشنتۆن [illegible] پەیوەندی [illegible] نەنێوانیان، ئێستاش کەمن ئەم کتێبە بڵاو دەکەمەوە، [illegible] حزبەکە بەرەو ئەمەریکا ڕۆیشتن.

ڕوون کردنەوەیەك دەربارەی هەرچوار دەوڵەتە ئیقلیمییەکان، ئینجا داوا لەبرا ئازیزەکانم دەکەم لەڕۆشنبیرو کوردی نیشتمان پەروەر و کەدەربارەی باکوورو کوردستانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا زۆر بەکورتی نووسیومە بەهۆی بارودۆخ وچەند هۆیەك.

## سووریا :

بەدرێژای سنووری تورکیاو سووریا کوردیان گواستەوە، ئەمە هەنگاوی بەعس بوو، بەناوی پشتێنی سەوز (حزام الاخضر)، دژی کورد جووڵانەوە کێشەی کورد، بەهیچ جۆرێك باس ناکرێت، کەناوی کوردستانی ڕۆژئاوا دێت سورییەکان وەڵامیان بۆئەوە دەست درێژ دەکەن کەگوایا کوردی ئێرە کۆچەرین (مهاجر) ین، لەتورکیاوە هاتوون.

## تورکیا :

سەرۆکی کۆماری تورکیا سلیمان دیمریل قسەکانی لەڕۆژنامەو تەلەفزیۆن بڵاویان کردەوە (کوردو حکومەتی کوردیم نەبیستووە ) بەئاشکرا سیاسەتیان بڵاودەکەنەوە، دەربارەی کوردستانی باشوور ڕازی نین بەهیچ جۆرێك هەردوو حزب ڕێك بکەون و کەبانگەشەی فیدراڵیەت بکەن تووشی لەرزو تا دێن.

## ئێران:

کەباسی کێشەی کورد دێت هەموو سەرکردەکانی جمهوری ئیسلامی یەك وەلامیان هەیە، ئێمە کێشەی کوردمان نی‌یە، چونکی (اسلام سنووری نی‌یە)، بەشێك لەڕۆشنبیرو کوردی نیشتمان پەروەر وا هەست دەکات سەرۆکی کۆماری تازە دەربارەی بۆچوونی گۆڕانکاری‌یەك ڕوودەدات لەکێشەی کورد.

## (صدام تکریتی) و عێراق:

تیشك ئەخاتە سەر دووخاڵ لەسیاسەتی:

١- بەپێی راپۆرتی ڕۆژانەو مانگانە کەدێتە بەردەمی لەوەزارەتی دەرەوەو ناوەوە بەتایبەتی لەباڵوێزی عێراقی لەتاران و تورکیاو سوریا و نوێنەری عێراق لە هەیئەتی (امم المتحده) و ئاسایشی گشتی و استخباراتی عەسکەری و (مخابراتی عامه) و ڕێکخراوی بەعس لەشمال.

٢- دووەم خاڵ تایبەتە بەشەخسی خۆی، دوا بڕیار و پەیوەندی بەخۆیەوەیەتی شتێکی نهێنی‌یە لەگەڵ خۆی دەژێت کەس نازانێت ؟

لەسەر داواکردنی (صدام تکریتی) ئەنجوومەنی وەزیران کۆدەبێتەوە ئەو راپۆرتە درۆیانەی کەلەسەدا یەکی ڕاستە باقیەکەی‌هەمووی درۆیە کەتەواو بوو لەخوێندنەوەی صدام قسە دەکات.

جەلال ومسعود بەیارمەتی ئەمەریکاو ئینگلیز توانیویانە جێگەی خۆیان بکەنەوە لەشمال، هەرکاتێك یارمەتی دەرەوەیان نەما بەچەند سەعاتێك شمال بەجێ دەهێڵن هەموو کورد داوامان لێدەکات کەبگەڕێنەوە.

## بۆحاکمی بەغداد صدام تکریتی:

لەوڕۆژەی کەهاتوویتە سەر حوکم لە ٣٠ ی ئابی ١٩٦٨ بەهیچ جۆرێك نەتویستووە کێشەی کورد بەئاشتی جێبەجێبکەیت، وە ١١ی ئازاری ١٩٧٠ ش باروبلۆخی ئەو ڕۆژە ئەوەی پێکردی ئەویش کاتی بوو.

هەتاكو تۆ لە ژیان دا مابیت بارودۆخی وولات بەم شێوەیە دەبێت، بەگشتی گەلی عێراق چاوەڕوانی گۆڕانە، ئەویش نەمانی تۆیە، (ان شاء الله) دوای بڕیارەکەی کۆنگرێسی ئەمەریکی دای بۆ لابردنی تۆ وە سەرۆکی کۆماری ئەمەریکا بیل کلنتۆن چەند جار بیژتی پێش کۆتایی و نەمانی پەیمانی ... دەبێت (صدام تکریتی) نەمێنێت.

بەگشتی گەلی عێراقی چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد لەشەخسی تۆ (یان ڕا بکەیت یان استقاله بدەیت یان خۆت بکوژیت ) یان داوای غفران بکەیت لەگەلی عێراقی بەتایبەتی کوردو شیعە، وەجمهوری اسلامی کەئەو شەڕەت بەزۆر بەسەردا سەپاندن، داگیرکردنی کوێت، ئەبوو هەنگاوێك بنێیت بۆ مانەوەی خۆت بچیتە سەر تەلەفزیۆن بەیانێك بڵاو بکەیتەوە کەبڕیارمان دا داوای لێبووردن بکەیت لەگەلی کورد بەتایبەتی ڕووداوی کیمیا بارانی هەڵەبجە وە ١٨٢ هەزار زیندەبەچاڵ و کوشتنی ٨٢٠٠ بارزانی کە ٣٦ کەسیان لەبنەماڵەی شێخەکانی بارزانی بوون، دان بنێیت بەدیموکراتیەت هەڵبژاردنێکی ئازادانە فرە حزبی، کێشەی کوردو شیعەی باشوور کەمایەتی یەکانی تر، ئەوانەی تعریب کراون بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان دان بەفیدراڵیەت بنێیت بۆ گەلی کورد، (کەرکوك وخانەقین وسنجار) بچێتە سەر حوکمی فیدراڵیەت.

## • صدام (مراهنە) گرەو لەسەر ئەو دووخاڵە دەکات:

ئەوە ڕاپۆرتێکی وەهمی یە هەمووی درۆو دەلەسەیە، هەرچەندە لەشوێنێکی تردا نووسیومە، بەڵام لێرە بەدوورو درێژی باسی دەکەم:

لەدیوانی سەرۆکایەتی کۆماری عێراق بۆ صدام حسین، ئەم ڕاپۆرتەتان ئاراستە دەکەم کەلەڕێکخراوی بەعس و ئاسایشی گشتی وە استخباراتی عەسکەری وە مخابراتی عامە بەکورتی دەیخەینە بەرچاوتان دەربارەی (شمالی عێراقی حبیب)، دوو حزب ئیدارەی دەکات، ناکۆکی لەنێوانیان بەردەوامە دوور نی یە لەم نزیکانە شەڕ بێتەوە لەنێوانیان دا (گرانی، بێ ئیشی، دزی، پیاوکوشتن، سووتەمەنی گرانە، خەڵك بەتەواوەتی بێ تاقەتە

لێتـان، هـەموو كـــورد داوامــان لێدەكـات كەبـەزووترین كـات سـتوپا خۆشەویستەكەمان بگەڕێنەوە، خەڵكی شمال ئیتر هیچی كە كۆمەكی ئەو حزبانە نەكات، ئێستاكە كەسیان لەگەڵ دا نەماوە، و وەزارەتـی دەرەوە هەڵوێستی توركیاو سوریاو ئێرانی ڕوون كردەوە بەتایبەتی توركیا ڕازی نییە بەفیدراڵیـەت و یـەك حكومـەت دابمـەزرێنن، وەئەمـەش دیدارەكانیانـە بەئاشكراو بەنهێنی، جۆری چەكیان، ژمارەیـان، ئـەو ڕێكخراوە بیانییانـەی كەلەوێ كاردەكەن.

- لەصدامەوە بۆ ڕێكخراوی بەعس و ئاسایشی گشتی و استخباراتی عەسكەری مخابراتی عامە، فەرمان دەردەكات هەوڵ بدەن دووبەرەكی زیاتر بێنەوە، شەڕ دروست بكەنەوە، بەسەخاوەت پارە دابەش بكەن بۆ ئەو خەڵكانەی كەلەكۆنەوە لەدڵی ئێمەدان ناوە نـاوە ڕێگەی سلێمانی و موصل وكەركوك دابخەن، ئەزمەی نەوت و بەنزین وگاز دروست بكەن.

## تێبینی:

ئەمە لەكتێبەكەمدا دووبارەی دەكەمەوە، چونكی دڵنیام لەسەر ئەمە دەژی و ڕۆژگـار دەباتـە سـەر، مراهەنـەی لەسـەر دەكـات، وتم خـاڵی یەكـەم كەلەسەرەوە نووسیومانە، ئـەو بـاوەڕی بـەو درۆیانـە هەیـە، دووهـەم، تایبەتییە بەشەخسی خۆی بەپێی ڕۆژانە یان مانگانە پیلان دادەنێت، ئەوانەی كەلەخوار خۆشیەوەن فرمان جێبەجێدەكەن، ڕەنگە دوو كوڕەكەی لە ٦٠٪ ی بزانن ئەوانەی كە بۆ نموونە طارق عزیز لە ١٠٪ی دەزانن دوای نەمانی ڕەنگە ئەو نهێنییانە بڵاوبیبێتەوە، یان ڕەنگە زووتر كاتێ نەمانی حوكمی بێت ئەو نهێنییانە بەدەست گەلی عێراق بكەوێت. لەچوارچێوەی حوكمی خۆی كەس بۆی نییە ڕاپۆرتێكی بۆ بنێرێت تێیدا بەدوورو درێژی پێتیشان بدات ئەمە ڕەئی منە بەم شێوەیە سیاسەتمان بەردەوام بێت ڕەنگە هەموو شتێك بگۆڕین، هەرچ كەسێك پێشنیازێكی پێتیشان بدات مانای نەمانێتی.

## بەڕێز صدام تكريتى پێشكەشە:

پێشەكى داواى لێبووردنت لێدەكەم (من كين وحقد)م لەتۆ نىيە چونكە قەرزارى ئێوەم كاتێك خاوەن دەسەڵات و ناوو سەيارەو پارە بووم و توانيومە هەرچى پووم تێبكات دەستى يارمەتى بۆ درێژ بكەم، بەنهێنى خزمەتى كەلەكەم بكەم، تا توانيومە فێڵم لێكردوويت، لەگەڵ ئەوەشدا بەفرمانى شەخسى تۆ لەسێدارە نەدرام بەرت دام، هەتاكو ئەو ڕۆژەى لەپەناى ئێوە بووم پێويستم بەيارمەتى كەس نەبوو، لەهيچ ڕوويەكەوە ماڵم بەرنەدەكەوت، بەڵام لەو ڕۆژەى خيانەتم لەتۆ كرد وام زانى بارودۆخم لەهەموو ڕوويەكەوە باشتر ئەبێت بەداخەوە كەس هاتووچۆم ناكات، ناتوانم چاوپێكەوتن لەگەڵ كاربەدەستان بكەم، چونكى ئەزانن دەستم ناڕوات ويستم بازيانى كوڕم بەشۆفێر دابمەزرێنم، بەدۆلار، هەرچەندە واسيتەكەم زۆر زۆر گەورە بوو وتيان لەوە گەورەتر هەيە، بەڵام دەسى نايگاتى.

بەڕێز صدام لەگەڵ ئەوەشدا تاوانبارى سەرەكى تۆيت، چونكە ڕووداوەكانى عێراق هەمووى دەگەڕێتەوە بۆ شەخسى تۆ، بەتايبەتى ڕێكەوتنى جزائر، انفال، تعريب، تبعيس، هێرش بردنە سەر ئێران، گرتنى كوێت، ئيمڕۆكە گەلى عێراق ڕۆژگارێكى ڕەشى بەسەردا تێ دەپەڕێت، تەنها خۆت و منداڵت وە. . بەشەكانى كە من لەچاو خەڵكێكى تردا زۆر باشم. ئەم كتێبەم بەكوردىيە ويستم خوێندەوارى كورد باشتر لەنزيكەوە ماهيەتى بزانن، وەرى دەگێڕمەوە سەر زمانى عەرەبى و انكليزى، بێبەشت ناكەم بڵاو دەبێتەوە، پارەى چاپ كردنى قەرزە كەس يارمەتى نەدام، چونكە كێشەى كورد بۆتە حزبايەتى، باش ئەزانم كەكتێبەكەم هاتە كتێبخانە، دەست بەجێ دەستت دەكەوێت، يەكسەر بڕيارى كوشتنم دەردەكەيت، وە پريشكى بەر ڕوويارو بازيان و ڕەوەزيش دەكەوێت.هەرچى تۆ ويستووتە چ لەناوەوەو چ لەدەرەوە بەفرمانى تۆ تيرۆر كراوە خەڵكێك هەيە لە سەدا سەد فرمانى تۆ يەكسەر ئەنجام بدات، حەمەى عيسى كەلارى دواى نەمانى شا جێگەى پێ لەق بوو، لەئێران ويستى بگەڕێتەوە بۆ عێراق، داواتان لێكرد كەئەو فريشتەيە ئەو پياوە نيشتمان پەروەرە (عبدالرحمن قازى) تيرۆر بكات، بەئاگادارى تۆ ئەم كارە ئەنجام درا، بەحوسەينى حەمەى سوورە

ئاغام وت ڕووبەڕوو بۆچی (فاروقی مام عەلیت) تیرۆر کرد، خۆ هیچ ئازارو ئەشکەنجەیەکی نەداویت.

حەمەی عیسی: ئێستا لەبەغداد دادەنیشێ، کابرایەکە دەورێکی خراپەی هەیە بەردەوامە لەئازارو ئەشکەنجەی خەڵك تیرۆرکردنی

## نامەیەکی کراوە بۆ صدام حسین:

ئێستاکە من ڕاوەستاوم بەرامبەرت بۆت ڕوون دەکەمەوە، ئەڵێم ئەمەیە پیلان و نهێنییەکانی کەلەدڵتدایە، با من پێت بڵێم:

١- بەهیچ جۆرێك ئەو بیروباوەڕەت لەمێشك دا نییە کە داوای لێبووردن (غفران) بکەیت لەگەڵ عێراقی.

٢- کەرکوك وخانەقین وسنجار، تعریب دەکەیت بەیەکجاری، بۆت سەر بگرێت ڕەنگە قەبرسانەکانیش تەخت بکەیت.

٣- چاوەڕوانی ئەو هەلەی کەی ئەو کاتە دێت کەئەمەریکاو ئینگلیز کشانەوە لەپاسەوان کردنی کورد (خەتی ٣٦) دەست بەجێ کوردستانی باشوور داگیر دەکەیت، بەدەستێکی ئاسن بەکوردییەکەی شەلم کوێرم ناپارێزم کورد زیندەبەچاڵ دەکەیت.

- **بۆ سکرتێری یەکێتی نیشتمانی کوردستان (مام جەلال) پێشکەشە:**
- **بۆ سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان کاك (مەسعود بارزانی)**

پێشکەشە:

سڵاوێکی گەرمی برایانە..

هیوادارم سەرکەوتوو بن و زاڵ بن بەسەر هەموو ئەو تەنگوچەڵەمانەی کەلەئارادایە، برایانی بەڕێز کاك (مسعود بارزانی) و (مام جەلال).

کتێبێکم بەناونیشانی چیم دیت و چیم بەسەرهات، کە بەرگەکەی نەخشەی کوردستانە، کورد دوژمنی خۆت بناسە، وا لەکتێبخانەکان بڵاوم کردۆتەوە نوسخەیەکم ئاراستەی ئێوەی بەڕێز کرد، کەبەگەورەیی خۆتان بم بەخشن لەهەموو کەموکوڕییەکەم ببوورن.

برایانی دڵسۆز (مام جەلال) و کاک مسعود، بێشك ئەوەی ئێوەی دەیزانن رەنگە من لە ١٪ی بزانم، بەلام لەگەڵئەوەشدا یەکبوونتان بەیەکەوە کاروباری وولات بینەن بەرێوە ئەوە ئامانجی هەموو کوردێکی نیشتمان پەروەرە لە هەر چوار پارچەکەی کوردستان، دڵنیام لەماوەیەکی کەم دا ئەم گۆرانکاریانە رووده‌دات:

١- گەلی کورد وەکو راپەرینەکەی ١٩٩١ یەك دەگرێتەوە، و بەگیانێکی کوردایەتی دێنەوە مەیدان.

٢- دەوڵەتە ئیقلیمیەکان دەکەونەوە جموجوڵ، ناچار دەبن بەپیرتانەوە بێن، رێزتان لێدەگرن.

٣- ئەو ناوچانەی کورد کە لەژێر سێبەری حوکمی صدام دایە، کەخانەقین و کەرکوك وسنجارە ئەگەشێتەوە متمانە پەیدا دەکەن کە رزگاریان دەکەن.

٤- ئاسایش و جێگیربوون لەئێستاکە زیاتر بەرقەرار دەبێت.

٥- بارودۆخی ئابووری لەکوردستانی باشوور ئەتوانن بیگۆرن (کیانی ئابووری) دروست بکەن.

٦- دوژمنانی کورد هیچی تر جێگەیان نابێتەوە دەست بخەنە ناو کوردستانی باشوور.

ئیتر بۆ پێشەوە

هەر سەرکەوتوو بن.

برای دڵسۆزو بچوکتان

رەفیق پشدەری

بلاوكرایەوە لەجیاتی ئەوەی خۆی بکوژێت یان ئیستقالە بکات بەشی زۆری خەڵك ئەم دوو ڕێگەیەی بۆ دانابوو بەڵام بێ شەرمانە ئیمزای تەسلیم بوونی کرد.

سەرۆکی لیبیا (معمر القذافی ) لەلێدوانێکی دا ووتی: صدام ژەهرت بخواردایە باشتر بوو لەوەی تەسلیم بوونت بکردایە.

## سەرۆکی کۆمار و ئیش وکاری:

لەهەموو جیهان بەم شێوەیە سەرۆکی کۆمار هەڵئەسەنگێنێت:

١- ئەبێت هەموو پێداویستیەکانی شەخسی هەبێت، لەسەر هەموو مرۆڤێکی وولاتەکە جوانترین و باشترین کۆشك و ناو ماڵ و سەیارەو .... لەسەدا سەد ١٠٠٪.

٢- چونکی مەسئولە بەرامبەر خودای مەزن و ڕوویەڕووی گەلەکەی بەجۆرێك ئەوەندە مەزنە لەدوای خواوەندی گەورە ئەو ڕابەرە بەچاوی باوك سەرنج ئەدرێت.

هەموو پێویستیەکانی گەلی عێراقی ئەبێت ١٠٠٪ بۆی ئەنجام بدات، ئەمنو استقرار، ژیانی ڕۆژانەی، ژیانی ئابووری، ڕێگادان بەخوێندن بەخۆڕایی، خزمەتگوزاری بزیشکی .

- فەرمانەکانی سەرشانی گەلیش پێویستە بەپێی یاسا کەبۆی دانراوە لە ١٠٠٪ هەمووی جێبەجێ بکات، بەبێ‌دواکەوتن، مرۆڤ بۆی هەیە ج بەنووسین یان بەقسە هەموو سلبیاتی حکومەت بخاتە بەرچاو ج لەڕێگای ڕۆژنامەو گۆڤار ڕەئی دەربڕێت لەسنووری یاسا.
- دانیشتوانی عێراق لە ٨٠٪ بارووبۆخی ئێستاکە وای لێ کردن لەسیاسەت بدوێت و قسە بکات وە بۆچوونی خۆی بەزەقی ئاشکرا بکات، لەسەر ڕەوشتوو کردەوەو بۆچوونت هەموو سەعاتێك چەند ڕۆژنامەو ئیستگەیەك لەهەموو جیهان دا ووتارێك بلاوئەکەنەوە لەسەر شەخسی صدام تکریتی باسی سلبیاتی تۆ ئەکەن.

ڕۆژانە هەموو دانیشتوانی گەلی عێراق ئەبێت لەهەموو بۆچوونێکی باسی سلبیاتی تۆ بکات، هەموو کەموکورتیەکی تایبەتی هەبێت بەڕێزتان بەتاوانبار

ئەزانێت، هەموو ئەو بارودۆخەی کەبەسەر عێراق دا هات گـەلی عێراق ڕۆژانـە تووشی ئازارو ئەشکەنجە دەبێت ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ شەخسی تۆ.

کەباسی یەکێك لەو کەموکوڕیانەی خوارەوە ئەکات کەبـەرەنگاری هـاتووە ئەڵێت ئاخ صدام تکریتی بۆ نموونە:

ئاو، کارەبا، بەنزین، نەوت، خواردن، بێحورمەت، نەخۆشی، تەندروستی، بێتیشی، خوێندن، گرانی، بێکاسبی، گرتـن، تەنگوچەڵەمـەی خـێزانی، ئـەم هەموو گرتـن و تـاڵان کـردن و دزی و بـەرتیل خواردنـە، مشـکلەی خـانوو ... هتد.

- تاوانبارت ئەکەن ئەڵێن جاسوسی ئەمەریکایە.
- بەفەرمانی ئەمەریکا بوو شەڕی ئێرانت کرد.
- کوێت، ئەمەریکا ئیشارەتی بۆکردیت بۆ گرتنی.
- دەوڵەتەکانی خلیج بەهۆی گرتنی کوێـت بـاری ئابووریـان بـەجۆرێك قورس بووە کەوتنە ژێر قەرزداری، بەجۆرێکی ئەوەندە دڕندانە جووڵایـەوە لەگـەڵیان تـاوێژێن ئـەگینا هاواریـان ئـەکرد بـەدەنگێکی بـەرز لەڕۆژنامـەو ئیستگەو تەلەفیزێن بەزەقی بڵاویان ئەکردەوە، ڕۆژانـە ئـەیان ووت هـەموو ئـەو بارودۆخـــەی ڕوودەدات تەنـــها صـــدام تکریتی‌یـــە، بەنـــەمانی ئاشتی‌وشادی‌یە لەجیهان دا.
- سـەروەت وسـامانەکەت دووجـار بەرامبـەر شـای ئێرانـە کەلـەدوای جێماوە، هەر بەردەوامیت تاکو زیاتر بێت.
- هـەر خـەریکی کۆشـك کردنـی لـەکاتێکدا کەسـەدەها ملیـۆن دۆلار سەرف ئەکەیت.
- سەربازو ئەفسەر بەکەلوپەلی عەسکەری‌یەوە سواڵ ئەکات.
- بەشـێکی زۆر لەدانیشـتوانی عـێراق ڕووی کردۆتـە دەرەوەی وولات وەکـو ڕۆشـنبیر و دکتـۆر، پرۆفیسـۆر، ماجسـتێر، ئـەندازیار، مامۆسـتا، قوتابی، ئەفسەر، کاسب، جوتیار، کرێکار، بەردەوام خەڵك لەڕۆیشتندایە وە ئەوانەی لەسنووری تورکیاوە ئەڕۆن باش ئەزانن کوشتن یان گرتن ئینجا سنووریداش چاوەڕوانیانە.
- ڕۆژانە بەردەوامیت لەوێنەگرتن و بـەناچاری هـەموو مرۆڤێك وێنـەی تۆی لە ماڵەوە هەڵواسیوە، بۆ زانیاریت کە ژنی دووەمی نیرۆن تەنـها یـەك

ڕەسمی هەیە ئەویش لەمۆزەخانەیەکی فەرەنسیدا دانراوە، لەهەموو ئیتالیا ڕەسمی نییە، تۆش دوای ئەمانت ان شاو الله وێنەت نامێنێت لەعێراق بەتایبەتی لەکوردستانی باشوور.

- قسەکانی کەکردوتە کەهاتم عێراقێکی دواکەوتوو بوو لەهەموو بارێکەوە، کاتێك کەڕۆیشتم ئەبێت بەوێرانی بەجێی بهێڵم.
- کوردیش دووعایەکی هەیە ئەڵێت خوامان هەیە کەدەسەڵاتی نەڕۆیشت ئەم دوعایە ئەکات.

## عبدالسلام عارف:

ئەفسەرە کوردەکان کەلەکۆلێجی عەسکەری بوون ئەگێڕنەوە ئێواران کاتی پشوودان هەموومان کۆڕێکمان ئەبەست لەنێوان خۆمان دا گفتوگۆمان ئەکرد لەگەڵ برا عەرەبەکان قسەوگفتوگۆو هاتوچۆ کردنمان یەکجار پتەوو خۆش بوو تەنها عبدالسلام عارف نەبێت زۆر خۆی دوور دەخستەوە لەئێمە هەڵوێستی یەجگار نارێك وپێك بوو.

کاتێك لەڕووداوی ١٤ی تەمموز ١٩٥٨ ناوی هات بەم شێوەیە کەدیمان حوکمی گرتە دەست.

ڕۆشنبیرانی کورد بەسەدەها کتێب بنووسن لەسەر ئەوەی کردویەتی بەرامبەر بە گەلیکورد تەواو نابێت لەکوشتن و دێ سووتاندن و ماڵ وێران کردن و لەسێدارەدان و گرتن و زەجر کردن (سووکایەتی پیکردن).

هەڵوێستی ڕوون و ئاشکرا بوو بەزەقی بێشەرمانە ئەیووت لەعێراق هەرچی هۆزێکی کورد هەیە ڕەسەنی ئەگەڕێتەوە بۆ عەرەب، ووشەیان گۆڕاوە چونکی لەشاخ ژیاوون بەقسەی کوردی ئەدوێن، ئەیووت لەعێراق کێشەیەك نییە کەپیی بڵێین کێشەی کورد.

لەساڵی ١٩٦٥لەسەردانی بۆ پارێزگای بەسرە بەفرۆکە چوویۆ زوییر هیلکۆپتەرەکە کەوتە خوارەوە هەموویان سووتان بەهۆی سەعاتەکەیدەستی تەرمەکەیان ناسیەوە(بەدەسیسەی بەعس ئەم کارە تیرۆریستە ئەنجام درا).

● برایەکی ئەرمەنی خاوەن (صالون حلاقە ئاڤۆ) بەغداد -منصور گیرا دوای بەردانی هاتە لام سوپاسی کردم بەیەکەوە چووینە لای بەڕێوەبەری ئاسایشی کەرخ پرسیارم لێکرد ئایا ئەمە تاوانی چییە ئاگاداری بکەن تا خۆی باش بکات. جارێکی کە تووشی ئازار ئەشکەنجە نەبێت، وە منیش تووشی زەحمەت نەکات، بەڕێوەبەری ئاسایشی کەرخ [illegible] پێی ڕاگەیاندم ئەم کابرا ئەرمەنیە گەورەترین تاوانی کردووە هەقی کووشتنە، ابو بازیان چۆن تۆ یارمەتی ئەم جۆرە مرۆڤانە ئەدەیت، ئایا نەزانیت ام احمد خێزانی (عبدالسلام عارف) چۆتە لای چۆن تۆ بەمە ڕازی ئەبیت ژنی سەرۆکی کۆماری کۆن کردەوەی وەهای لەگەڵ بکرێت.

وتم: لەم ڕۆژانە لای صالح مهدی عماش بووم (وەزیری ناوخۆ) تەلەفۆنیان بۆ کرد کەڕێگابدات ام احمد سەفەر بکات بۆ قاهیرە، عماش ووتی: من ڕێگا نادەم ژنی سەرۆکی کۆماریکۆن بچێتە قاهیرە ئابڕوومان بەرێت لەوێ بەکەیفی خۆی ڕابوێرێت، ام احمد بۆتە ... دیارە.

کاتێک ئاگاداری ئەوم کرد کەتۆ گیراویت کەدۆستایەتیت هەیە لەگەڵ ام احمد پێکەنی بڕیاری دا ئیتر وازیهێنێت لەئیشەکەی کەنەچێتەوە محەلەکەی، بڕوام کرد کەڕاست نییە هەردەچیتە لای.

● ڕێك کەوتنی جەزائیر: -

(بۆمدین) سەرۆکی کۆماری جزائر بەشێوەیەك گیانی لەدەست دا دووجار ویستی خۆی انتحار بکات ئەوەندە ڕەزیل بوو لەسەر جێگا.

شاه محمد رچا پهلوی:

لەهەموو جیهان جێگای نەبۆوە پاڵپشتەکەی کەئەمەریکا بوو ڕێگای پێنەدا تاکو پشوو بدات.

دونیای لێهاتەوە یەك بەنەخۆشی زۆر بەدجە گیانی لەدەست دا.

● صدام تکریتی:

بزانین چی بەسەر دێت.

- **(احمد حسن بكر):**

رابردوویەکی تاریك و ڕەشی هەیە بەرامبەر بەگەلی کورد، زاڵم، پیاوکوژ، درۆزن، لەکاتێ کەسەرۆکی وەزیر و سەرۆکی کۆمار بوو بەشداری لەهەموو بڕیاردانوو پیلانێك بۆ لەناوبردنی گەلی کورد، دەستی باڵای هەبوو.
احمد وصدام، بڕیاری کوشتنی بارزانی ئەدەن، سێقۆڵی بۆ ئەم مەبەستە، احمدو صدام وناظم کزار بەشدارن بۆ پیلان دانان بەلام ناقم بۆ جێبەجێکردنی لەگەڵ مەلا ئاینەکان کۆدەبێتەوە، شوکر بۆ خوای مەزن بارزانی سەلامەت بوو.
احمد وصدام (تعریب وتبعیس و وانفال) یان (کورد بەعەرەب کردن و کورد کردن بەبەعسی و کوردیان بەکافردانا بۆ لەناوبردنی ) هەرچییان پێ کرا کردیان بۆ جێبەجێکردنی. احمد وصدام ویستیان ٤ ملیۆن کورد لەعێراقەوە دوورخەنەوە بۆ دەرەوەی وڵات بەلام دڵسۆزو پاڵپشتی هەمیشەی کورد جەنابی سەرۆکی کۆماری لیبیا معمر القزافی و سەرۆکی کۆماری سوریا ڕێگایان پێنەدا ئەمە جێبەجێ بێت لەخودا بەزیاد بێت سەری نەگرت، ئەمە ئەبووە گرژییەك لەنێوان نەتەوایەتی کوردو عەرەب هەتاهەتایە.

- برادەرێکی دڵسۆز و شیرینم (فلان..) ناتوانم ناوی بهێنم چونکی لەژیان دا ماوە پیاوێکی ناسراوە با تووشی ئازارو ئەشکەنجە نەبێت.

لەساڵی ١٩٩٨ پرسیارم لێکرد ئایا دۆستایەتی و هاتوچۆکردنتان هەر وەك خۆیماوە لەگەڵ احمدحسن بکر تاکو ڕۆژی مردنی.
(فلان..) ووتی: لەو ڕۆژەی لەسێی سەرەتایی بووم یەکترمان ناسی لەهەموو ژیانمان بە یەکەوە بوو ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دۆستایەتیمان بەهێزتر دەبوو.
وتم: ئایا ئەمە ڕاست بوو یان شانۆگەریی بوو (احمد حسن بکر) دەستی کشاندەوە لەسەرۆکی کۆماری.
فلان: ووتی ابۆ بازیان ئەمە صدام بەسەری چەسپاند زۆرە ملێبوو دووساڵ بوو لەمخابرات تەنها وێنەی صدام بەدیوارەوە بوو، صدام حوکمی گرتبووە دەست ماوەی دوو ساڵ پێش لابردنی (احمد حسن بکر).

پرسیارم لێکرد ئایا چۆن مرد؟

فلان ووتی: لەو خانووەی لێی بوو پاسەوانی عەسکەری هەبوو دوو کیـژی جوانی فللندی خزمەتیان دەکـرد کەشـتیان ئـەهێنا لەسـەر ئـەژنۆ ئەرێیشـتن پشتاو پشت ئەگەڕانەوە، مانگی ٤–٥ جار ئەچوومە لای پێش مردنـی بـە ٢٥ ڕۆژ چوومە لای پاسەوانەکانی ئەما بوون دەرگا لەسەر پشت بوو وەن ەرگاێ ژووریشی کرابۆوە دوای سلاو پێم ووت احمد وا ئـەمرییت بۆچی بەسـەرهاتی خۆت نانووسیت منیش ڕۆژێك نا ڕۆژێك دێم ئەی بەم، احمد ووتـی نـاتوانم بـۆ تۆش ئەمانە هەر بەردەوامە لەقسەکردن، پێش مردنی بـەچوار ڕۆژ چوومـەوە لای پاسەوانەکانی عەسکەری نەماوون و کیژەکانیش نـەماوون دوایـی لەسـەر سەری ڕاوەستام کاتێك سەری هەڵبڕی ووتی (فلان) لەکەیەوە لێرەیت.

وتم: ١٦ دەقیقەیە ڕاوەستاووم لەسەر سەرت قورئان ئـەخوێنی بـەجۆرێك لاواز بوویت بەرەو مردن ئەڕۆیت چیتە قسەم بۆ بکە.

احمد ووتی: ماوەی یەك مانگ نانم پێناخورێت، بەهیچ جۆرێك ئیشـتیهام نەماوە وایان لێکردم کەبەم جۆرە بمرم.

● فلان ووتی: ڕۆژێك خیرالله طلفاح هاتـەلام ئایا ئـەزانی خـەڵك بـەچ جۆرێك بەخراپی باسی برادەرەکەت ئەکەن (احمد حسن بکر).

فلان: وەڵامی ئەداتەوە خەڵك ئەڵێن نەعلەت لە(احمد حسن بکر).

خیر الله گلفاح: ئەڵێت ١٠٠ سەد هەزار جار نەعلەت لە(احمد حسن بکر).

فلان ئەڵێت: تۆ بۆچی وائەڵێیت خۆ ئێوە بەهۆی احمدەوە گەیشتنە ئـەم پلەو پایە.

خیرالله گلفاح ئەڵێت: دوو بەدوو لەگەڵ ابو عـدی قسـەمان ئەکرد لـەکاتی گفتوگۆ کردن باسی باروبۆخی سیاسی ئەم ڕۆژەم کرد کەبنەماڵەی ئێمە بەچ جۆرێك دوژمنمـان هەیـە لـەدەرەوەو نـاوەوە بەتایبـەتی شەخسـی تـۆ مـن وابەباشی ئەزانم کەیەکێك لەخزمە نزیکەکانی خۆت جێنشیی تۆ بێت کەخودا نەخواسـتە تووشـی شـتێك هـاتیت یەکسـەر بێتـە سـەر حوکـم تـاکو ئـەم حکومەتەمان هەر بەردەوام بێت.

صدام ئەڵێت: خاڵە بەڕاستی باشت بیرکردۆتەوە منیش لـەم بـارەوە ئـەم پێشنیازەت ئەخەمـە بـەردەم چ مرۆڤێك پەسـەند ئەکـەی بـۆ حوکـم گرتنـە دەست.

**خیراللە طلفاح:**

کەس هەیە لەکوڕی خاڵت (عدنان) بەم جۆرە دڵسۆزو نزیکت بێت لەهەموو ڕوویەکەوە جێباوەڕتە و هی هەموو خێزانەکەیە، دوای سێ ڕۆژ بەسەر ووتەکەی خاڵی عدنان ی کووشت لەساڵی ١٩٨٩.

فلان ئەڵێت: تۆ ئەمەش ئەزانیت کەصدام لەپیلانێك بەفڕۆکە عدنانی کوشت.

- صدام لەبەرچاوی خۆی بەفرمانی خۆی حسین کاملی زاوای کوشت لەساڵی ١٩٩٧.
- عدی زامدار کرا، نیوە مرۆڤە، هەتاکو ماوە هەر بەشکستی ڕۆژگار ئەباتە سەر.

## راپەڕین (انتفاضة) ی بەهاری ١٩٩١:

ئاواتی هەموو کوردێکی نیشتمان پەروەر و بەشەرەف ئەوەیە کە ڕۆژێ لەڕۆژان حکومەتێکی کوردی سەربەخۆی هەبێ وەکو گەلانی جیهان وەلەگەڵ دراوسێکانی بەئاشتی مامەڵە بکەن (عەرەب، تورك، فارس) ڕێز لێك بنێن.

• پیلان و دەسیسەو نەخشەی سیاسەتی ئیستعماری ئینگلیزی یەکەم هەنگاویان ئەوەبوو حکومەتی مەلیك محمودیان لەناوبرد.

لەهەمان کات دا سیاسەتە چەوتەکەیان بەزۆر بەسەر گەلی کوردیان چەسپاند کوردستانیان بەستەوە بەعەرەبی عێراق ئەوە بوو حکومەتی عێراقیان دامەزراند.

بەبێ ئەوەی لەگەڵ کورد گفتوگۆ و لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم کێشەیە بکەن لەکاتێکدا گەلی کورد بەتێکرایی دژ بەم هەڵوێستە بوون ومێژووش شاهیدە.

ئەبوو لەچوارچێوەی عێراقێکی سەربەخۆ کێشەی کورد جێبەجێ بکرێت.

ئاشکراو ڕوونە لەیەکەم ڕۆژی دانانی حکومەتی عێراق هەرچی هاتۆتە سەر حوکم هەمووی بەکودەتای سەربازی هاتوون یان وەکو مەلیك فیصل ئیستعماری ئینگلیزی دای مەزراندن بەو پلەیە هەموو سەرۆکی حکومەتەکان بەهەموو توانایاکیانەوە نەخشەی سیاسی و عەسکەرییان ئەوەبوو کەنەهێڵن ڕۆژێك لەڕۆژان بەخۆشی و شادی و سەربەستی وەکو گەلی عەرەبی مەزهەب سنی ڕۆژگار بباتە سەر سەرانسەر هەر بەچاوی مواطنی دووهەم یان سێهەم تەماشا کراوە و مامەڵەیان لەگەڵ کردووە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەموو پیلان و نەخشەی سیاسی عەسکەرییان ئەوە بووە لەزەمانی عەهدی پاشایی تاوەکو ئەم مێژووە لەناوبردنی کورد بووە بەتایبەتی حکومەتی عبدالسلام عارف ئینجا (احمد حسن بکر) لەسەرو هەموویانەوە صدام تکریتی.

• لەساڵی ١٩٥٩ بابەکر اغای گەورە کەسەرۆکی هۆزی پشدەرە ئەمەی گێڕایەوە منیش ئامادەی ئەو دانیشتنە بووم لەکودەتاکەی رشید عالی گەیلانی ساڵی ١٩٤١ دوای ٤٠ ڕۆژ بەسەر حکومەتەکەی ئەوەبوو تێك چوو وە هەرەسی هێنا ڕای کرد بۆ ئەڵمانیا.

باڵوێزی ئینگلیزی تازە هاتە عێراق لەوکاتەی باڵیۆزی کۆنی ئینگلیزی لەفڕۆکەخانەی بەغداد پیاوە گەورەکانی عێراق ئامادەبوو، باڵیۆزی کۆن داوا لەباڵیۆزی تازە دەکات کەیەکەیەکە لەگەڵ ئەو خەڵکانەی کەهاتوون خواحافیزیان لێ بخوازێت لەهەمان کاتیش یەکە یەکە بەباڵیۆزی تازە بناسێت کاتێك کەدەگەنە سەر (جمال بابان) کەناسراوە بەباوکی شوان باڵیۆزی کۆن ڕوو دەکاتە جمال بابان وە قسە لەگەڵ باڵیۆزی تازەدەکات کاتێك کەمن چل وئەوەندە ڕۆژە دەست بەسەربووم ئەوەی کەزوو زوو سەری دەدام وە بەردەوام خواردنی خۆشی کوردی بۆ ئەهێنام ئەم زاتە مەزنە بوو لەبنەماڵەیەکی کوردی ناسراو کەحکومەتی کوردیان هەبووە بەناوی حکومەتی بابان لەسلێمانی وەبۆ ئاگاداریت ئەم زاتە مەزنە دۆستێکی تاجی بەریتانییە ڕاسپاردە هەیە کەپشتگیری بکەین.

باڵیۆزی تازە دەڵێت خۆشحاڵم بەناسینت، حەز دەکەم ئەگەر کارێکت هەیە بۆت ئەنجام بدەم.

(جمال بابان) دەست هەڵدەگوشێ و ڕوودەکاتە هەردووکیان باڵیۆزی کۆن و تازە ئەڵێت فیصل تان هێنا کردتان بەمەلیك بەسەر ئێمەدا دوای ئەم هەموو خزمەتەی عەرەبتان کرد لەعێراق حکومەتێکی عێراقیتان بۆ دامەزراندن ئێمەتان بەزۆر بەستەوە بەعەرەبی عێراق لەکاتێکدا ئێمە کەکوردین ئینجا کودەتایان کرد بەسەرتاندا لەکاتێکدا ئێوە لەجەنگدان دژ بە هیتلر، باشە بۆ بیرێك لەکێشەی کورد ناکەنەوە داوام لەتاجی بەریتانی ئەوەیە کەشتێکیش بۆ ئێمە بکەن کێشەی کورد جێبەجێبکەن.

باڵیۆزەکان یەك وەڵامیان دەبێت ئەویش ئەوەیە ئێوە لەجانتای دبلوماسی ئێمەدا کێشەی سیاسی کوردی تێدا نییە بەڵام حکومەتی تاجی بەریتانی داوای لەحکومەتی عێراق کردووە کەڕێگەی خوێندن و کاسبی و پلەیعەسکەری و پلەوپایەی فەرمانبەر بەم جۆرە بێت:

کورد بۆی هەیە لەپلەی عەسکەری بگاتە سەرۆکی ئەرکانی سوپا هەروەها لەخوێندن دا بۆی هەیە بگاتە هەر پلەیەکی کەبیەوێ لەفەرمانبەری دا بگاتە سەرۆکی وەزیران لەڕێگەیەکی کاسبییەوە دەوڵەمەندترین کەس ئەو بێت.

## تێبینی:

٤- له ٨٥٪ ڕاستیان کرد تەنها کاری سیاسیت نەکردایە بەرامبەر بەحوکمی مەلیکی بۆ نموونە لە (١٤)پارێزگار (محافظ) (١١)یان کورد بوون.

٥- سەرۆکی دادگای کەرکوك و پارێزگاری کەرکوك و مدیر شرگەی کەرکوك و بەڕێوەبەری شارەوانی کەرکوك و پۆلیسەکان و پاسەوانەکان هەموویان کورد بوون. فرقەی (٢)ی سەربازی لە ٩٠٪ سەربازەکان کورد بوون وەلە ٤٠٪ ی ئەفسەرەکان کورد بوون وە لەژمارەی ٤٢٠٠ کرێکار لە کۆمپانیای نەوت ٣٩٠٠ یان کورد بوون، دانیشتوانی شارەکە (٤)مالّی عەرەبی لێبوو کامێشیان بەخێو دەکرد وەهەندێك لەکاریەدەستەکان عەرەب بوون، شاری کەرکوك ٨٥٪ ی کورد بوون وە لە ١٥٪ ی تورکمان بوون.

٦- ئەگەر ئێستاکە سەرژمێری شاریکەرکوك بەتێکڕایی یەوە بکەین ئالەمەدا بۆت دەردەکەوێت وەدوای کودەتاکەی ١٩٥٨ چیان بەسەر کوردا هێنا.

● گۆڕستانی کەرکوك گەورەترین شاهدە بۆ مێژوو کەناتوانن دەستی لێبدەن و بیگوێزنەوە ئەویش ١٠٠٪ ی کوردە.

## صدام بەم خەیاڵە ڕۆژگاری دەبردە سەر:

تێکڕا کورد لەژێر فەرمانی بەعس ئەجووڵێتەوە هەمیشە شانازی پێوە ئەکرد بەمێژو ژمارەیەك ڕێکخراوی بەعس دوو ملیۆن کورد بەعسیيە وەچەکداری فرسانمان ژمارەیان زیاد لە ٢٠٠ هەزار چەکدارە، کەکورد پێیان دەڵێن جاش هەموو دانیشتوانی حوکمی زاتی ٩٩٪ لەگەڵ ئێمەن پاڵپشتی هەرە گەورەی بەعس ئیمرۆ کوردە ڕۆژنامەو گۆڤارو تەلەفزیۆن وای دەخستە بەرچاو کەکورد هەمووله‌دەوروپشتی سەرۆکیەکەیان صدام کۆبوونەتەوەتەنها دووژمنانی کورد و بەعس کەلەژێر فەرمانی دەرەوە دەجووڵێنەوە ئەوانیش ژمارەیان ئەوەندە کەمە بەپەنجەی دەست دەژمێرێن ئا بەم جۆرە بیری دەکردەوە.

## بەرەی کوردستانی:

بەم ناوە پیرۆزە کەوتنە جمووجۆڵ کردن پەیوەندییان بەزۆربەی زۆری هەموو دانیشتوانی کوردستان کرد بەراستی دەورێکی گەورەیان بوو بەتایبەتی ئەم دوو زل هێزە گەورەیەی کورد یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەسەرۆکیایەتی (مام جەلال) و پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکیایەتی بارزانی دەورێکی سەرەکییان هەبوو شان بەشانی ژن وپیاوو پیرو منداڵ ئەوەبوو لە ٩٧٪ ی کورد بەشداری ئەم راپەرینەی کرد هەموو کوردیەکی گرت بوو بەیەك هێز بەچەکی سووك و دار و گیانی خۆی هێرشی بردە سەر داگیرکەری کوردستانی پاشووی کە ٧٠ ساڵە بەزۆر بەستراوە بەعەرەبی عێراقەوە ئەو سەربازگایانەی لەیەکەم رۆژی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق لەبەر مەترسی کورد دروست کراوە وە لەحەفتاکانەوە روسیای ئاشتی خواز تازەترین قەلای دروست کرد بۆ بەعس.

لەماوەی یەك هەفتەدا سەد هەزار سەرباز بەهەموو چەکێکی قورس و سووك تەسلیم بوو لەقودسی کورد کەئەویش کەرکوکە سەرانسەری هەموو کوردستان ٩٥٪ ی پاك کرایەوە و رزگار بوو.

هەموو ئەو هێزەی بەعس کەلەژێر فەرمانی صدام ئەجوولایەوە وەکو بەفری بەهار توایەوە ئەم رووداوە جێی سەرسورمان بوو لەهەموو جیهان باس ئەکرا.

گەلی کورد بەتێکرایی بۆی ئاشکرا بوو بەیەکگرتن ئەتوانێت زاڵ بێت بەسەر دوژمنانی، وە کوردستان دەبێتە قەلایەك وە هێلانەیەك بۆ هەموو مرۆڤێکی نیشتمان پەروەری کوردو کەمایەتییەکان کەدەبێتە بنکەیەك بلێسەی ئازادی لێرەوە پەرە بسێنێت بۆ گەلانی دراوسێمان.

کورد هەمیشە گەلێکی ئازاو بەجەرگ بووە دوژمنان لەرێی هێزەوە نەیانتوانیوە لەناوی بەرن تەنها زیاتر رێگەی سیاسی و پیلان دارشتن لەرێگەی دەوڵەتانی ترەوە هێزی پێشمەرگەو جەماوەری کوردیان کپ کردۆتەوە.

- یەکەم راپەرین لەدەروازەی رانیەی خۆشەویست دەستی پێکرد وە سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە ١٩٩١/٣/٥ دوای تێپەربوونی نزیکەی مانگێك

بەسەر ڕاپەڕینەکەدا صدام بەهەموو توانایەکیەوە هێرشێکی دڕندانەی کردە سەر کوردستان لەهەموو لایەکەوە وە (مجاهدین خلقی ئێران) شان بەشانی سوپاکەی صدام (حرس الجمهوری) دەجەنگان دژی کورد، خەڵکێکی زۆری بێتاوانیان کوشت.

## • کۆڕەو:

گەورەترین ڕووداو بوو لەمێژووی کورد بەم شێوەیە لە سەرانسەری جیهان باس دەکرا، نزیکەی سێ ملیۆن و نیو کورد زیاتر سەروەت وسامان وماڵیان بەجێ هێشت ڕوویان کردە تورکیاو ئێران.

• حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بەیانێکی ئاراستەی گەلی کورد کرد لەکوردستانی ڕۆژهەڵات بەبۆنەی کۆڕەوی کوردستانی باشوورەوە تێی دا ڕایگەیاند هەریەکێك لەڕاست خۆیەوە بەهەموو توانایەوە دەستی یارمەتی یان بۆ درێژ بکەن، بەپیر براکانتان بچن و خزمەتیان بکەن بەماڵ و بەگیان، ئەوەبوو هەڵوێستیان ئەوەی پیشان دا کوردستان یەك پارچەی دابەش کراوە بەو چوار بەشە لەهەمان کات کوردستانی باکوور باوەشیان کردەوە جێی شانازییە هەموو کوردێکی باشوور کەگەڕاوەتەوە چ لەکوردستانی باکوور وە چ لەکوردستانی ڕۆژهەڵات ڕاستی ئەم بەپیرچوونەو ئەو خزمەت کردنە هەتاوەکو ئەم ساتەش باس دەکرێت کەبەپیرەوە چوونێکی وەها هاتن بەپیرمانەوە باوك پارووی دەمی منداڵەکەی دەردەهێناو دەرخواردی ئەو خێزانەی دەدا کەدەیبردەوە بۆ ماڵەوە.

## • ڕووداوەکانی کوردستانی باشوور:

لای هەموو دانیشتوانی کوردستانی باشوور ئاشکراو ڕوونە منیش لەکتێبەکەم ئەو خاڵانەی گرنگ و لەبەرچاوە بەکورتی باسی دەکەم:
بڕیاری ئەورووپای ڕۆژهەڵات (ئەمەریکا بەریتانیا فەرەنسا) کەپارێزگاری کوردستانی باشوور بکەن دانانی هێڵی (٣٦)، وەهەروەها بنکەی ئەدجەلیك بۆ

ئەم مەبەستە عێراق بۆی نییە بەفڕۆکەو هێزی پیادە هێرش بکاتە سەر هێڵی (٣٦).

- هەڵبژاردن (انتخابات) کرا لەئەنجامی ئەم ئەزموونە هەرێمی کوردستان دامەزرا لەگەڵ هەموو دەزگاکانی.
- دەوڵەتە ئیقلیمییەکان کەوتنە پیلان و دەسیسەی گڵاو بۆ تێکدانی ئەم ئەزموونە هەر سێمانگ جارێك ئێران و تورکیاو سوریا بەئاشکرا کۆدەبوونەوە بەنهێنی عێراق دەوری سەرەکی هەبوو.
- کاتێك شەڕ هەڵگیرسا لەنێوان پ.د.ك و ی.ن.ك ئەم سێ دەوڵەتە ئیقلیمییە وازیان لەکۆبوونەوەکانیان هێنا گەیشتنە ئەو باوەڕە بەپێی ئاگاداری خۆیان کەلەقوولایی دەستیان دەڕوات جارێکی کە مەحاڵە لەژێر یەك یاساو هەرێم کۆببنەوە و بەیەکەوە ئیش وکاری کوردستان بەڕێوەبەرن.
- گەلی کورد لەکوردستانی باشوور لەژێر ئیدارەی سێ حکومەت ڕۆژگار دەباتە سەر بەم شێوەیە:
  - ٢لەسەر ٥ی کوردستان لەژێر سێبەری صدام (خانەقین، کەرکوك، سنجار) دەژین.
  - بەشێکی کوردستانی باشوور بەناوی هەرێمی کوردستان پایتەختی هەولێرە ئیدارەو حوکمی لەژێر پارتی دیموکراتی کوردستان دایە بەسەرۆکایەتی بارزانی.
  - بەشێکی کوردستانی باشوور بەناوی هەرێمی کوردستان پایتەختی سلێمانییە ئیدارەو حوکمی لەژێر یەکێتی نیشتمانی کوردستان دایە، بەسەرۆکایەتی (مام جەلال).

## تێبینی:

لەنێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستان و جمهوری ئیسلامی ئەوپەڕی دۆستایەتی بەردەوامە بەناوی بەرژەوەندی گشتی تاکو ئەم مێژووە نزیکتر دەبنەوە لەیەکتر.

- لەنێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و تورکیا ئەوپەڕی دۆستایەتی بەردەوامە تاوەکو ئەم مێژووە وە ڕۆژانە نزیکتر دەبنەوە لەیەکتری بەناوی بەرژەوەندی گشتی.
- ڕێکەوتن نامەی واشنتۆن:

[illegible] دەڵێت:

.................... لەکاتێکدا ئەمە گەورەترین ڕووداو بوو لە مێژووی کوردستانی باشوور لەدوا شەڕی براکوژی کەهەردووك ڕابەر شان بەشانی وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا ڕاوەستان ڕێکەوتنەکەیان ئمیزا کرد.

- لەمانگی ئازاری ١٩٩٩ نوێنەری هەردوو حزبەکە چوونە ئەمەریکا کەگەڕانەوە بەزەقی بڵاویان کردەوە کەنوێنەری ڕوسیاو چین وفەرەنسا ئێمەی نەدی، بەڵام نوێنەری ئەمەریکاو بەریتانیا گفتوگۆیان لەگەڵ دا کردین پێیان ڕاگەیاندین بڕۆنەوە ڕێکەون ئەوکاتە ئێمە هەموو شتێکتان بۆ دەکەین (کیانی سیاسی) یش.

تەنها لەو ڕۆژەوە کەئیمزایان کرد لەواشەنتۆن شەڕ ڕووی نەداوەتەوە لەنێوانیان، ئێستاکە کەمن ئەو کتێبە بڵاو دەکەمەوە نوێنەری هەردوو حزبەکە بەرەو ئەمەریکا ڕۆیشتن.

ڕوون کردنەوەیەك دەربارەی هەرچوار دەوڵەتە ئیقلیمیەکان ئینجا داوا لەبرا ئازیزەکانم دەکەم لەڕۆشنبیر کوردی نیشتمان پەروەر و کەدەربارەی باکوورو کوردستانی ڕۆژهەلات و وە ڕۆژئاوا زۆر بەکورتی نووسیومە بەهۆی باروبۆخ وچەند هۆیەك.

## سووریا:

بەدرێژای سنووری تورکیاو سووریا کوردیان گواستەوە ئەمە هەنگاوی بەعس بوو بەناوی پشتێنی سەوز (حزام الاخضر)، دژی کورد جووڵانەوە کێشەی کورد بەهیچ جۆرێك باس ناکرێت کەناوی کوردستانی ڕۆژئاوا دێت سورییەکان وەڵامیان بۆئەوە دەست درێژ دەکەن کەگوایا کوردی ئێرە کۆچەرین (مهاجر) ین، لەتورکیاوە هاتوون.

## تورکیا:

سەرۆکی کۆماری تورکیا سلیمان دیمریل قسەکانی لەرۆژنامەو تەلەفزیۆن بڵاویان کردەوە (کوردو حکومەتی کوردییم نەبیستووە ) بەئاشکرا سیاسەتیان بڵاودەکەنەوە دەربارەی کوردستانی باشوور رازی نین بەهیچ جۆرێك هەردوو حزب رێك بکەوون وە کەبانگەشەی فیدراڵیەت بکەن تووشی لەرزو تا دێن.

## ئێران:

کەباسی کێشەی کورد دێت هەموو قادەکانی جمهوری ئیسلامی یەك وەلامیان هەیە، ئێمە کێشەی کوردمان نییە، چونکی (اسلام سنووری نییە)، بەشێك لەرۆشنبیرو کوردی نیشتمان پەروەر وا هەست دەکات سەرۆکی کۆماری تازە(خاتمی) دەربارەی بۆچوونی گۆڕانکارییەك ڕوویدات لەکێشەی کورد.

## صدام تکریتی و عێراق:

تیشك ئەخاتە سەر دووخاڵ لەسیاسەتی:

٣- بەپێی راپۆرتی رۆژنامەو مانگانە کەدێتە بەردەمی لەوەزارەتی دەرەوەو ناوەوە بەتایبەتی لەباڵوێزی عێراقی لەتاران و تورکیاو سوریا و نوێنەری عێراق لە هەیئەتی امم المتحدە و وە ئاسایشی گشتی و استخباراتی عەسکەری و مخابراتی عامە و وە رێکخراوی بەعس لەشمال.

٤- دووەم خاڵ تایبەتە بەشەخسی خۆی، دوا بریار و پەیوەندی بەخۆیەوەیەتی شتێکی نهێنییە لەگەڵ خۆی دەزێت کەس نازانێت ؟

لەسەر داواکردنی صدام تکریتی ئەنجوومەنی وەزیران کۆدەبێتەوە ئەو راپۆرتە درۆیانەی کەلەسەدا یەکی ڕاستە باقیەکەی هەمووی درۆیە کەتەواو بوو لەخوێندنەوەی صدام قسە دەکات.

جەلال ومسعود بەیارمەتی ئەمەریکاو ئینگلیز توانیویانە جێگەی خۆیان بکەنەوە لەشمال هەرکاتێك یارمەتی دەرەوەیان نەما بەچەند سەعاتێك شمال بەجێ دەهێڵن هەموو کورد داوامان لێدەکات کەبگەرێنەوە.

## بۆحاكمی بەغداد صدام تكریتی:

لەوڕۆژەی كەهاتوویتە سەر حوكم لە ۳۰ ی ئابی ۱۹٦۸ بەهیچ جۆرێك نەتویستووە كێشەی كورد بەئاشتی جێبەجێبكەیت، وە ۱۱ای ئازاری ۱۹۷۰ ش باروتۆخی ئەو ڕۆژە ئەوەی پێكردی ئەویش كاتی بوو.

هەتاكو تۆ لە ژیان دا مابیت باروتۆخی وولات بەم شێوەیە دەبێت، بەگشتی گەلی عێراق چاوەڕوانی گۆڕانە، ئەویش نەمانی تۆیە، ان شاو الله دوای بڕیارەكەی كۆنگرێسی ئەمەریكی دای بۆ لابردنی تۆ وە سەرۆكی كۆماری‌ئەمەریكا بیل كلنتۆن چەند جار ووتی پێش كۆتایی و فەرمان ڕەوایی من ئەبێت صدام تكریتی نەمێنێت.

بەگشتی گەلی عێراقی چاوەڕوانی ئەوەی دەكرد لەشەخسی تۆ (یان ڕا بكەیت یان استقالە بدەیت یان خۆت بكوژیت ) یان داوای غفران بكەیت لەگەل عێراقی بەتایبەتی كوردو شیعە، وەجمهوری اسلامی كەئەو شەڕەت بەزۆر بەسەردا چەسپاندن، وە دالگیركردنی كوێت، ئەبوو هەنگاوێك بنێیت بۆ مانەوەی خۆت بچیتە سەر تەلەفزیۆن بەیانێك بلاو بكەیتەوە كەبڕیارمان دا داوای لێبووردن بكەیت لەگەل كورد بەتایبەتی ڕوودلوی كیمیا بارانی هەڵەبجە وە ۱۸۲ هەزار زیندەبەچاڵ لەوانە كوشتنی ۸۲۰۰ بارزانی وە ۳٦ كەسیان لەبنەماڵەی شێخەكانی بارزانی بوون، دان بنێیت بەدیموكراتیەت هەڵبژاردنێكی ئازادانە فرە حزبی، كێشەی كوردو شیعەی باشوور وە كەمایەتی‌یەكانی تر جێبەجێ بكەیت، وە ئەوانەی تعریب كراوون بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان دان بەفیدراڵیەت بنێیت بۆ گەلی كورد، (كەركوك وخانەقین وسنجار) بچێتە سەر حوكمی فیدراڵیەت.

## صدام (مراهنە) گرەو لەسەر ئەم دووخاڵە دەكات:

(۱)ئەوە ڕاپۆرتێكی وەهمی‌یە هەمووی درۆو دەلەسەیە، هەرچەندە لەشوێنێكی تردا نووسیومە بەڵام لێرە بەدوورو درێژی باسی دەكەم:

لەدیوانی سەرۆكایەتی كۆماری عێراق بۆ صدام حسین، ئەم ڕاپۆرتەتان ئاراستە دەكەم كەلەڕێكخراوی بەعس و ئاسایشی گشتی وە استخباراتی

عەسکەری وە مخابراتی عامە بەکورتی دەیخەینە بەرچاوتان دەربارەی شمالی عێراقی حبیب، دوو حزب ئیدارەی دەکات، ناکۆکی لەنێوانیان بەردەوامە دوور نییە لەم نزیکانە شەڕ بێتەوە لەنێوانیان دا (گرانی، بێ‌ئیشی، دزی، پیاوکوشتن، سووتەمەنی گرانە، خەڵك بەتەواوەتی بێ‌تاقەتە لێیان، هەموو کورد داوامان لێدەکات کەبەزووترین کات سوپا خۆشەویستەکەمان بگەڕێتەوە خەڵکی شمال هیتر هیچی کە کۆمەکی ئەو حزبانە ناکات، ئێستاکە کەسیان لەگەڵ دا نەماوە، وە وەزارەتی دەرەوە هەڵوێستی تورکیاو سوریاو ئێرانی ڕوون کردەوە بەتایبەتی تورکیا ڕازی نییە بەفیدراڵیەت و یەك حکومەت دابمەزرێنن، وەئەمەش دیدارەکانیانە بەئاشکراو بەنهێنی، جۆری چەکیان، ژمارەیان، ئەو ڕێکخراوە بیانیانەی کەلەوێ کاردەکەن.

(٢)لەصدامەوە بۆ ڕێکخراوی بەعس و ئاسایشی گشتی و استخباراتی عەسکەری مخابراتی عامە، فەرمان دەردەکات هەوڵ بدەن دووبەرەکی زیاتر پەیدا بکەن، شەڕ دروست بکەنەوە، بەسەخاوەت پارە دابەش بکەن بۆ ئەو خەڵکانەی کەلەکۆنەوە لەدڵی ئێمەدان ناوە ناوە ڕێگەی سلێمانی و موصل وکەرکوك دابخەن، ئەزمەی نەوت و بەنزین وگاز دروست بکەن.

## تێبینی:

ئەمە لەهەندێ جێ دووبارەم کردۆتەوە لەبەر گرنگی بابەتەکە، چونکی دڵنیام لەسەر ئەمە دەژی و ڕۆژگار دەباتە سەر مراهەنەی لەسەر دەکات، وتم خاڵی یەکەم کەلەسەرەوە نووسیومانە، ئەو باوەڕی بەو درۆیانە هەیە، دووهەم، تایبەتییە بەشەخسی خۆی بەپێی ڕۆژانە یان مانگانە پیلان دادەنێت، ئەوانەی کەلەخوار خۆشیەوەن فەرمانی ئەو جێبەجێدەکەن، ڕەنگە دوو کوڕەکەی لە ٦٠٪ ی بزانن ئەوانی تر کە بۆ نموونە گارق عزیز لە ١٠٪ی دەزانن دوای نەمانی ڕەنگە ئەو نهێنییانە بلاوببێتەوە یان ڕەنگە زووتر کاتێ نەمانی حوکمی دێت ئەو نهێنییانە بەدەست گەلی عێراق بکەوێت ئەو کاتە باشتر لە صدام دەگەیت. لەچوارچێوەی حوکمی خۆی کەس بۆی نییە ڕاپۆرتێکی بۆ بنێرێت تێیدا بەدوورو درێژی پێ‌نیشان بدات ئەمە ڕەئی

منه بەم شێوەیە سیاسەتمان بەردەوام بێت ڕەنگە هەموو شتێك بگۆڕین، هەرچ کەسێك پێشنیازێکی پێتیشان بدات مانای نەمانێتی.

هەر سەرکەوتوو بن.

برای دڵسۆزو بچووکتان

ڕەفیق پشدەری